



# دەربارەی ئەقڵی مۆدێرن

وەرگێڕانی

ئازاد بەرزنجی ئاوات ئەحمەد

سلێمانی 2004





**زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**
**کتێبی سەردەم ژمارە** ( 253 )

**سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە**
**ئازاد بەرزنجی**

# دەربارەی ئەقڵی مۆدێرن

بابەت: گفتوگۆ
وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجیو ئاوات ئەحمەد
بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولڕەحمان
تیراژ: 800 دانە
ژمارەی سپاردن: 49 ی 2004





www.sardam.info

# پێشەکی

ئەو گفتوگۆیانەی لەم کتێبەدا ئەیانخوێنیتەوە لەگەڵ چەند بیرمەندو ئەدیبێکدا ئەنجامدراون کە ڕۆڵێکی کاریگەریان لەسەر بزاوتی ڕۆشنبیریی نویٛ هەبووە و هەیە . ئەم گفتوگۆیانە کە تاقە ڕەهەندێکیان نەگرتووە ، بەڵکو دابەش بوون بەسەر تەوەر و بابەتی جیاوازدا ،دەرکەوتە جیاجیاکانی مۆدێرنیتە پیشاندەدەن لە ژیاری نوێدا .کەواتە ئەتوانین بڵێین ئەگەر هێڵێك هەبێت ئەم گفتوگۆیانە پێکەوە کۆبکاتەوە ،ئەوا ئەو هێڵە پرسیارەکانن سەبارەت بە ئەقڵی مۆدێرن لە بوارە ڕۆشنبیری و کەلتوورییە هاوچەرخەکاندا.پاشان هەروەکو ئەقڵی مۆدێرنیش جەختی لەسەر کردۆتەوە “ حەقیقەت بە تەنها یەك دیوی نی‌یەو بریتی نی‌یە لە دەرەنجامی تاقە ئەزموونێك ، بۆیە خوێنەر لە ڕێی دیدگا جیاوازەکانی ئەم بیرمەندو نووسەرانەوە بە دیوە جۆراوجۆرەکانی حەقیقەت ئاشنا دەبێت. هەر لێرەوە ئەتوانین بڵێین کە گوتاری مۆدێرن گوتاری فرەچەشنی‌و فرە ڕەنگی‌یە،گوتارێکە بەتەنها لەسەر نەغمەیەك ئاواز ناژەنێت،گوتارێکە پشت بە ئەزموونە جۆراوجۆرەکان ئەبەستێت. هەربۆیە دەکریٛ بڵێین خوێنەر لەڕێی ئەم گفتوگۆیانەوە ڕووبەڕووی چەند ئەزموونێکی جیاواز ئەبێتەوە ،چەند ئەزموونێکی فیکری‌و ئەدەبیی جیاواز کە بەشێك لە سیمای هزرو ئەدەبی هاوچەرخمان پیٛ ئەناسێنن.ناسینی ئەزموونی مۆدێرنیش بە ڕەهەندە جیاوازەکانیەوە ،یەکێکە لە پێداویستی‌یە کەلتورییەکانی ئەم ڕۆژگارەی ڕۆشنبیران و کۆمەڵگا مرۆییەکان،بەتایبەتیش ڕۆشنبیری کوردو کۆمەڵگای کوردی.

ئەمێنێتەوە ئەوەی بڵێین کە "گفتوگۆ" شارستانیترین پەیوەندیی مرۆییە و زیندووترینیانە بۆ ناسینی یەکتر.گفتوگۆ واتە هەوڵدان بۆ لێکحاڵیبوون و ڕێزگرتن لە بیروڕاکانی یەکدی‌و لە نزیکەوە ئاشنابوون بە بەرامبەر.

لێرەوە ئێمەش وەرگێڕانی ئەم گفتوگۆیانەمان  بە پێویست زانی‌و ئومێدەوارین ئەم هەوڵە بچووکە بتوانیٛ سوودی خۆی بگەیەنێت.





***لە دیمانەیەکی تەلەفیزیۆنییەوە وەرگیراوە کە "تیری ووهن دامیش" بۆ بەرنامەی "زیك زاك" لەگەڵیدا سازی کردووە. ئەڵقەکە بە ناونیشانی "ئەم جەستەیەی تێیدا نیشتەجێین" دیف کۆڤاکس بۆ کەناڵی دووهەم دەری هێناوە, لە ئەیلولی ساڵی 1978 دا تۆمارکراو, لە 13 ی تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا پەخش کراوە.***

*** دەشێت چۆن دەربارەی جەستە قسە بکرێت؟ سەرەتا, ئایا پێویستە دەربارەی یەك جەستە بدوێین یان چەند جەستەیەك؟**

**رۆلان بارت:[1] پێموایە, پێویستە قسەکانمان بەوە دەستپێبکەین کە لە واقیعدا, چەندەها جەستەی زۆرو زەوەند هەن. جەستەی مرۆیی زۆر سادە, زۆر بابەتی, زۆر بەرهەست هەیە. خەڵك پێیان وایە دەتوانن لەم مەسەلەیەدا لێك تێبگەن. وەلێ, لە راستیدا, جۆرەها ئاراستەو زانستی تەواو جیاواز هەن, هەریەکەیان جەستەیەکی دیاریکراو هەڵدەگرنەوە, بە جۆرێکی وا, کە بە رای من, ئەگەر نکولی لەم هەموو جەستانە بکەن, ئیتر ناتوانن لە یەکتریی تێبگەن. ئیمرۆ جەستەی مرۆیی بووە بە بابەتێکی زانستی ئەوپەڕی ناچیزەو بەدەستەوە نەهاتوو, لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا زمان چۆن بوو, جەستەش ئێستا ئاوایە, ئەو کاتەی**

**[1] بارت, رۆلان (1915-1980) Barthes, Roland نوسەرو رەخنەگرێکی کۆمەڵایەتی فەرەنسییە, هەروەها تیوریستێکی ئەدەبیشە. لەگەڵ بونیادگەراکاندا هاوکاریی کردووە. ئەوان لێکۆڵینەوەیان دەکرد کە چۆن چۆنی کەلتور مانا دەبەخشێتە نوسراوەکانیان, یان ئامارژەیان لێوەردەگرێت, لە سیمۆلۆجیایان دەکۆڵییەوە, کە زانستی لێکۆڵینەوەی ئاماژەکانە, رابەرەکەی زمانەوانی سویسریی نێودار فەردیناند دی سۆسێر بوو. هەروەها بایەخیشی داوە بەرەخنەی نوێ, جوڵانەوەیەکی ئەدەبییە لە ئەوروپاو ئەمریکا, دوا بە دوای جەنگی جیهانیی دووەم سەری هەڵداوە, کە جەخت دەکات لەسەر راڤەکردنی تێکست لەخودی خۆی و گوێ نەدان هیچ تەرزە بایۆگرافییایەکی کەلتوریی یاخود سەرچاوەیەکی کۆمەڵایەتی.**





**زانایەکی زمانەوانی مەزن، دی سۆسێر[2] توانی هەموو خاڵەکانی هێرشکردن یەك بخات.**

**کەواتە چەند جەستەیەك هەیە، بۆ نمونە ئەو جەستەیەی فیسۆلۆجییەکان و زانایان بایەخی پێدەدەن. سەیریش نیە کە لێکۆڵینەوە زۆر تایبەتییەکانی بایۆلۆجیا، پێمان بڵێن جەستەی فیسیۆلۆجی جەستەیەکی نوێیە، لەوێدا جەستەی مرۆیی دیار نامێنێت، بگرە بەشێوەیەك لە شێوەکان لە هۆش خۆی دەچێت.**

**بەمجۆرە دەتوانم جەستەیەکی تویکارییانە جیابکەمەوە کە، بێگومان، پزیشکەکان بایەخی پێدەدەن و بە هەمان بڕیش زانایانی ئەتنۆلۆجیا بەلایانەوە گرنگە، ئەوانەی ڕەچەڵەکە مرۆییەکان پێك بەراورد دەکەن. ئێمە باش دەزانین کە لە تویی مێژوەوە جەستەی ئەنترۆپۆلۆجی گۆڕاوە: تەنانەت بە پێوانە لەگەڵ مێژووی فەرەنساشدا، لێکۆڵینەوە مێژووییە نوێیەکان، بۆ نمونە، ئەوانەی لۆری ـ**

---

[2] **سۆسێر، فەردیناند دی** Saussure, Ferdinand de (1857-1913) **زمانەوانێکی سویسرییە، ئایدیاکانی دەربارەی بونیادی زمان کاریگەرییان هەبووە لەسەر پەرەسەندنی ئەو تیورییە زمانەوانییەی بە ناوی بونیادگەرایییەوە ناسراوە. لە جەنەوا لە دایك بووە. سالێك لە کۆلێجی زانستەکانی زانکۆی جەنەواو دەوامی کردووەو پاشان لە ساڵی** 1876 **دا رای گۆڕی و دەستی کرد بە خوێندنی زمانەوانی لە زانکۆی لیپزیگ؟، لەکاتی قوتابێتیدا کتێبە تاقانەکەی چاپ کرد (راپۆرتێك دەربارەی سیستمی پیتی دەنگدار لە زمانە هیندۆ ئەوروپییەکاندا ـ** 1879**) کە کارێکی گرنگە دەربارەی سیستمی پیتی دەنگدار لە گروپی هیندۆ ئەوروپییدا، بایەخدەدات بەو زمانە ئەسڵییەی کە لێیەوە زمانە هیندۆ ئەوروپییەکان کەوتوونەتەوە. لەسەرەتای خوێندنی زمانەوانیدا بایەخی داوە بە فیلۆلۆجی، لێکۆڵینەوەی مێژووی زمان، بەڵام دواتر رووی کردۆتە لێکۆڵینەوەی زمانەوانیی گشتی. لە پەیمانگای دێس هاوتێس ئێتۆدێسی پاریس وانەی وتۆتەوە** 1881 – 1891**، پاشان بووە بە پرۆفیسۆری زمانی سانسکریتی و رێزمانی بەراوردکار لە زانکۆی جەنەوا. گەرچی سۆسێر هیچ کتێبێکی تری نەنوسیوە، بەڵام وانەکانی زۆر کاریگەر بوون. دوای مردنی، دوان لە قوتابییەکانی (وانەکانی کۆرسی زمانەوانی گشتی) ئەویان کۆکردۆتەوەو لە ساڵی** 1959 **دا چاپیان کردووە. ئەم کتێبە تێڕوانینە بونیادییەکانی ئەو لەمەڕ زمان روون دەکاتەوە، زنجیرەیەك جیاکاریی تیورییانە دەکات کە بوون بە بناغەی لێکۆڵینەوەی زمانەوانیی. کارەکەی سۆسێر لەپاڵ زمانەوانیشدا، کاریگەریی لەسەر دیسپلینەکانی ئەنترۆپۆلۆجی و مێژوو، هەروەها رەخنەی ئەدەبیش هەبووە.**





لادۆری ئەنجامیداون، کە لە پێش سەدو پەنجا ساڵەوە جەستە وەکو خۆی نەماوەتەوە، واتە سەردەمی ئیمپراتۆریی، ئەوکاتە جەستەکان بە شێوەیەکی گشتی بچووك بوون.

لە تویێ بەرگ و پۆشاکە سەربازییەکانی ناو مۆزەخانەکانەوە تێبینی ئەمە دەکەین. جەستەیەکیش هەیە کە دەتوانین پڕ بە مانای خۆی پێی بڵێین جەستەیەکی ئەتنۆلۆجی، چونکە زانستی ئەتنۆلۆجیا مانای کۆکردنەوەی ئاماژە ئاشناکانی کۆمەڵگا جیاجیاکان بە تایبەتی ئامازەکانی کارکردن، یان نانخواردن، یاخود منداڵبوون. لێرەشدا دیسان دەتوانین بە پێی کۆمەڵگاکان هەمەجۆرییەکی زۆر لە سروشتی جەستەدا بدۆزینەوە.

شتێکی تریش هەیە کە بایەخی بۆ ئێمە زیاترە، ئەو جەستەیەی ناوی دەنێم ئاینی، مەبەستم لێی ئەو جەستە مرۆییەیە کە پێوەستێك لەگەڵ پیرۆزدا دروست دەکات. ئەمەش بە باشی تێبینی دەکەین، نەك تەنها لە ئایینە کۆنە مەزنەکاندا، مەسیحییەت بۆ نمونە. لەوێدا هەست بە بوونی گرفتێکی ئاکارییانەو میتافیزییانەی جەستە دەکەین (کە بە شێوەیەکی قێزەوون سەیری دەکرێ و پێی دەوترێ لاشە) بەڵکو لە هەموو دیاردە پەراوێزییەکانی ئاینەکاندا، لە وێنە ناوەییەکان، بە تایبەتی خیمیا، کە هەردوکیان تێفکرینێکی قووڵ دەربارەی وێنابوونەکانی جەستەی مرۆیی دەگرنە خۆیان.

ئیمرۆ ئێمە جۆرێك لە ژیاندنەوەی مەسەلەی پیرۆز لە جەستەدا، لە تویێ سیما زۆر جیهانگیریەکانییەوە، دەبینین، کە هەر زۆر هاوچەرخی ژیانیشمانە: هەموو ئەو شتانەی رۆشنبیریی عەقڵانییانەی جەستە دەگرنەوە، وەکو بیرکاری و ئەزمونەکانی یۆگا یاخود پەروەردەکردنی جەستە لە ناوەوەو بە چەندان رێگا، هەموو ئەو شتانەی لە وەرزشی بەدەنیدا فێری دەبین وەك بڵێی بریتین لە بیرکردنەوەی قووڵمان لە جەستە، بێ مومارەسەی پەتی. لێرەدا وەرگێڕانێکی بەجیهانیکراوی بیرۆکەیەکی ئاینیی دەبینم، کە پێویستی بەوەیە جەستەی مرۆیی بخاتە ناو حاڵەتێکی هاوسەنگیی و سازانەوە، لە هەستیارییە ئۆرگانییەکەیدا (واتە سەرجەمی هەستە





ناوەکییەکان) کە لەگەڵ سروشتدا هاوکارن، ئیتر ئەو شێوازەی پێی دادەرێژین، هەرچییەك بێت.

پاشان جەستەی ئیستاتیکیش هەیە، ئەو جەستەیەی بووە بە بابەتی چەندان وێناکردنی هونەری. پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە ئەوەی پێی دەڵێین ئیستاتیکای جەستەی مرۆیی، بە دڵنیاییی لە سەرەتادا بۆ چەند مەبەستێکی ئاینی وێناکراوە، پاشان ئیستاتیکا بەجیهانیکراوە هەتا گەیشتینە ئەوەی دەتوانین ئەمڕۆ ناوی ئیرۆتیکای[3] جەستەی مرۆیی لێبنێین.

دەبینیت، ئەمانە بە شێوەیەکی فراوان بە جەستە دەکرێن، هەموو ئەمانە.

*** بەڵام بە تایبەتی، ئەوە جەستەی ناو کۆمەڵگای دێرینە، ڕەنگە جەستەی هاوچەرخ نەبێت؟**

ڕۆلان بارت: بەڵام بەهەرحاڵ، هەموو ئەوەی وتم، بۆیە ڕێگەم دا بە خۆم بیڵێم، چونکە فێرمان دەکات ئەسڵ و فەسڵی ئەو بیرۆکەیە دیاری بکەین کە دەربارەی جەستەی مرۆیی هەمانە. ئەو جەستەیە بابەتێکی ئەبەدی نیە، بە شێوەیەکی ئەبەدی لەناو سروشتدا کێشرابێت، ئەوە جەستەیەکە بەیدەستکراوە، مێژوو و کۆمەڵگاکان و سیستمەکان و ئایدیۆلۆجیاکان رایان هێناوە، بۆیە ئێمە لە بنەڕەتدا ئێمە بانگهێشتکراوین تا پرسیار بکەین جەستەی ئێمە چیە، ئێمەی خەڵکانی هاوچەرخ و خەڵکە کۆمەڵایەتییەکان و کۆمەڵگاییەکان بەشێوەیەکی تایبەتی.

*** ئایا جەستەی هاوچەرخ ، ئەویش پەیوەستە بە ئەویترەوە، بە کۆمەڵگاو ڕۆشنبیرییەوە؟**

_ ڕۆلان بارت: زەحمەتە ئەمە بڵێین. ئەوەی دەتوانین ئێستا بیکەین، بە هۆی نەبوونی زانستێکی تاقانەوە کە بەو شێوەیەی من دیاریم کرد لە جەستە نزیك ببێتەوە، بریتیە لە پشکنینی خاڵەکانی هێرشکردن یان خاڵەکانی شیکردنەوەی ئەم جەستە کۆمەڵگاییە هاوچەرخە. ڕەنگیشە ئەم زانستە مەیلێکی ئایندەیی هەبێت.

---

[3] ئیرۆتیکا erotica بریتیە لە هونەرێك یان ئەدەبێك هەوڵدەدات ئارەزووی سێکسیی بەرز بکاتەوەو بیوروژێنێت، بەوەی بە شێوازێکی رووهەڵماڵراوانەو بێپەردە گوزارشت لە سێکس بکات. ئەم وشەیە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم بە دواوە بەکارهاتووەو خۆی لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانیی دێرینە.

## پۆشاك...

لـە لای خۆمـەوە بـۆ پەلـەكردن لـەم تێـزەدا, لـە بـەردەمی سـێ ناونیشـانی ئاماژەكەردا خۆم دەبینم. سەرەتا پۆشاك هەیە, چونكە ناتوانین باسی جەستەی مرۆیـی بكـەین بـێ ئـەوەی مەسـەلەی پۆشاك بخەینـە روو, وەكـو هـێگڵ وتویـەتی, نازانم بە چ دەستەواژەیەك وای وتووە: پۆشاك بریتیە لەو ساتەی كە بەرهەست دەگۆڕێت بۆ ئاماژەكەر, كـە مانـای ئەوەیـە پۆشـاك ئەوەیـە كـە جەسـتەی مرۆیـی وەری دەگرێت بۆ ئـەوەی ببێت بـە ئاماژەكـەر و بەمـەش هـەڵگری ئاماژەكان, یان ئاماژە تایبەتییەكانی خۆی.

بەهەرحاڵ, پێویستە لێرەدا, ئیشارەت بە هەندێك لە هـزرە گەورەكان بدەین: كۆمەڵگا هاوچەرخەكان و ئەوانەش كە بە تایبەتی مەیلیان لە نەریتە, هەوڵ دەدەن لـە كۆمـەڵگا فۆلكلۆرییـە پەتییـەكان جیـا بـن, ئەمـەش لانیكـەم بەسـەر كۆمـەڵگا كۆنینەكاندا پیادە دەبێت, كـە لەوێدا, بۆ نمونـە, گرووپی فـەرمانڕەوا لـە فەرەنسا, هانای دەبردە بەر پۆشاك بۆ چەسپاندنی جیاوازی ئیمتیاز و پلەوپایەو پیشـەكان, هەروەها بۆ دیاریكردنی جیاوازیەكانی نێوان چینە كۆمەڵایەتییەكان, جەستەی مرۆیی هەرگیز بە رووت و قووتی نەدەبینرا. رووتـی هـەرگیز نەبووە, لانیكەم, لە هەندێك وێناندنە ئایینییەكاندا و بە ڕێگایەكی روو لە هەورازی رەها.

لـەم كۆمـەڵگا دێرینـە یـان سـوڵتانیەدا, بـە دڵنیـایی پیشـەكان, بـۆ نمونـە, لكێنرابوون بە پۆشاكەكانەوە: پۆشاكیش بە دەوری خۆی, ئەگەر قسەكەم راست بێـت, ئاوێتـەی جەسـتە بـوو, بـە تـەواوی گوزارشـتی لـەو دەكـرد, دووچـاری رووتبوونـەوە نـەدەبوو, بـەڵكو لـە هەرەمییـەتی گرووپدا هاوشوناسیی لەگـەڵ پلـەو پایەیەكدا دەكرد, بە جۆرێك بونیادی جیا بەڵام جێگیریشەوە.





**هەمووومان دەزانین دوای شۆڕشی فەرەنسی[4], لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم و هاتنی دیموکراسی, چی لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا روویدا: بەگشتیکردنێکی زۆری پۆشاک هەبوو, بە جۆرێك چینە باڵاکان پێویستییان بە زیادکردنی هەندێك وردەکاریی هەبوو لە پۆشاکیاندا, بۆ ئەوەی بە جیاوازی خۆی لەو چینانەی بە زەحمەتکێشان ناویان دەبرا, بحەوێتەوە. جیاوازیە پێویستەکە لە شێوەی گشتیدا نەبوو کە بۆ هەمووان یەك شت بوو ــ ئارایشتی پیاوانە لە هاوڕێیانی[5] ئینگلیزییەوە وەرگیرابوو ــ بەڵکو لەو وردەکارییە پێویستانەدا کە پێویست بوون**

---

[4] شۆڕشی فەرەنسی French Revolution بریتییە لە گەورەترین وەرچەرخانی سیاسیی و کۆمەڵایەتی لە فەرەنسادا, ماوەی نێوان ساڵانی 1789 ـ 1799ی خایاندووە. لە ماوەی شۆڕشەکەدا, فەرەنسا لە سیستمی شاهانەی رەهاوە, کە تێیدا پادشا خاوەنی هەموو شتێك بوو, گواستییەوە بۆ کۆماری تیوریی, کە تێیدا هاونیشتمانان ئازادو یەکسانن. کاریگەریی شۆڕشی فەرەنسە زۆر بەربڵاو بوو, لە دەریشەوەو لە ناویشەوە, ئەم شۆڕشە بە یەکێك لە رووداوە هەرە گرنگەکانی مێژووی ئەوروپا لە قەڵەم دەدرێت. لە ماوەی شۆڕشەکەدا سیستمی نوێ لە ناو چوو, چەندان حکومەتی تر جێگەیان گرتەوە, گەرچی هیچ یەکێك لەوانە نەیتوانی لە چوار ساڵ زیاتر دەوام بکات. دوای چەند دەستپێشخەرییەك سیستمێکی پەرلەمانی لە فەرەنسادا دامەزرا. ئەو دەسپێشخەرییانە بریتی بوون لە ئامادەکردنی رەشنوسی چەندان ماف و چەند دەستورێکیش. هەروەها دامەزراندنی یەکسانیی یاسایی هەموو هاونیشتمانییەکان, تاقیکردنەوەی ئەزمونی دیموکراسیی, بردنی کەنیسە بۆناو دەوڵەت, هەروەها بیناکردنەوەی ئیدارەی دەوڵەت و داڕشتنەوەی یاسا.

[5] هاوڕێیان , کۆمەڵە Friends, Society of ( کۆمەڵەیەکی بە تەواوی ئاینیی برادەرەکانە) کە شێوازێکی تایبەتی مەسیحییەتە لەناو خەڵکدا پێی وتراوە کواکەرەکان Quakers. باوەڕی بنەڕەتیی ئەمانە بریتیە لەوەی سروش ( وەحی) راستەوخۆو تاکییەو, هەموو کەسێك دەتوانێت لە رێی رۆحی خۆیەوە هەست بە وشەکانی یەزدان بکات, ئەم کۆمەڵەیەش پێکەوە هەوڵیان دەدا دەرك بەو سروشە بکەن. ئەم سروش یان وەحییەیان لە زاراوەی رۆشنایی ناوەوەی دەروون یان عەقڵ, یاخود مەسیح لەدەروندا, یاخود لە رێکەی رووناکیی ناوەوە پێدەگەیشت. ئەم گرووپە پیرۆزییە رەسمییەکانیان رەت کردەوە, بە بێدەنگیی پەرستشی خۆیان ئەنجام دەدا, هەروەها بۆ ئەوەی بناسرێنەوە بە شێوازێکی تایبەتی پۆشاکیان دەپۆشی.





بۆ بەخشینی ئەم بەها تایبەتییە بە کۆمەڵگای سەدەی نۆزدەیەم. کە ئەویش بریتیە لە جیاکاریی.

بێگومان لەوکاتەوە مۆدە سەری هەڵدا, یاخود دیاردەی مۆدە ئەو پانتاییەی داگیر کرد کە ئەمڕۆ دەیزانین.

ئەوەی ئەمڕۆ روودەدات, چیە؟ مەسەلەیەکە شیکردنەوەی گرانە, با بڵێین مەیلێکی بە کۆمەڵ هەیە بەرەو پۆشاک, ئەم مەیلە لە دابونەریتی کوێرەوە هاتووە کە وا لە خەڵکی دەکات چەشنێکی دیاریکراوی پۆشاک بپۆشن, واتە چەشنێك لە چەشنەکانی جەستە. لە لای لاوان, ئەمە بە باشی دەبینین, کە دەشێت هەندێك وێنە بە پێی شێوازی برینی قژی لاوان دیاری بکەین. کاتێك من لاو بووم, لە رۆژانی خەباتی رزگارییدا, شێوازێکی قژبڕین هەبوو کە کەسێك دایهێنابوو ناوی جیرار فیلیپ بوو. ملیۆنان و ملیۆنان جیرار فیلیپ لەسەر شەقامەکان هەبوون. ئێستا مۆدەی قژی درێژە کە لە ماوەیەکی درێژەوە باوی هاتووە. کەواتە ئەگەر بتەوێت, بەمۆدکردنێکی بەردەوام هەیە: چونکە جەستەی مرۆیی لە مۆدەیەکی گشتیدا قەتیس نابێت. ئەوەی بە توندی مۆرکی خۆی دەدات لە پۆشاکی ئێستا بریتیە لە پۆشاکی یەکخراو لە رووی سێکسییەوە, کاتێکیش لەسەر ئاستی پۆشاک جیاکاریی سێکسی ون دەبێت, ئەوا ناتوانین بە باشی هەموو ئاکامەکانی ئەم دیاردە نوێ و جەماوەرییە, بزانین.

*** ئایا لەبەر ئەوەیە کە پێوەستە بە جەستەوە؟**

رۆلان بارت: ئا! ئەگەر هەر پێویست بکات وەرچەرخاندنێك لە رەوتی جەستەدا هەبێت, ئەوا لە جیاکردنەوەی دوو رەگەزەکەدایە. دیاردەیەکی زەبەللاحە, جارێکی تریش زەبەللاحە, چونکە تا ئێستاش ئێمە نازانین بە باشی شیی بکەینەوە. هەرچۆنێك بێت, با لە لیستی نیشانە ئایندەییەکانی سەردەمەکەماندا تۆماری بکەین. دیاردەیەکی زۆر گرنگە: لە سەر ئاستی پۆشاک و جەستە, جیاکاریی سێکسیی ون ببێت و ببێتە هۆی پەرشبوونەوەی جیاکارییەکە. ئەگەر جەستە ـ پۆشاک رەفتاری ناجیاوازی بکات, ئەوا جەستە لە پۆشاک (بە گشتی)





ئازاد دەبێت، ئەگەر قسەکەمان دروست بێت. ئەوکاتەش رووتی دەگەڕێتەوەو سەرهەڵدەداتەوە، نەك لە نەرمیی و فشەڵیی پۆشاکدا بە تەنها، بەڵکو لە قابیلییەتیدا بۆ ئەوەی ئاسانتر فوو بدرێت، وەك ئەوەی لەسەر جەستە دانەخرێت. بەڵام ئێمە لە وردەکارییە وردو کارامەکاندا، لە رووتی ورد دەبینەوە. سەردەمێکی دوور لە ئێستا، پۆشاکی پیاوان و هەرزەکاران بە بۆینباخ بەسەر "ئەستۆ"دا دادەخرا، چونکە وەزیفەی بۆینباخ بەردەوام شاردنەوەی ئەستۆ بووە، وەلێ ئەمڕۆ ئەستۆ رزگاری بووەو ئێخەی کراسەکان زیاتر کراوەن. ساڵێك یان دوو ساڵ دەبێت لە لای لاوان لە ژێر ئێخەی کراسدا ملوانکە دەبینین، ئەم ملوانکەیە ئاماژەیەکی گرنگی هەیە، چونکە سەرنجمان بەرەو رووت و قووتی ئەستۆ رادەکێشێت. ئەوەی لێرەدا تێبینیمان کرد، جێگەی نمونە دەگرێتەوە لە سیستمێك لە (بەها ئیستاتیکییەکاندا) ئامانجی دیاریکردنی رووتی و ئاماژە کردنە بۆی. ئەمەش وامان لێدەکات وتەکەی هێگڵ لەم بارەیەوە وەربگرینەوە، کە تێیدا پۆشاك، یان تەنانەت لە هەندێك حاڵەتدا، بزریی چاودێریکراوی پۆشاك، وەزیفەیەکی هەیە بۆ ئاماژەکردن بۆ جەستەی نوێ، جەستەی هاوچەرخ.

## بووکی مێوینی وێناکراو

*** ئێستا ئەو شتە هەیە کە تۆ ناوی دەنێیت " مەسەلەی بووکی وێناکراو" مەبەستت لەم پێناسەیە چیە؟**

رۆلان بارت: من بە هەر شتێك پەیوەندیی هەبێت بە سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی جەستەوە وەکو وێنەیەك و هیچی تر، دەڵێم "بووکی وێناکردن". لێرەشدا دیسان ناتەباییەك لە نێوانی کۆمەڵگا تەقلیدییەکان یان کۆنینەکان و کۆمەڵگاو شارستانێتی ئێمەدا دەبینیت.

لە کۆمەڵگای دێرینىدا، مرۆ نەیدەتوانی جەستەی خۆی بەرهەم بهێنێتەوە، بۆ نمونە لە تویێی وێنەکێشانەوە، یان وێنەگرتنەوە، زۆر بە مەسرەف بووە، ئەوە دەستبلاوییەك بوو کە تەنها چینی باڵای خاوەن سامان دەرۆستی دەهات. لەوەی





**تێپەڕی, پێویستە بیر لەوە بکەینەوە کە مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژوویەکی درێژ, ملیارەها مرۆڤ ژیاون بێ ئەوەی جەستەی خۆیان ببینن (وێنەی کێشراوە...). ئێمڕۆ ئەم مەسەلەیە بەلای ئێمەوە قابیلی بڕواکردن نیە ــ بەڵام پێویستە ئەوەمان بێتەوە بیر کە ئاوێنەش خۆی لە خۆیدا کاڵایەکی زۆر گران, بگرە زۆر بەنرخ بوو. ئیمڕۆ بە هاتنی وێنەی فۆتۆگرافی, بەرهەمهێنانەوەی ناکۆتای بووکی وێناکردن, هەموو بۆچوونی کۆمەڵایەتی ئێمەی دەربارەی جەستەمان گۆڕیوە, بە شێوەیەکی تایبەتی نارسیسۆسیەتێک[6] و بەوەش ئیرۆسییەتێکی[7] هێناوەتە ناو پەیوەندیمان بە جەستەی خۆمان و جەستەی ئەویتریشەوە.**

---

[6] **نارسیسۆس** Narcissus لە میتۆلۆجیای یۆنانیدا, لاوێکی قۆزە, کوڕی خوداوەندی رووبار سێفیسۆسە. لەبەرئەوەی زۆر جوان بوو, گەلێك ئافرەت حەزیان لێکردبوو, بەڵام ئەو هەموویانی رەتکردەوە. یەکێك لەوانە حۆرییەك بوو ناوی ئیکۆ بوو. بەڵام هیرای خوداوەند لێی تووڕە دەبێت و وای لێدەکات نەتوانێت قسە بکات, بەڵکو بە تەنها ئەو قسەیە بڵێتەوە کە گوێی لێدەبێت. بەمەش ئیکۆ نەیدەتوانی خۆشەویستی خۆی بۆ نارسیسۆس دەربڕێت. رۆژێکیان نارسیسۆس لەناو دارستاندا پیاسەی دەکرد و لە هاوەڵەکانی دابڕا, بۆیە هاواری کرد لێرەیە؟ ئیکۆش وەڵامی دایەوە: لێرەیە.. لێرەیە. نارسیۆس چاوی لێی نەبوو, چونکە دارستانەکە زۆر چڕ بوو, هاواری کرد: وەرە, ئیکۆش وتی: وەرە.. وەرە. ئینجا بە ئامێزی کراوەوە لەناو درەختەکانەوە دەرکەوت, نارسیسۆس بەدفەڕانە خۆشەویستییەکەی ئیکۆی رەتکردەوە, ئەویش هەستی بە شەرمەزارییەکی زۆر کرد و خۆی لەناو ئەشکەوتێکدا شاردەوەو بزر بوو, تەنها سەداکەی لە دواوە جێما. نێمیسیسی خوداوەندی تۆڵە سەندنەوەی یۆنان, وای لە نارسیۆس کرد, وێنەی خۆی لەناو کانییەکدا ببینێت و ئالودەی ببێت. ئیتر نەیدەتوانی چاوی لەسەر وێنەکەی خۆی لاببات هەتا وردە وردە سیس بۆوەو لەناوچوو. لەجێگای کەوتنی لاشەکەی گوڵێکی جوان سەری هەڵدا و بۆ پاراستنی یادەوەریی نارسیسۆس گوڵەکە نانرا گوڵە نارسیسۆس (نێرگز).

[7] ئیرۆس Eros لە میتۆلۆجیای یۆنانییدا, خوداوەندی خۆشەویستییەو بەرامبەری کیوٌپیدی Cupid رۆمانەکان دەبێتەوە. پێشتر بە یەکێك لە هێزە سەرەتاییەکانی سروشت لە قەڵەم دەدرا, کوڕی پشێوییەو بەرجەستەکەری هارمۆنیی و هێزە خوڵقێنەرەکانی گەردوونە. هەرچۆنێك بێت, فرۆید لەتیوریی دووەمیدا دەربارەی غەریزەکاندا بەکاری دەهێنێت بۆ ئەوەی بیکات بەکانگای نەزوەکانی ژیان لەبەرامبەری غەریزەکانی مەرگدا.





ئێمـرۆ ئـەم دوانـە، نارسیسـۆس و ئـیرۆس، تایبـەتن بـە چەشـن، واتـە هـەموو چەشنی مرۆیی دەگرێتەوە، کە لـە تـوێی وێنـەی فۆتۆگرافییـەوە، یـاخود لـە تـوێی هەنـدێك تـەرزی فۆتۆگرافییـەوە، سـیماکانی خـۆی دەخاتـە روو، کـە لەوێـدا جەستەکان جوان دەردەکەون، سەروەری خۆیانن، بە شێوەیەك لـە شێوەکانیش سـەرمەدیین. ئـەو میدیایـەی بـە زۆری وێنـەی جەسـتە مرۆییـەکان بـەکاردەهێنێت، نێوەندێکی زۆر بە تین و توانایە، نێوەندێکە بە توندی پـەخش دەکرێ و بـەوەش بەشداری دەکات لە دامەزراندنی بۆچوونێکی نوێ دەربارەی جەستەیەکی مرۆیی نوێ، جەستەیەکی بە راستی شکۆدارکراو، جەستەیەکی هەمیشە لاو. لەوانەشـە ئـــەم جەســـتەیە، لەبـــەر چـــەند پێویســـتییەکی میـــدیایی، زۆر لاو بێـــت، وەلێ جەســـتەیەکی تەندروســـت و ســـاغە، جەســـتەیەکی ســـەرنجراکێش و لەمەشـــدا قـــەرزاربارى کەلوپـــەل و هـــاڕراوەو ئامادەکراوەکـــانی ئارایيشـــت و بەرهەمـــە خۆراکییـەکان و شـلەمەنییەکانی خاوێنکردنەوەیـە، کـە ئەمـەش وامـان لێـدەکات دەرەنجـامی ئـەوە بکـەین کـە ئیمـڕۆ جەسـتەی مرۆیـی دووچـاری چەشـنێك لـە سـەرفکردنی ئیرۆتییانـە بـووە ـ ئیرۆسییەکی راگەیەنـدراو، بـەلاًم بـێ ئاکـار نیـە، پێچـەوانەی یاسـا نیـە، بـەلاًم هەرچۆنێك بێـت ئیرۆسییانەیە ـ تـا دەگاتـە چەشـنە خەوبینینێك بە سەرمەدییەتەوە.

ئەو جەستەیەی لە میدیادا دەیبینین، هەرگیز لەوە ناچێت بەرەو مردن بڕوات، ئەوە جەستەیەکە کە دەتوانین پێی بڵێین شکۆدارکراو.

*** ئایا بە شێوەیەك لە شێوەکان، ناچارین ئەم جەستەیەمان خۆش بوێت؟**

رۆلان بارت: بەڵێ، ئەوە جەستەیەکە خۆی دەسـەپێنێت، لـە پەیوەنـدیی ئـارەزوودا بەســـەرماندا دەیســـەپێنن. بـە هـەرحاڵ، زۆرجـار خـەڵکی ئـارەزوو لـە ناخیانـدا دەبزوێت ـ بە مانـای ئـارەزووی حـەزلێکردن ـ چونکە ئەوان (لـە تـوێی میـدیاوە) بۆمان روون دەکەنەوە کە ئارەزوو شتێکی واجیبە. ئەمە یەکێکە لـە ئەنجامـەکانی رۆشـنبیریی جـەماوەریی. جووتبـوونی شارسـتانێتی وێنـە رێنماییمـان دەکـات بـۆ ئەو جەستەیەی کە پێویستە خۆشمان بوێت، ئەمەش کاتێك (شارستانێتی وێنـە)





لە تـوێی سـینەما یـان وێنـە فۆتۆگرافییـەکانی میـدیاوە, چـەند نمونەیـەکیمان بەسەردا دەسەپێنێت.

## دیمەن

**مەبەستت چیە کە ناوی "جەستە ـ دیمەن" دەهێنیت؟**

رۆلان بارت: دەتوانین ئەم پرسیارە بکەین, چونکە لە راستیدا لە واقیعدا جەستە, لـە بەرامبـەری ئـەویتردا, یـان لـە بەرامبـەری خۆیـدا, لـە حاڵـەتێکی دیمـەنیی بەردەوامدایـە. بـەڵام بـا بـۆ ئاسـانکردنەوە, بڵـێین لـە هـەموو کاتێکدا کۆمـەڵگاکان تێکۆشـاون بـۆ رێکخسـتنی چـەند بۆنەیـەك تێیانـدا لـە بـەردەمی جەماوەرێکدا, بـە راستی جەسـتە ببەخشرێت, لە سـەردەمە زۆر کۆنەکانیشـەوە, ئـەم دابەشـکردنەی نێـوانی ژیـانی گشـتی و حاڵەتـە دیمەنییەکانـدا دەبینینـەوە: لـە کۆمـەڵگا دێرینەکاندا, ئەو کاتانەی کە تێیاندا جەستە خۆی دەبەخشی زۆر سنوردار بوون و بە وردییش دیاری کرابوون و لە باقی کاتەکانی ژیان جویێ کرابوونـەوە: ماوەی ئاهەنگەکان, رێگەیان دەدا مرۆڤ بەشێوەیەکی جیاواز پۆشاك بپۆشێت, وەك کاتی جەژنەکان و سەما سروتییەکان[8]. ژیـان دابەشـکرابوو بۆ دوو بـەش: ئـەو سـاتانەی جەستە لە توێی ئاهەنگێکـەوە دەبەخشـرا, ئەمـەش زۆ دەگمەنـە, بەشـەکەی تر کـە گـەورەترین بەشـی ژیانـە, بـۆ تـەرزە ئاشـناکە بـوو, کـە تێیـدا جەسـتە تـەنها لـە چوارچێوەی کارکردندا هەبوو.

*** ناتەبایيەك هەيە لـە نێـوانی ئـەو جەسـتەیەی کاردەکـات و ئـەو جەسـتەیەش لـە دیمەنـە ئاهەنگییەکەدا دەبەخشرا ؟**

رۆلان بـارت: ئـەو جەسـتەیەی کاردەکـات, نـاوی دەنـێم جەسـتەی بکـەر, جەسـتەی وەرچەرخێنەر: چونکە هەمیشە و لە کۆتاییدا کار, سروشت وەردەچەرخێنێت.

---

[8] سـروت Ritual بریتیـە لـە رەفتـارێکی ئاهەنگییانـە یـان رەمزییانـە کـە بەهاکـەی لـە دووبارەکردنەوەیدایە, سروتەکان بە زۆریی پەیوەندییان بە بۆنەو کردەوەی ئاینییەوە هەیە.





لەم کۆمەڵگایەی ئێستادا (هاوچەرخ) جۆرێك ناکۆکی هەیە: جەستە ــ دیمەن, لە یەك کاتدا, لە حاڵەتی دوورەپەرێزیی و لۆکاڵێتیدایە. ئێستا راڤەی ئەوە دەکەم کە هێنامەوە, با بەشێوەیەکی گشتی بڵێین, پشکی ئاهەنگێتی, بە مانای راستەقینەی وشەکە, لە ژیانی کۆمەڵایەتییدا زۆر داویەتە کزی ــ هەموو خەڵکی دەتوانن تێبینی ئەم دیاردەیە بکەن لە ژیانی ئێستادا ــ جگە لەچەند ئاوارتەیەك, ئیمرۆ خەڵکی لە پۆشاکدا هونەرکاری ناکەن و پۆشاکی تایبەتی بە جەژنەکان ناپۆشن. وتیشم لۆکاڵە, بە مانای سات یان گۆشەی وا لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەیە, کە جەستە لە دیمەنێکدا خۆی دەبەخشێت, بە تایبەتی لە سینەماو شانۆدا. وەلێ ئەوەی دەخرێتە جێگای نمایشکردنەوە, بریتییە لە بەشە ئیرۆتییەکەی جەستە, کە ئەمەش چەشنێك لە خۆراکی ئیرۆتیکییانە دەدات بە نماییشەکە. بە شێوەیەکی گشتی, بینەر زیاتر و زیاتر روو دەکاتە گشتاندنی جەستەی رووت, ئێستا چەندان دیمەنی جەستەی رووت لە ئارادان. ئەوانە بە تەواوی دیمەنی ئیرۆتیکییانەن, پۆرنۆگرافیان[9], رووتبوونەوەن, هتد..

بەڵام سەرباری ئەوەش دوورەپەرێزیی دەگاتە ئاستێکی دوورتر, بۆ نمونە لە سەمای ئێستادا, دەشێت بڵێین چیتر جەستە بۆ زاخاودانی چاو پێشکەش ناکرێ: لە شوێنێکی گشتیی فراواندا کە جێگەی سەدان کەس دەبێتەوە, کوڕان و کچان, سەما دەکەن: هەر یەکێك لە قووڵایی خۆیدا بۆ خودی خۆی سەما دەکات. چیتر سەماکان لە نێوانی هاوسەرەکاندا روونادەن, وا دایارە جەستە لە ناوەوە دەژی, نەك بۆ دروستکردنی کاریگەرییەکی دەرەکی. ئەمەش لەگەڵ ئەوەدا دەسازێت کە دەشێت ناوی بنێین تاقیکردنەوەیەکی نەشئەییانە, بە واتای کاتێك تاك سروتگەلێکی یەکجار دێرینی کۆمەڵگا دێرینەکان وەردەگرێتەوە, ئەوا هەوڵ

---

[9] پۆرنۆگرافی pornography 1. بریتییە لە وێنە, نوسین, یان هەر مادەیەکی تر کە مەسەلە سێکسییەکان بخاتە روو, هەندێجاریش لەگەڵ هێز و توندوتیژییدا سێکس نمایش بکات. 2. نمایشکردنی بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە مادەیە. وشەکە لە وشەی پۆرنۆگرافۆسی یۆنانییەوە سەرچاوەی گرتووە, کە مانای نوسین دەربارەی کاری سۆزانیش دەگەیەنێت.

دەدات لە کەسێتییەکەی خۆی رزگاری ببێت, ناخی خۆی دەهەژێنێت بێ ئەوەی گوێ بداتە ئەو جەستانەی دەوریان گرتووە, هەتا وای لێهات لەم ساتەدا جەستە قوربانی دروسانێکی ئەفسونییانەی نەشئەیە, نەك خۆپیشاندانێکی خۆڕایی.

ناکۆکییەکەش لێرەدایە ـ چونکە لە یەك کاتدا, کاتێك ئەم سەمایەی ئێستا بە کۆمەڵ دەکرێ, رێچکەیەکی گروپی دەگرێتە بەر, بەجۆرێك سەماکە دەبێت بە جەماوەری خۆی: جەماوەرەکە ئەوەیە کە سەما دەکات. لەم سەما ـ جەماوەرەدا, تاك بە تەواوی گۆشەگیر دەکرێت, چونکە تاکێکی بێ هاوبەشە. لەناو چەشنێك لە "ئێمە" ی گروپیدا ون نە, بگرە تواوەتەوە, لە سەما ـ ئێمەدا, کە لەوێدا ئێمە سەما دەکات و هەموو پێوەستییەك بە "ئێمە ـ هەردوکمان" ەوە دەپسێنێت کە زۆر کۆن نیە. ئەوەی لێرەدا دەمەتەقێی لەسەر دەکەین, بابەتێکی نوێیە. چونکە دەتوانین لە توێی ئەم سروتانەوە, کە بە شێوەیەکی تایبەتی لاوەکان خەریکیان هەن, پەی ببەین بە وەرچەرخانێك لە دیدی خودیانەی مرۆڤدا. ئەم گۆشەنیگایە, لەم ئێستاییەیدا, لە توێی وەرچەرخانە لێکدراوەکەیدا (زمانەوانیی و هی تریش), یاخود لە توێی بازاڕگەرمیی مۆزیکی پۆپەوە, وردە وردە تاك لە تاکایەتی خۆی دادەماڵرێت, بەمەش تەنهاییەکەی دووهێندە دەبێتەوە. ناکۆکییەکە لێرەدایە: لە لایەکەوە تەنهاییەکەی دووهێندە دەبێتەوە, کەچی خودیشی لەناو چەشنێك لە ئێمەی گروپییدا ون دەبێت.

**کەواتە پێت وانیە سامای جەماوەر سەمای بەبادانی چەپاندن بێت؟**

رۆلان بارت: دەتوانین گەمە بەم وشەیە بکەین: بەڵێ سەمای بە بادان, بەڵام من لەو باوەڕەدام زۆر لەمە دوورتر دەڕوات, بە بادان چەمکێکی مرۆییە, لە کاتێکدا دیاردەی مەبەست دەرخستنێکی توندوتیژانەی جەستەیە, لە ناوەوەی جەستەوە, چونکە لە توێی خودێتییەوە, لە هەمان تەرزی کلاسیکییەوە بە ئەنجام دەگەیەنرێت.





پێموایە مرۆڤ دەتوانێت بە باشترین ڕێگا ئەو خاڵی وەرچەرخانە بدۆزێتەوە کە تووشی جەستەی هاوچەرخ بووە، کە گەیاندوویەتیە چەشنێك لە تایبەتمەندێتیی هاوچەرخانە.

## ڕەگەزپەرستیی شۆخ:

*** خەڵکی زۆر باسی جەستە دەکەن، بەڵام بە تایبەتی جەستەی لاو ، جۆرە مەیلێك لە ئارادا بووە بۆ لەبیرکردنی جەستەکانی تر: ئەو جەستە لاوەی کە پیر دەبێت.**

ڕۆلان بارت: زەحمەتە مرۆڤ شارەزای خەسڵەتە نمونەییەکانی جەستەی هاوچەرخ ببێت، بەڵام پێموایە، خاسییەتێکی جێگیر هەیە، لەناو ناتەباییەکدا جێگیر دەکرێت، ئەویش خۆی ئەفسانەیەکی پوختی هاوچەرخە، ناتەبایی نێوانی جەستەی لاو و جەستەی پیر. وادیارە کۆمەڵگاکەمان بەرامبەر جەستە لاوەکان لێبوردە نیە. هەر جارێك تەکنەلۆجیای کەلتوری زەفەر بە جەستە ببات، چ بە راگەیاندن بێت، یان سینەما، یاخود بە وێنەی فۆتۆگرافی، ئەوا ئەو (واتە ئەو تەکنەلۆجیایە) لەسەر شانۆکەی دەردەکەوێت، ئەوەی بازاڕگەرمییەکی زۆری بۆ کراوە، جەستەی لاوە. وەك ئەوەی کۆمەڵگا هیواخوازبێت کە جەستە تەنها لەو چەشنانەیدا ببینێت کە سەرمەدییەتی دەدەنێ، کە نامرێت.

ڕەنگە ئاماژەکان زۆر بن و نەتوانین لێیان تێبپەڕین: ڕەواجی بێهاوتای بازرگانێتی پۆشاکی لاوان، پاشەکشەی پۆشاکی پیران. هەموو ئەمە نیشانەی سڕینەوەی دەمامککراوی مەرگە، بە شێوەیەکی یەکجار کارەساتاویی، هێشتا زانایانی سۆسیۆلۆجیا خەریکی چارەسەرکردنین. ئێمە مەرگ ڕەش دەکەینەوە، سانسۆرێکی سەخت دەخەینە سەری، دەیچەپێنین، بە تەواوی لە ڕەمزییەتەکەی هەڵی دەکەنین، بەجۆرێکی وا، کە وردە وردە، گران دەبێت لە ناو پەیوەندییەکی دیالەکتیکیدا (ماقووڵ) لەگەڵ خۆماندا بیهێڵینەوە. لە ئەنجامی ئەمەشدا، شتێك لە کۆمەڵگاکەماندا روویدا، کە دەتوانم بە بێ دوو دڵی ناوی بنێم ڕەگەزپەرستیی لاو، بە واتای لاوان و لاوەکان هەموویان لە لایەنی کۆمەڵگاوە وەکو ڕەچەڵەك جیاکراونەتەوە، هەرئەوەندەی لاویمان نەما ، ئیتر لێی دەردەکرێین.

دەتوانیت بە باشی ئەمە لە ئەفسانەیەکدا بخوێنیتەوە, کە حاڵی حازر جێگەیەکی بازرگانییانەی گرنگی هەیە: ئەفسانەی جەستەی باریک و شوشەیی, جەستەی باریک نزیکترین نمونەیە لە جەستەی لاو. باریکی نیشانەیەکی زامنکراوی لاوییە, لێرەوەیە فراوانبوونەوەی زۆری تەکنیکەکانی باریک کردنەوە, بایەخدانی روو لە زیادیی, بگرە ئەو ئالودەییەی جیهانی ئێستای داگرتۆتەوە لە ئارەزووی باریکبونەوەدا, واتە هێشتنەوەی جەستە لە حاڵەتە ئەفسانەییەکەی لاوییدا: ئەمە لە راستیدا بریتیە لە ئارەزووی سەرمەدییەت. ئەفسانەیەکی باو هەیە دەربارەی چارەسەری باریکیی, کە ئیمڕۆ دڵ و دەرونی جیهانی داگرتووە, بە ژن و پیاوەوە, لە کاتێکی زووشەوە دەستپێدەکات, پێش قۆناغی پیری. ئەم ئەفسانە قەشەنگە دەیسەلمێنێت کە جەستەی هاوچەرخ دەیەوێت خودی خۆی لە گۆشەنیگای جەماوەریی و ئەفسانەییەوە, جەستەیەکی باریک و جەستەیەکی لاو بێت.

ئەگەر خۆزگەیەکم هەبێت, خۆزگەیەکی تاکانە کە ئارەزووی ناردنی بکەم, ئەوەیە گشتە کۆمەڵایەتییەکەی جەستەی هاوچەرخ, هەمووی ئاوەڵا نەکرێت, دەشێت ئەمە ناو بنێین واقیعی بەناویەکداچوو ـ خودێتی جەستەکان, چونکە بەناویەکداچوو ـ خودێتیی رەهەندێکی ناسکترو سەرانسەرییتری پەیوەندیی کۆمەڵایەتییە. منی بەناویەکداچوو ـ خودێتی بە واقیعی ئەوە ناودەبەم کە جەستەی ئەویتر هەمیشە وێنەیەکە بۆ من, جەستەشم هەمیشە وێنەیەکە بۆ ئەویتر, بەڵام ئەوەی بایەخدارترو وردترە, ئەوەیە جەستەی من بۆ خودی خۆمە, ئەو وێنەیەی پێموایە ئەویتر دەربارەی ئەم جەستەیەی من دروستی کردووە. بەم رێگایە نێوانی مرۆڤەکاندا و لە تویێی جەستەکانیانەوە گەمەیەك یان تاکتیکێك دادەمەزرێت, بێ ئەوەی وریای چەشنی ئەو تاکتیکە بن, کە بە زۆری دوو جەمسەری هەیە: جەمسەری ئیغراکردن و دەرکردن, هەردوکیشیان لە یەك کاتدا. پێویستە هەرگیز بیرمان نەچێت: ئێمە لە کۆمەڵگای هاوچەرخماندا بەشێوەیەکی گشتی لە تویێی سینەما, سەما, یاخود لە تویێی پڕوپاگەندەوە, چەندان وێنەی زۆر





قۆشمەمان دەربارەی جەستەی مرۆیی هەیە, بەڵام لەسەر ئاستی خودی زۆربەی بوونەوەرە مرۆییەکان بەدەستی چەشنە تەنگییەکی جەستەیانەوە دەناڵێنن. ئەم جۆرە بێزاربوونەی ناوەوەی جەستە, ئەم هەستکردنە بەو وێنە خراپەی دەشیا دەربارەی جەستەی تایبەتی خۆمان دروستی بکەین, بریتیە لە ئەسڵی زۆربەی نیرۆسەکان. ژمارەیەکی زۆر لە شەیتانەکان لە دەوری جەستە دەسوڕێنەوە: ترسان لەوەی بە سیمایەکی پێکەنینهێنەرەوە دەربکەوین, ئەو وێنە خەندەئاوەرەی لکاوە بە جەستەوە, خۆی هەمان شێمانەی مومارەسەکردنی چەشنە خراپەیەکە لەسەر جەستەی ئەویتر.

پێویستە هەموو ئەم مۆرکە شەیتانییەی پەیوەندیی مرۆییمان لە تویێی جەستەکانەوە بیر نەچێت, ئەمەش لە مانای خودێتی ــ بەناویەکداچووی جەستەکان نزیک دەبێتەوە, کە پێویستە هەرکاتێك بیرمان لە جەستەی مرۆیی, جەستەی ئەویتر, جەستەی ئەوانیتر و جەستەی تایبەتی خۆمان کردەوە, رەچاوی ئەوە بکەین کە زۆر کەم ناسك بین, زۆرکەم داهێنەربین, چونکە ئێمە هەست بەوە دەکەین کە لە تویێی وێنەی جەستەوە چەند فشەڵین و قابیلی خراپ بوونین.

بەڵام زانست هەر ئەوەندەی لە دەست دێت بەم تەرزە ناسکییە, هەموو ئەم بوارە زۆرەی فراوانبوونەوەی خودێتی ــ بەناویەکداچووی جەستە, رابگات و دایان بگرێتەوە, بێشك بەشێك لە دەرونشیکاری دەتوانێت سەرەڕۆییەکە بکات, چونکە تاکە زانستە کە حاڵی حازر بایەخ بە جەستە بدات, بەڵام هیچ شتێك جگە لە ئەدەب ناتوانێت جیهانە هەتا بڵێی پڕ لە ناسکی و فشەڵییەکەی جەستەی مرۆیی بخاتە روو.

**وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: د. ئەنتوان ئەبو زەید**

**سەرچاوە:**

**مجله العرب و الفكر العالمی , العدد السابع, صیف** 1989. **ص:** 143 – 149.





## ڕۆلان بارت:
## مانای ئەوەی ڕۆشنبیر بیت

*** تۆ پیاوێکیت حەزت لە گۆشەگیرییە, پێت خۆش نیە لە دەرەوەی کتێبەکانت زۆر قسە بکەیت... ئێمە خەریکە هیچ دەربارەت نازانین..**

ڕۆلان بارت: ئەگەر ئەمە بە ڕاستی وابێت, ئەوا دەڵێم من رقم لە دیمانەیە, چونکە من لە بەرامبەریدا خۆم دەبینمەوە ترنجاومەتە نێوانی دوو مەترسییەوە: مەترسی یەکەم لەوەدا وێنا دەبێت کە ڕەنگە هەندێك شتی ئاشنا و ئاسایی بڵێم و وا لە خەڵك بکەم وا بزانن من "بیریار" م, یاخود هەردەم بڵێم "من" و بەوەش ڕێگە بە خەڵك بدەم تاوانبارم بکەن بە خۆپەرستی...

*** لەگەڵ ئەوەشدا لە کتێبی "بارت دژی خۆی" دا باسی خۆت دەکەیت. گەرچی بە درێژی باسی منداڵی و ساڵانی هەرزەکاریی خۆتت کردووە, بەلام بە شێوەیەکی سەیر دەربارەی ساڵانی نەرزەیی و پێگەیشتنت بێدەنگ بوویت..**

ڕۆلان بارت: چونکە منیش وەکو زۆربەی خەڵك, پێموایە بە باشی ساڵانی منداڵیی و لاویم دێتەوە بیر. دەزانم چۆن مێژوویان بنوسمەوە, هەروەها خەسڵەت و سیماکانی دەناسمەوە, پاشان ئەم شتە نامۆیە ڕوودەدات: هیچم بیر نایەت, ناتوانم مێژووی ژیانم بنوسم, یاخود بە شێوەیەك مێژووەکەی بنوسمەوە, وەك بڵێی یادەوەریم تەنها پەیوەندیی بە چاوگەکەو ئەسڵەکەوە هەیەو هیچی تر, وەك ئەوەی هەرزەکاری قۆناغی نمونەیی و ناوازەی





یــادەوەریی بێــت. بــەڵێ ئەمەیــە کــە روودەدات: دوای تێپــەڕینی قۆنــاغی هەرزەکاریی, ژیانی خۆم وەکو ئێستایەکی بەرین دەبینم کە بەشبەشکردنی سەختەو, زەحمەتە لەناو دیمەنێکی دیاریکراودا دابنرێت.

* واتە "بەسەرهات" وێڵت ناکات.

رۆلان بارت: بەسەرهاتم نیە. رێك لە یەکەمین دێرەوە کە نوسیومە, چیتر خۆمم نەبینیوە, چیتر بە نیسبەتی ئەوەوە من وێنەیەك نەبووم. چیتر نەمتوانیوە ئەندێشەی خۆم بکەم, یان بیخەمە ناو وێنەوە..

* ئەمەیە هۆی نەبوونی وێنەی پیرییت لە کتێبی "بارت خۆی" دا؟

رۆلان بارت: وێنەم هەیە, بەڵام ئێستا هیچی وام لا نەماوە. ئەو کتێبەش کە تۆ باسی دەکەیت, بە هێڵێکی تۆکمە دابەشکراوە.. باسی لاویم ناکەم. چونکە لاویم خستۆتە ناو وێنەکانەوە, چونکە یادەوەری و وێنە بەرجەستەی تەمەن و کات دەکەن. پاشان من لە توێی وێنەوە هیچ ناڵێم. چونکە هیچ وێنەیەکم نەماوە. هەموو شتێك وای لێهاتووە لە توێی نوسینەوە تەواو دەکرێت.

* ئەم دابڕانەش, دابڕانی نەخۆشییە..

رۆلان بارت: ئەوەی تایبەت بێت بە من, نابێت بڵێین "نەخۆشی". پێویستە بڵـێین "سـیل", چـونکە لــەو قۆناغــەدا, قۆنــاغی پــێش چارەســەرکردنی کیمیاوییانـە, سـیل شـێوازێك بـوو لـە شـێوازەکانی ژیـان, رێگایـەکی بـوون. دەشـێت بڵـێم ئـەوە هەڵبـژاردن بـوو. دەتـوانین لـە تـوێی سـنورە دوورەکانـەوە ئەندێشــەی پاشەکشــەیەك بکــەین بــۆ ئــەو ژیانــە, رێــك وەك ئــەوەی هــانس کاسترۆپ لە "چیای ئەفسوناوی" تۆماس ماندا[10] دەیکات. مرۆڤی سیلاویی

---

[10] تۆماس مان, Thomas Mann (1875-1955) رۆماننوس و وتارنوسێکی ئەڵمانییە, هەروەها کورتە چیرۆکیشی نوسیوە. لە ساڵی 1929 دا خەڵاتی نۆبڵی لە ئەدەبدا وەرگرتووە. یەکێکە لەو نوسەرانەی کە کاریگەرییەکی زۆریان هەبووە لەسەر ئەدەبی سەدەی بیستەم. پیاوێکی جوامێر بووەو لە سەردەمی نازییەکانیشدا رەخنەی راشکاوانەی لە نازییەکان و سیستمەکەیان گرتووە, سەرەنجام بە ناچاریی ئەڵمانیای جێهێشتووەو, رەگەزنامەی ئەمریکایی وەرگرتووە . دیارترین





دەتوانێت بە شێوەیەکی جیدیی، لە نەخۆشخانەیەکدا رووبەڕووی بیرۆکەی ژیان ببێتەوە، منیش خۆم وام کرد.

*** لە دەرەوەی کات؟ بە خۆدزینەوە لە رێکەوتەکانی زەمانە؟**

رۆلان بارت: لانیکەم با بڵێین شێوەیەکی ژیان پەیوەندیی بە بیرۆکەی بە راهیب بوونەوە نیە. تامی ژیانێکی رێکخراو، کاتی بە وردی دیاریکراو وەك ئەوەی لە دێرێکدا روو دەدات. تا ئەم ساتەش دیاردەی سەربازگەی نەخۆشیی راوم دەنێت و دەمەوێت لەو وانانەدا کە لە کۆلیج دوفرانس دەیانڵێمەوە، بێمەوە سەری.

*** ئێمە هەمیشە باسی نەخۆشی دەکەین وەك ئەوەی شتێك بێت پەك بخات و ببڕێتەوە و بشێوێنێت. زۆر بەکەمی باسی ئەوە دەکەین کە دەشێت وەك شتێکی ئەرێ وابێت بە نیسبەتی کردەوەی نوسین .. یان غەیری نوسینەوە..**

رۆلان بارت: ئەمە راستە. ئەوەی تایبەتە بە من، لە ماوەی ئەو پێنج یان شەش ساڵەی لە دەرەوەی جیهان بەسەرم برد، ئازارێکی زۆرم نەچەشت: بە راستی میزاجێکم هەبوو روو لە گۆشەگیری بوو، بەرەو مومارەسەی تەنهایانەی نوسین. ئەم میزاجە چی بۆ هێنام؟ بە دڵنیایی شێوەیەك لە شێوەکانی نوسین: ئەزمونی"ژیان لەگەڵ ئەوانیتردا" کە هەژانێکی زۆری بەرەو هاوڕێیەتی تێدایە، لەگەڵ هەستکردن بەو ئاساییشەدا کە مرۆڤ دادەگرێت کاتێك بە درێژایی کات دەوری بە هاوڕێ گیراوە، بێ ئەوەی لێیان جیاببێتەوە، پاشان دواتر ئەو هەستە نامۆیەی هەردەم وا هەست بکەم من پێنج یان شەش ساڵ لە تەمەنی راستەقینەی خۆم بچوکترم.

*** دەتنوسی؟**

---

رۆمانەکانی بریتین لە (مەرگ لە ڤینیسیا 1912، چیای ئەفسوناوی 1924، دکتۆر فاوست 1947). رۆمان و نوسینەکانی مان بۆ زۆرینەی زمانەکانی جیهان وەرگێڕدراون .





**رۆلان بارت: زۆرم دەخوێندەوە. بۆ نمونە لە ماوەی دووەمی نەخۆشخانەمدا هەموو میشیلێم[11] خوێندەوە. بەڵام زۆرم نەنوسی. تەنها دوو وتارم نوسی: یەکێکیان دەربارەی جید[12] و یەکێکی تریش دەربارەی نامۆکەی کامۆ[13], کە وەکو پاڵنەری یەکەمی نوسینی "پلەی سفری نوسین" وابوو.**

---

[11] میشیلێ, جولیێس Michelet, Jules (1798-1874) مێژوونوس و رۆماننوسێکی فەرەنسییەو زیاتر بە هۆی 17 بەرگەکەی مێژووی فەرەنسەوە ناسراوە (1833 – 1867) لە پاریس لە دایك بووە, وەکو کوڕی چاپخانەسازێکی ئیفلاسکردوو منداڵییەکی ناخۆشی بەسەر بردووە, وەلێ سەرباری ئەوەش خوێندنێکی باشی بە نسیب بووە, سەرەنجام لە ساڵی 1822دا, بوو بە پرۆفیسۆری مێژوو لە کۆلێجی سانت بارباو لەویشەوە بۆ پەیمانگای باڵای مامۆستایان ـ 1827 . لەو ساڵەدا کتێبی زانستی نوێی ڤیکۆی کرد بە فەرەنسی. لە ساڵی 1831 دا, کتێبی پێشەکییەك بۆ مێژووی جیهان و مێژووی کۆمارەکەی رۆمانی بڵاو کردەوەو نێوبانگی پەیدا کرد. ئیتر لە سەرەتای ساڵی 1833وە دەستی کرد بە زنجیرە کتێبەکەی مێژووی فەرەنسە. لە ساڵی 1838 وە لە کۆلیج دۆفرانس وانەی وتۆتەوە. لە ساڵی 1846دا کتێبی گەلی بڵاوکردەوە, پاشان لە ماوەی نێوان ساڵانی 1847– 1853 دا کتێبی مێژووی شۆڕشی فەرەنسەی بڵاو کردەوە. لە ساڵی 1852دا, نەیویست دڵسۆزیی خۆی بۆ شارل لویس ناپۆلیۆن دەرببڕێت, کە لەو ساڵەدا ببوو بە ناپۆلیۆنی سێیەم, ئیمپراتۆری فەرەنسە. ئیتر پۆستی رەسمیی جێهێشت و کەوتە رەوشێکی نیمچە دورخرانەوەوەو خەریکی تەواوکردنی کتێبی مێژووی فەرەنسە بوو. لە گۆشەنیگای مێژوویی و فەلسەفییانەی خۆیەوە چەندان رۆمانیشی نوسیوە, لەوانە: داوەت – 1854, خۆشەویستی –1858, ئافرەت –1860, ئەفسونبازەکە –1862, ئینجیلی مرۆڤایەتی –1864 , کوڕەکانمان –1869 . بەلای میشیلێوە مرۆڤایەتی هەردەم لە پێناوی دوو ئامانجدا دەژی, دادپەروەریی و خۆشەویستی, میشیلی بایەخیشی بە سروشت داوە, چەندان کتێبیشی لەوبارەیەوە نوسیوە, لەوانە: باڵندە – 1856, مێروو –1857, دەریا –1861, چیا –1868, هەروەها کتێبێکیشی دەربارەی بەزینی فەرەنسا لە جەنگی پروسیاییەکاندا نوسیوە (1870–1871), رمانی ئیمپراتۆرییەتەکە بووە هۆی گێڕانەوەی میشیلا بۆ پلەو پایەی خۆی. پێش مردنی کتێبی فەرەنسا لەپێش ئەورووپاوە –1871, هەروەها دوو بەرگی یەکەمی مێژووی سەدەی نۆزدەشی بڵاوکردەوە 1872–1873.

[12] ئەندرێ جید(1869-1961) Gide, André نوسەرێکی فەرەنسییە, نوسین و شانۆنانەکانی و سەربوردەکانی, پڕن لەشیکردنەوەی کاراکتەری مرۆڤ و رەفتارو ئاکاری تاکەکان, ئاکارێتی





*** جیدت ناسی؟**

**ڕۆلان بارت: نا, نەمناسی, جارێکیان لە دوورەوە لە گازینۆی "لۆتیتیا" بینیم: قۆخی دەخواردو کتێبێکی دەخوێندەوە. کەواتە نەمناسی, وەڵێ گەڵێ فاکتەری تر هەبوو تا بایەخی پێبدەم, وەکو هەزاران هەرزەکاری تری ئەو ماوەیە.**

*** کام فاکتەرانە, بۆ نمونە؟**

**ڕۆلان بارت: ئەو پرۆتستانت[14] بوو. پیانۆی دەژەند و باسی ئارەزووی دەکرد و دەینوسی.**

*** بە نیسبەتی تۆوە مانای چیە پرۆتستانتی بیت؟**

**ڕۆلان بارت: وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە سەختە. وەڵێ دەتوانم بڵێم هەرزەکاریی پرۆتستانتییانە مەیلێکی زۆر بەرەو گۆشەگیریی دەبەخشێت, لەگەڵ ئەو زمانە ناوەکییەی کە مرۆڤ بۆ خۆی دەیهێڵێتەوە.**

*** دەڵێن تۆ چێژگەرایت, ئایا ئەمە بە هۆی بەدحاڵیبوونەوەیە؟**

**ڕۆلان بارت: چێژگەرایی, خەڵك بە چاوێكی باش سەیری ناکەن, لە گوێیاندا دەنگدانەوەیەکی خراپی هەیە. هیچ کەس, هیچ کەس لە جیهاندا, فەیلەسوفێك یان تیۆرییەك نیە بتوانن بە باشترین شێوە لێی تێبگەن.**

---

پرۆتستانتی بلاو دەکردەوە. لەپاڵ کارە رەخنەییەکانیدا کە کاریگەرییەکی زۆریان هەبووە لەسەر فەلسەفەو ئەدەبی فەرەنسی.

[13] کامۆ, ئەلبێر Camus, Albert (1913-1960), رۆماننوسێکی فەرەنسی - جەزائیرییە, دراmanوس و رۆژنامەنوسیش بوو, هەروەها وتاری فەلسەفی و سیاسییشی دەنوسی, لە نوسینەکانیدا بایەخی دەدا بە گرفتەکانی مرۆڤ لە دونیای مۆدێرندا, جەختی لەسەر بێمانایی دونیا دەکرد. لە ساڵی 1957دا خەڵاتی نۆبڵی پێدەبەخشرێت لە ئەدەبدا. بەکارەساتی ئۆتۆمبیل دەمرێت. دیارترین کتێبەکانی : نامۆ ـ 1942, ئەفسانەی سیزیف ـ1942 .

[14] پرۆتستانتیزم Protestantism, یەکێکە لە سێ لقە سەرەکییەکەی ئاینی مەسیحی, کە دوانەکەی تر کاسۆلیك و ئارسۆدۆکسن. پرۆتستانتیزم لەسەدەی شازدەیەمدا, وەکو جوڵانەوەیەکی ریفۆرمکار لەناو کەنیسەی خۆراواییدا, دەستی پێکردووە. مەبەستی سەرەکیشی بریتی بوو لەژیاندنەوەی دابونەریتە رەسەنەکانی مەسیحییەت.





* تۆ باش لێی تێگەیشتوویت؟

رۆلان بارت: لەوانەیە پێویست بێت وشەیەکی تر بدۆزینەوە. ئەمە ئەگەر چێژگەرایی فەلسەفە بێت , ئەوا دەبێت ئەو دەقانەی لەسەریان دامەزراوە فشەڵ بن. لەم بوارەدا دەق نیە. تا رادەیەك نەریتێك هەیە. بۆیە کاتێك دەقەکان لاواز بن و قایلکەر نەبن و نەریتەکەش لاواز بێت, زەحمەتە جێگایەك بۆ خۆمان بدۆزینەوە.

* بە هەرحاڵ ئیپیکۆرەسی[15] هەیە.

رۆلان بارت: بەڵێ. بەڵام دەمێکە رەتکراوەتەوەو قەدەغەکراوە.

---

[15] ئێپیکیورەس Epicurus (341-270 bc) فەیلەسوفێکی یۆنانییە, لە دورگەی سامۆس لە خێزانێکی ئەسینایی لە دایك بووە, باوکی مامۆستا بووەو لای ئەو خوێندوویەتی, هەروەها لای چەند فەیلەسوفێکی جیاجیاش خوێندویەتی. لە تەمەنی 18 ساڵیدا بۆ خزمەتی سەربازی چووە بۆ ئەسینا, دوای ماوەیەکی کەم لە ساڵی 322 دا, پەیوەندیی کردووە بە باوکییەوە لە کۆڵۆفۆن و دەستی کردووە بە مامۆستایی. لە دەوروبەری ساڵی 311 دا قوتابخانەیەکی فەلسەفیی دامەزراندووە. دوو ساڵ دواتر بووە بە بەڕێوەبەری قوتابخانە لە لامپاسکۆس (ئێستا پێی دەڵێن لاپسێکی و دەکەوێتە تورکیاوە). لە ساڵی 306دا گەڕاوەتەوە بۆ ئەسیناو لەوێ نیشتەجێ بووەو دەستی کردووە بە بڵاوکردنەوەی پێڕەوەکەی خۆی و گروپێك لە شوێنکەوتووان لە دەوری کۆبوونەتەوە. لەبەرئەوەی لە ناو باخچەی ماڵەکەی خۆیدا وانەی دەوتەوە, شوێنکەوتووەکانی بە فەیلەسوفانی باخچە ناسراون. ژن و پیاو ئامادەی وانەکانی دەبوون, ئەوە لەوکاتەدا باو نەبووە, ستۆیسیستەکان هێرشێکی سەختیان کردۆتە سەری. قوتابیان لە سەراپای یۆنان و ئاسیای بچووکەوە هاتوونە بۆ قوتابخانەکەی, زرنگی و رۆشنبیرییەکەی زۆر کاریگەر بووە. ئێپیکورەس نوسەرێکی بە بەرهەم بووە, بەپێی دایۆجینیەسی لایرتیۆسی, 300 دەستنوسی لێجێماوە, لە ناویاندا 37 تێز دەربارەی فیزیاو چەندەها نوسراویش دەربارەی خۆشەویستی, دادپەروەری, خوداکان و بابەتی تریش. تەنها سێ تێز و ژمارەیەك پەرەگرافی کورت بە ئێمە گەیشتوون, ئەوانیش لەناو ژینامەکەی دایۆجینیەسی لایرتیوسیدان. پرەنسیپەکانی پێڕەوەکەی ئێپیکیورەس لە نوسینی سیسیرۆ, سێنیکا, پلۆتارخ و لۆکریتیۆسدا دەبینرێن کە ئەمەی دواییان هۆنراوەیەکی هەیە بە ناونیشانی دەربارەی سروشتی شتەکان, باسی فەلسەفەکەی ئێپیکیورەس دەکات.





**ئاكارت هەیە؟**

رۆلان بارت: با ئاكارێتی پەیوەندیی سۆزیی بێت. وەلێ من ناتوانم هیچ شتێك دەربارەی بڵێم, لەبەر ئەوەی قسەم دەربارەی زۆرە! پەندێكی چینی هەیە, دەڵێت "تاریكترین جێگا ئەوەیە كە لە ژێر رۆشنایی چراكەدایە".

*** شتێك هەیە, هەرگیز دەربارەی نادوێیت: سێكس..**

رۆلان بارت: راستتر من دەربارەی ئیرۆتیزم دەدوێم..

*** تۆ باسی سێكس دەكەیت, بەڵام بۆ ئەوەی لە بەهای دابەزێنیت.. بۆ نمونە ئەم رستەیە "ئەو مەسەلەیەی یەكێك بووە لە بنەماكانی پێكهاتەی من ئەوەیە من زیاتر بایەخم بە سامان داوە, نەك سێكس".**

رۆلان بارت: من لە توێی ئەم رستەیەوە دەمویست بڵێم من هەرگیز بە هۆی چەپاندنی سێكسییەوە ئازارم نەچێشتووە, گەرچی چل ساڵ بەر لە ئێستا قورستر بوو. بە راشكاویی پێی لێدەنێم, رووداوەدات سەرم سوڕبمێنێت لە تورەیی هەندێك دژی كاریگەریی حاڵەتی ئاسایی. من نكوڵی لەم كاریگەرییە ناكەم, بە دڵنیاییەوە, بەڵام كون و كەلەبەریشی تێدایە.

**چ پەرجوویەك وای لێكردیت لەمە قوتار ببیت؟**

رۆلان بارت: قوتار نەبووم. هەمیشە و بەوپەڕی ئاسانی لە پێشدا عیشق هەیە. بۆیە چەمكی "رەتكراوە" لای من جێگای "قەدەغە" ی گرتەوە. ئەوەی ئازاری دەدام شتی قەدەغە نەبوو, بەڵكو شتی رەتكراوە بوو.

**مەبەستت لەو رستەیە چیە كە دەڵێیت لە پێكهاتەی تۆدا سامان لە سێكس گرنگتر بوو؟**

رۆلان بارت: بە سادەیی لەبەر ئەوەی من منداڵی و هەرزەكاریم بە هەژاریی بەسەر بردووە. جاری وابووە هیچمان نەبووە بیخۆین. بۆنمونە دەبوو ماوەی سێ رۆژی لەسەر یەك بڕۆم بۆ دوكانێك لە شەقامی سین بۆ ئەوەی كەمێك پەتاتە و تۆزێك جگەر بكڕم. بە پێی بەروارەكانی كۆتایی مانگ ژیانمان رەزالەت بوو, چونكە دەبوو كرێ خانوو بدەین. دیمەنی رۆژانە بریتی بوو





لەوەی دایکم ببینم بێ راوەستان کاردەکات. رەنگە نەداری و نەهامەتی لە فەرەنسای ئەو ماوەیەدا ژینگەیەکی بوونگەرا بووبێت کە ئێستا بە هەمان پلە بوونی نیە.

*** لەگەڵ ئەوەشدا تۆ سەر بە خێزانێکی بۆرجوازی بوویت, هەر هیچ نەبێت بە ئەسڵ و فەسڵ.**

رۆلان بارت: خێزانێکی بۆرجوازی کە بە تەواوی نابووت بووەو هیچی نەماوە. ئەمەش پلەی سفری راستەقینەی دووهێندە کردەوە, هەستێکی دروستکرد بە لە دەستدانی ئەو ئاستی کۆمەڵایەتی و چینایەتییەی کە هەمانبوو, هەتا ئەگەر ژینگەکەش زانیبێتی چۆن پارێزگاری لە هونەری ژیان دەکات. بۆ نمونە بیرمە, لە سەرەتای هەموو وەرزێکی خوێندندا, پۆشاکی شایستەم نەبوو, پارەشم نەبوو لەگەڵ قوتابیاندا بیبەخشم, یان کتێبەکانی خوێندن بکرم. وەك دەبینیت ئەمانە دیمەنی بچووکن, بەڵام مۆری خۆیان دەدەن لە کەسێتی مرۆڤ و کاری تێدەکەن و دواتر وای لێدەکەن دەستی بڵاو بێت.

*** ئایا ئەمە هۆی رق هەڵگرتنتە لە "بۆرجوازی بچووك" کە لە کتێبەکانتدا باسی دەکەیت؟**

رۆلان بارت: راستە. ئەمەم لە کتێبەکانمدا زۆر بەکارهێناوە. پاشان دواتر کەمم کردەوە, چونکە رووداوەدات لە زمانەکەی خۆمان ماندوو دەبین, بە هەرحاڵ ئەوە شتێکی دڵنیایە: بۆرجوازی بچووك تۆخمێکی ئیستاتیکی یان ئاکاریی هەیە کە لە یەك کاتدا سەرسامیمەشم دەکات و بێزاریشم دەکات.. بەڵام ئایا ئەمە شتێکی نوێیە؟ پێشتر فلۆبێر.. کێ دەوێرێت لێپرسراوێتییەکەی ئەو وەکو بۆرجوازییەکی بچووك, بخاتە ئەستۆی خۆی؟ لە رووی مێژوویی و سیاسییەوە, بۆرجوازییەتی بچووك کلیلی سەدەکەیە. بریتیە لەو چینەی بەرەو ژوور هەڵدەکشێت. بە هەرحاڵ ئەو چینەیە کە چاوی دەبینێت. بۆرجوازییەت و پرۆلیتارییا چوونەتە پۆلی پەتییەکانەوە. بەڵام ئەو, واتە بۆرجوازییەتی بچووك, ئەو هەموو بوارەکانی داگرتووەو ئێمە تەنانەت لە





نێوەنـدەکانی بۆرجوازییـەت و پرۆلیتاریاشـدا دەیبینینـەوە, ئەگـەر ئـەم دوو چینە بە راستی مابن.

*** باوەڕت بە پرۆلیتاریاو ئەرکە مێژووییەکانی و هەموو ئەو شتانەی لـە رووی سیاسـییەوە لێیان دەکەوێتەوە, نەماوە؟**

رۆلان بارت: دەڵێم کاتێك هەبوو پرۆلیتاریا خۆی تێدا دەبینی. وەڵێ ئێستا ئەو کاتە نـەماوەو تێپـەڕیوەو ناگەڕێتـەوە. لـە فەرەنسا, ئـەو کاتـە کاتێك بـوو کـە پشـێویگەرایی[16] و سەندیکاچـێتی و داب و نەریتـە پرۆدۆنییـەکان[17] باڵیـان

---

[16] پشـێویگەرایی . ئانارشـیزم Anarchism تیوریيـەکی سیاسـیە, دژی هـەموو فۆرمـەکانی حکومەتـە. پشـێویگەراکان باوەڕیـان وایـە ئەوپـەڕی ئـاواتی مرۆڤایـەتی, ئـازادی گوزارشـت لـە خۆکردنـە, بـێ ئـەوەی بـەرەورووی هـیچ سـەرکوتکردنێك یـان کۆنترۆڵکردنێك ببنـەوە. تـەواوی هەوڵی ئانارشیستەکان بۆ تواندنەوەی هەموو شێوازەکانی حوکمە, بۆ ئەوەی تاکەکان بە رەهایی سەربەست بن. وەڵێ لـە دیوی فەلسـەفییەوە, پییر جۆزیف پرۆدۆنی فەرەنسیی, بە باوکی ئـەو سیسـتمە دادەنرێـت کـە پێـی دەوترێـت ئانارشـیزمی فەلسـەفیی. بـە بـڕوای ئـەو ئـەم چەشـنە ئانارشیزمە, دەسەڵات لە کۆمەڵگا وەردەگرێتەوەو, لە جێگەی ئەو تاکایەتیی سەرپشك دەکات.

[17] پـرۆدۆن, پـییر جۆزێـف Proudhon, Pierre Joseph (1809-65), نوسـەرو تیوریسـتێکی سیاسـیی فەرەنسـییە, هەنـدێکجار بـەباوکی پشـێوگەرایی هاوچـەرخ دادەنرێـت. پـرۆدۆن لـە خێزانێکـی هـەژارەوە هـاتووە, بـەڵام ئەوەنـدەی خوێنـدووە کـە بتوانێـت بخوێنێتـەوەو بنوسـێت. یەکـەمین نامیلکـەی لـە سـاڵی 1840 دا, بـە ناونیشـانی موڵکایـەتی چـیە, چـاپکراوە. تیوریيـە رادیکاڵەکانی کردیان بە پیاوێکی ناسراوی جەماوەری و وەکو بیریـارێکی پشـێوگەرا ناسـرا. لە دوای شۆڕشـــی ســـاڵی 1848 هەڵبـــژێردرا بـــۆ ئەنجومـــەنی کۆنســـتیتۆنت. بـــرۆدۆن دژێکـــی سەرسـەختی سوسـیالیزمی یۆتۆپیـایی فەرەنسـی فرانسـیۆس فۆرییـەو کلـۆد رۆڤـرۆی, هـەروەها سان سیمۆن بووە. لەساڵی 1849 ـ 1852 لەبەر ئەوەی رەخنـەی لـە لـویس نـاپۆلیۆن گرتبـوو, دەخرێتـە زیندانـەوە. دوای ئـازاد بـوونی ژیـانی خـۆی لـە تاراوگـە بەسـەربرد. گـەورەترین و ناودارترین کاری بریتیە لە فەلسەفەی نەهامەتی ـ 1846, هەروەها هزرە شۆڕشگێڕەکان ـ 1849 , هەروەها دەربارەی دادپەروەریی لە شۆڕش و لە کەنیسەدا, سێ بەرگە ـ 1856. دواجار کتێبی توانا سیاسییەکانی چینەکانی کارگەران ـ 1863.





کێشابوو. بەڵام ئەمڕۆ مارکسیزم و جوڵانەوەی سەندیکایی جێی ئەوەیان گرتۆتەوە..

**قەت مارکسی بوویت؟**

رۆلان بارت: سیفەتی "مارکسی" مانای چیە؟ جارێکیان وتومە درەنگ "هاتووم" بۆ لای مارکسیزم, ئەویش بە هۆی هاوڕێیەکی ئازیزەوە بوو کە دەمێکە ئەم دونیایەی جێهێشتووە, پیاوێکی ترۆتکسییانە[18] بوو. "هاتم" بۆ لای بێ ئەوەی بە هیچ جۆرێك خەبات بکەم, لە رێگەی تاقمێکی جیاوەبووەوەهاتم, هیچ پەیوەندییەکی نەبوو بەوانەی لەو کاتەوە بە ستالینیەکان[19] ناویان دەبرا. گریمان من مارکس و لینین[20] و ترۆتسکیم

---

[18] ترۆتسکی, لیۆن Leon Trotsky (1879 ـ 1940) سەرکردەیەکی سیاسی روسییە, لە خێزانێکی جولەکەی ئۆکرانیدا لەدایك بووە, چەند جارێك دەگیرێت و دوور دەخرێتەوە بۆ سیبریا بەڵام هەڵدێت و پەیوەندیی دەکات بەلینینەوەو لەشۆڕی ئۆکتۆبەردا بەشداریی دەکات, ستالین دووری دەخاتەوەو , دواجاریش تیرۆری دەکات.

[19] ستالین, جۆزیف Stalin, Joseph (1879-1953), سەرکردەیەکی سیاسیی روسییە, لە خێزانێکی هەژاری شارۆچکەی گۆری جۆرجیاوازی لەدایك بووە. لەقوتابخانەیەکی ئاینیی خوێندوویەتی بەڵام پێش ئەوەی تەواوی بکات دەرکراوە. لەساڵی 1922 ـ 1953 سکرتێری گشتی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێتی کۆن بووە, لەساڵی 1924دا دوای مردنی لینین دەسەڵات کەوتۆتە دەستی ئەمەوە, فەرمانڕەوایەکی دڵڕەقی دیکتاتۆر بوو, بووە هۆی بۆگەن, کردنی سۆڤێت لەناوەوە. هەرزوو وڵاتی کۆنترۆڵ کردو ترس و تۆقینێکی زۆری نایەوە. سیاسەتی ئاگرو ئاسن, چاودێریکردنی بەردەوام, راگوێزانی بەکۆمەڵ. دروستکردنی ئۆردوگای کشتوکاڵی و پیشەسازی و سازکردنی ژینگەی کارکردنی نادروست, بوو بەهۆی دروست کردنی وڵاتێکی بەهێزو گەلێکی بێدەسەڵات. دوای جەنگی جیهانیی دووەم دەستی گرت بەسەر ئەوروپای خۆرهەڵاتداو ژمارەیەك سیستمی تۆتالیتاریی وەك ئەوەی خۆی لەوێش دامەزراند. لەساڵی 1956دا دەمرێت. سەردەمی فەرمانڕەوایی ستالین بەسەر دەمی پەرستنی کەسایەتی ناو دەبرێت و ئەو سیستم و لایەنانەشی سەر بەو پێڕەوە بوون وپێیی سەرسام بوون, پێیان دەوترێت ستالینییەکان و پێڕەوەکەشی ستالینیزمە, کەبووە بەسیمبوای تۆقاندن و سەرکوتکردن و سزای بەکۆمەڵ.





خوێندۆتــەوە, هــەموو نوســینەکانیان نــا. بــەڵام لــێم خوێندوونەتــەوە. ئــیتر جــارێکی تــر نەمخوێندنــەوە, هەنــدێجار ئــەم یــان ئــەو دەقــەی مــارکس دەخوێنمەوە.

*** ئایا وەك ئەوەی میشیلیٚ و ساد[21] و فلۆبێر[22] دەخوێنیتەوە, ئاواش دەقێکــی مــارکس دەخوێنیتەوە؟ وەك ئەوەی سیستمێکی پوختە بێت لە ئاماژەکان, دروســتکەری چــێژێکی پەتی بێت, دەیخوێنیتەوە؟**

رۆلان بارت: دەشێت بەم رێگەیە مارکس بخوێنیتەوە. بەڵام ناشێت ئەمە لەگەڵ لینین و تەنانەت ترۆتسکیشدا بکەیت. لەگەڵ ئەوەشدا, من پێموانیە بتوانین پەیوەندییەك بە مارکســەوە بگرین هاوشــێوەی ئەو پەیوەندییە بێت کە بە نوســەرێکەوە دەیگــرین. ئێمــە نــاتوانین خۆمــان لــە ئەنجامــە سیاســییەکان دابماڵین. لە تۆمارەکانی دواترەوە کە بە هۆیانەوە دەق بە شێوەیەکی بابەتیی بوونی دەبێت. لای من برێك لە پشێویگەرایی تێدایە, بە مانا ئەسڵییەکەی, کە هەرگیز ناگۆڕێت.

---

[20] لینین, ڤلادیمێر Vladimir Lenin ( 1870 ـ 1924 ) سەرکردەیەکی سیاسیی روسییە, دامەزرێنەری پارتی کۆمۆنیستی روسیایەو, سەرکردەی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی 1917یەو, یەکەمین ســەرۆکی یــەکێتی ســۆڤێتە 1917 ـ 2419 . دیــارترین نوســراوەکانی : پەرەســەندنی سەرمایەداریی لە روسیا 1889, ئیمپریالیزم باڵاترین قۆناغی سەرمایەدارێتییە 1916.

[21] ساد, مارکیز دی Sade, Marquis de (1740–1814), نــاوی شــۆرەتی دۆنیــتێن ئــەلفۆنس فرانسیۆســە , رومــان و شانۆنامەنوســێکی فەرەنســییە, هــەروەها لێکۆڵینــەوەی فەلسەفییشــی هەیە. زیاتر بەو کارانــەی ناسراوە کــە پــڕن لەســەرکوتکردن و چەپاندن, لەبەر چەند تاوانێکی سێکســی دەگیرێــت و دەخرێتــە زیندانــەوە, بــەڵام هەڵــدێت بــەرەو ئیتالیــا, پــاش ماوەیــەك دەگەڕێتەوە. دیسان دەیگرن و فڕێی دەدەنە زیندانەوە, ئازاد دەکرێت و دیسان دەگیرێتــەوەو لــە زینداندا دەمرێت.

[22] فلــۆبێر, گۆســتاڤ Flaubert, Gustave (1821-1880), نوســەرێکی فەرەنسییە, بە رۆمانی "مەدام بۆڤاری" ناوبانگی دەرکردووە. هەروەها پەروەردەی عاتیفیشی نوسیوە. فلۆبێر بە باوکی شێوازی ریالیزمی ئەدەبی, دادەنرێت.





*** سەردەمانێك رۆشنبیران پێیان وابوو خوێی زەوین.**

رۆلان بارت: سەبارەت بە خۆم, دەتوانم بڵێم ئەوانە خانەدانەکانی کۆمەڵگان. ئەمەش بە پشتبەستن بە ئەسڵی وشەی خانەدان, ئەوان بە کەڵکی هیچ نایەن لە حاڵەتێکدا نەبێت کە دەستەمۆ دەکرێن. بەڵام خانەدانەکان تێکڕا بە کەڵکی هیچ نایەن. بە مانایەکی دیاریکراو, رۆشنبیران بە کەڵکی هیچ نایەن.

*** مەبەستت چیە لە وشەی خانەدانەکان؟**

رۆلان بارت: رۆشنبیر بوونی کاروانێکی مێژوویی دەسەلمێنێت کە خۆی یەکێکە لە خانەدانەکانی. ئەو بە پێی شکڵەکانی خانەدانی ئارەزوو و غەریزەکان, ئاڵۆسکاندن و سنوردارکردن کریستاڵە دەکات کە بە دڵنیایی سەر بە کۆمەڵگایە. گەشبینان دەڵێن رۆشنبیر شایەتە, منیش دەڵێم راستر ئەو نیشانەکەرە.

*** کەواتە بە نیسبەتی تۆوە بێسوودە؟**

رۆلان بارت: بێسودە, بەڵام مەترسیدارە. هەموو سیستمێکی بەهێز هەوڵ دەدات ناچاری بکات سەرڕاست بێت. مەترسییەکەی رەمزییە, وەکو نەخۆشێکی چاودێریکراو مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت, یاخود وەك ئەوەی شتێکی زیادەی نیگەرانکەر و بێزارکەر بێت, بەڵام دەشهێڵرێتەوە بۆ ئەوەی بە هۆی ئەوەوە نەزوەو ئارەزووەکان و لێشاوی زمان لەناو فەزایەکی چاودێریکراودا بهێڵرێتەوە.

*** ئەی تۆ, ئەو ماوەیە چەندە کە بڕیوتە تا ئەوەی ببیت بە یەکێك لەو خانەدانانە.**

رۆلان بارت: با بەوپەڕی سادەیی بڵێین, من ئاماژە دەکەم بۆ بایەخدانێکی مێژوویی بە زمان. هەروەها نیشانەش دەکەم بۆ چەند شکڵێکی نوێ لە ئالودەیی, سەراسیمەیی, حاڵەت و دەربڕینە نوێیەکان.

**نوسەرانی هاوچەرخی خۆت دەخوێنیتەوە؟**

رۆلان بارت: لە راستیدا, بە شێوەیەکی گشتی, من زۆر کەم دەخوێنمەوە. ئەمە درکاندنی نهێنییەك نیە. بەڵکو لە کتێبەکانمدا بە جوانی دیارە. من سێ

شێوازم هەیە بۆ خوێندنەوە. یەکەم چاو بە کتێبێکدا دەخشێنم, یان خەڵکی بۆم باس دەکەن. ئەمە تەرزێکی زۆر گرنگی خوێندنەوەیە, هەرگیز ئیشارەتی بۆ ناکرێت. هەروەها وەکو جیل رۆمان کە هەوڵێکی بە زایەچووی دەدا لەمەڕ بینینی کوێران کە لە دەرەوەی چاو رووی دەدا, دەتوانم بە ئیختیاری خۆم باسی ئەم جۆرە خوێندنەوەیە بکەم دەربارەی زانین بە بیستن, زانینێکی تەژمو درشت, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەرکی خۆی رادەپەڕێنێت. بەڵام شێوازی دووەمی خوێندنەوە بریتیە لە: کاتێك کارێکم دەبێت بیکەم, چ ئەگەر وانەیەك بێت یان دانانی کتێبێك, ئەوا کتێب دەخوێنمەوە, لە بەرگەوە بۆ بەرگ دەیانخوێنمەوە, تێبینی تۆمار دەکەم. بەڵام تەنها بە پێی پێداویستییەکانی کارەکەم دەخوێنمەوە. دواجار, جۆرێکی سێیەمی خوێندنەوە هەیە کە شەوانە کاتێك دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە دەیکەم. لەم حاڵەتەدا بە زۆری کتێبی کلاسیکی دەخوێنمەوە.

*** تۆ وەڵامی پرسیارەکەمت نەدایەوە..**

رۆلان بارت: سەبارەت بە نوسەرانی هاوچەرخم, هەموویان لە ئاستی یەکەمی خوێندنەوەدا دادەنێم, واتە چاوێك دەخشێنم بەوەدا کە دەینوسن. بۆچی؟ زەحمەتە بتوانم باسی ئەمە بکەم. چونکە من دەترسم لەوەی سەراسیمەی مادەیەکی نزیك ببم, زۆر نزیك, بە رادەیەك نەتوانم دەسکاریی بکەم. من ناتوانم دەسکاری فۆکۆ[23] یان دۆلۆز[24] یان سۆلەرز بکەم.. ئەمان زۆر نزیکن.

---

[23] فۆکۆ, میشیل Foucault, Michel (1924 ـ 1984 ) فەیلەسوفێکی فەرەنسییە, هەوڵیداوە پیشانی بدات کەئەو بیروباوەڕە بنەڕەتییانەی کە خەڵك وادەزانن بریتین لە راستیی هەمیشەیی و بەردەوام دەربارەی سروشتی مرۆڤ و کۆمەڵگا, بەدرێژایی مێژوو دەگۆڕێن. لێکۆڵینەوەکانی میشیل فۆکۆ تەحەدای کاریگەرییەکانی فەیلەسوفی سیاسیی ئەڵمان کارل مارکس و دەرونشیکاریستی ئوستریایی سیگمۆند فرۆیدیان کردووە. فۆکۆ چەندان چەمکی تازەی پێشکەش کردوین دەربارەی زیندانەکان, پۆلیس, زامنی ژیان, ئاگاداریکردنی عەقڵی نەخۆش, مافەکانی هۆمۆسێکسییەکان, لەگەڵ کامەرانیدا.





**هیچ ئاوارتەیەك هەیە؟**

رۆلان بارت: هەندێك ئاوارتە هەیە. لێرەو لەوێ كتێبێك سەرنجی راكێشاوم و كاریگەریی لەسەر كارەكەم جێهێشتووە. بەڵام زۆرجار ئەمە بە رێكەوت روودەدات. ئەمە لە لایەك, لە لایەكی تریشەوە, كاتێك كتێبێكی هاوچەرخ دەخوێنمەوە, هەمیشە لە كاتێكی زۆر درەنگدا دەیخوێنمەوە, بە هیچ جۆرێك لە كاتی گونجاودا نایخوێنمەوە. كاتێك خەڵكی زۆر باسی كتێبێك دەكەن, زۆرجار هەراو زەنایەكی لێدەكەوێتەوە, بۆیە حەز لە خوێندنەوەی ناكەم. ماوەیەكی درێژ دوای دەرچونیان, ئینجا دوو كتێبەكەی جیل دۆلۆز "نیچە" و "ئەنتی ئۆدیپۆس"م خوێندۆتەوە.

* **بەڵام لاكانیش[25] هەیە, كە تۆ جارجارێك بۆی دەگەڕێیتەوە..**

رۆلان بارت: هەندێجار, نازانم. كاتێك كتێبی "گوتاری خۆشەویستی" م نوسی, بە تایبەتی بۆی گەڕامەوە, چونكە پێویستیم بە سایكۆلۆجیا هەبوو.

* **گەڕاینەوە بۆ لاكانیزم یان دەقی لاكانی؟**

رۆلان بارت: گەڕامەوە بۆ هەردوكیان. دەقی لاكانیم وەك خۆی بەلاوە گرنگە. دەقێكە تەدارەكت دەكات.

**ئەمە بە هۆی گەمەكردن بە وشەوە؟**

---

[24] دۆلۆز, جیل Gilles Deluse ( 1925 ـ 1995 ) فەیلەسوفێكی فەرەنسییە, ئوستادی زانكۆی هەشتەمی پاریس بووە, یەكێكە لەفەیلەسوفە دژە هیگڵییەكان, بۆیە بەردەوام دژی "شكڵ ـ دەوڵەت " بووە.ژمارییەك لێكۆڵینەوەی دەربارەی مێژووی فەلسەفە نوسیوە. بەلای دۆلۆزەوە نیچە رزگاركەری مەزنی بیری نوێیە, دیارترین نوسراوەی بریتییە لە " ئەنتی ئۆدیب ( 1972). لەساڵی 1995دا خۆی كوشت.

[25] لاكان, جاك Jacques Lacan ( 1901 ـ 1981 ) دیارترین ناوی فەرەنسییە لە بواری دەرونشیكارییدا لە ماوەی دوای جەنگی جیهانی دووەم بە دواوە . لاكان فرۆیدی بە فیكری فەرەنسی ناساندو دیارترین نوسراوەكانیشی بریتین لە ئەودیو پرەنسیپی واقیع , قۆناغی ئاوێنە , بابەتی نەست , من لە تیۆرەی فرۆیدیی و تەكنیكەكانی شیكردنەوەی دەروونییدا.





**رۆلان بارت: نا, هەرگیز. چونکە من بەم لایەنە هەستیار نیم. من ئەمە باش دەبینم, بەڵام بە لامەوە گرنگ نیە. لە بەرامبەری ئەوەدا, من زۆرجار لایەنەکەی ترم خۆشدەوێت. لە راستیدا, ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پۆلێنکارییە نیچەییەکە[26], لاکان تێکەڵەیەکی زۆر دەگمەنە لە "راهیب" و "هونەرمەند".**

*** ئایا پەیوەندییەک هەیە لە نێوانی ئەو خەیاڵییەی لە کاری تۆدا بنەڕەتییەو ئەو ئەندێشەییەی لای لاکان هەیە؟**

**رۆلان بارت: بەڵێ, هەمان شتە, وەلێ من بە دڵنیایی شێوەی بابەتەکە دەگۆڕم, چونکە دای دەبڕم. هەستێکم هەیە بەوەی ئەندێشەیی باوکە هەژارەکەی دەرونشیکارییە, خزێنراوەتە نێوانی واقیعی و رەمزییەوە, بە لامانەوە کەمبەها دیارە.**

---

[26] نیچە, فریدریش Nietzsche, Friedrich Wilhelm (1844-1900) فەیلەسوفێکی ئەڵمانییە, شاعیر و فیلۆلۆجیستێکی کلاسیکە, یەکێکە لە کاریگەرترین بیریارانی سەدەی نۆزدە. لە ناوچەی رۆوکێنی پروسیا لە دایک بووە, باوکی قەشەیەکی لۆسەریی بووە هەر لە منداڵیی نیچەدا مردووە, دایکی لە کەش و هەوایەکی ژنانەی ئاینییدا پەروەردەی کردووە, کە دایکی و نەنکی و دوو پوری و خوشکێکی دەگرێتەوە. لە هەردوو زانکۆی بۆن و لایپزین فیلۆلۆجیای کلاسیکی خوێندووەو لە تەمەنی 24 ساڵیدا بە پرۆفیسۆری فیلۆلۆجی لە زانکۆی باسێل دامەزراوە. تەندروستیی خراپ (هەموو ژیانی سەری ئێشاوەو چاوی باش نەیبینیوە) ناچاری کردووە لە ساڵی 1879 دا خۆی خانەنشین بکات. ساڵی دواتر باری عەقڵیی تێکچووەو هەرگیز چاک نەبۆتەوە. لە ساڵی 1900 دا لە ڤایمار مردووە. لە پاڵ کاریگەریی فەلسەفەی یۆنانی دێریندا, بە تایبەتی ئەفلاتون و ئەرەستۆ, لە ژێر کاریگەریی فەیلەسوفی ئەڵمانی شۆپنهاوەر و تیوریی پەرەسەندندا بووەو هاوڕێیەتییکی بەتینی لەگەڵ ریچارد ڤاگنەری مۆزیکزاندا هەبووە. یەکەمین کاری بریتیە لە "لە دایکبوونی تراجیدیا ـ 1872. ساڵانی 1880 کان ماوەی بەپیتی ئەو بووە. لەو ماوەیەدا کتێبی زەردەشت وای وت دەنوسێت (بەشی یەکەم و دووەم و سێیەم لە ساڵی 1883–1884, بەشی چوارەم 1885), پاشان ئەودیوی چاکەو خراپە ــ 1886, جینیالۆجیای ئاکار ـ 1887, دژە مەسیح ـ 1888, مرۆڤ و سێبەرەکەی (ساڵی 1888 تەواو کراو ساڵی 1908 چاپکرا). دوایین کاری "ئیرادەی هێز" دوای مردنی لە ساڵی 1901 دا چاپکراوە.





*** ئایا خۆت دەخوێنیتەوە؟ مەبەستم ئەوەیە ئایا بە خۆتدا دەچیتەوە؟**

ڕۆلان بارت: لەو باوەڕەدام کە ئێمە هەمیشە دەزانین باسی چ مرۆڤێك دەکەین. هەمیشە, لە مەسەلەی ئاخاوتندا, کۆمەڵێك وشەی دیاریکراو هەیە گەرچی پێکەوە گونجاویش نەبن. بۆیە سەمەرەیی ڕەهای نوسین لە ڕاستیدا لە پلەی سفری گوتارەوە دێت. شوێنەکە هەیە بەڵام بەتاڵە. ئێمە هەرگیز نازانین کێ ئەو شوێنە پڕ دەکاتەوە, ئێمە بۆ کام مرۆڤە دەنوسین.

*** ئایا هەندێجار هەستی ئەوەت لا هەیە کە بۆ نەوەکانی ئایندە دەنوسیت؟**

ڕۆلان بارت: بە ڕاستی نا, ناتوانم ئەندێشەی ئەوە بکەم کە کتێب و کارەکانم یان ڕاستی کاری من دوای مردنم دەخوێنرێتەوە. بە هیچ جۆرێك ئەندێشەی ئەوە ناکەم.

*** تۆ دەڵێیت کاری من. ئایا تۆ بەئاگایت لەوەی کارێکی کامڵ دەنوسیت؟**

ڕۆلان بارت: نا. من بەئاگا نیم لەوەی کارێکی کامڵ دەنوسم, بەڵکو چەند کارێك لە تویێ تێکەڵەیەك لە بۆچوونی زۆرەملێ و بەردەوامبوون و خولی تاکتیکی.

*** ئایا کاری وا هەیە بە شێوەیەکی جیاواز بەردەوامییان هەبووبێت؟**

ڕۆلان بارت: ڕەنگە, بە دڵنیایی ئەوە ڕوویداوە. چونکە هەندێجار وەکو ڤالێری[27] بە پێی ئەوەی لێت "داواکراوە" دەنوسیت.

ڕۆلان بارت: هەندێجار وا دەکەم. بەڵام لە ڕاستیدا, وردە وردە ئەمەم کەم بۆتەوە. کاتێك مەسەلەکە پەیوەندیی هەبێت بە "داواکردنی" نوسینەوە, وەك پێشکەشکردنی کتێبێك یان هونەرمەندێك, یان نوسینی وتارێك, ئەمە بە باشی ڕوودەدات. بە کورتی هەموو شتێك بە باشی دەڕوات ئەگەر داوای

---

[27] ڤالێری, پۆل ,Valéry, Paul Ambroise (1871-1945) شاعیرێکی فەرەنسییە کارەکانی نمونەی بوونی قەیرانێکن لەنێوانی تێڕامان و کردەوەدا, کە پێویستە بەشێوەیەکی هونەریی چارەسەری بکرێت, بۆئەوەی بتوانین مانای ژین بدۆزینەوە.بەیەکێك لە مەزنترین نوسەرە فەلسەفییە مۆدرێنەکان لەقەڵەم دەدرێت لەهەردوو بواری شیعرو پەخشاندا.





نوسـینم لێبکرێـت. بـەڵام ئەگـەر مەسـەلەکە پەیوەنـدیی هـەبێت بـە چەشـنە داڕشـتنێکەوە, هـەروەها داڕشـتنی بابەتێکـەوە, ئـەوا زۆر خـراپ نوشوسـتی دەهێنم. بەڵام ئەگەر داواکەم قبووڵ کرد, ئەوا هەست بە نەهامەتییەکی زۆر و حەسرەتێکی قووڵ دەکەم.

*** لێرەوە لە لایەنی لەتوپەتی ئەوەی دەینوسیت, تێدەگەین..**

رۆلان بـارت: ئـەوە وەکـو هەڵـدێرێك وایـە. مـن وردە وردە بـەرەو برگەکـە یـان بەشەکە دەڕۆم. ئەمەشم پێخۆشەو باوەڕم بە گرنگێتییە تیورییەکەی هەیە, بە رادەیەك هەست بە نارەحەتیی نوسینی دەقە پێکەوە بەردەوامەکان دەکەم.

*** تەنانەت بە لەتوپەتی و شێمانەکانی داواکاریی, کارەکانی تۆ بابەت و سیمای وەهایان تێدایە کە لەتیان دەکەن و یەکیشیان دەخەن..**

رۆلان بـارت: بیرۆکـە هەیـە, بـۆ نمونـە ئەندێشـەیی, ناڕاسـتەوخۆ, هـەروەها بیرۆکـەی "بـەرەنگاریکردنی هیسـتریا" تەنانـەت ئەگـەر لـەم ماوەیـەی دواییـدا پەرەشی سەندبێت, بەڵام من ناڵێم ئەوانە بیرۆکەن.

*** دەتەوێت بڵێیت ئەوانە "چەمکن" وەك ئەوانەی فەیلەسوفەکان هەیانە؟**

رۆلان بارت: نا. چەمك نین. بەڵام لە هەمانکاتدا چەمکیش و خوازەشن. ئەگەر وشەکەی نیچە بە راستی دروست بێت, ئەگەر چەمکەکان چاوگێکی خوازەییان هەبێت, وەك ئەو دەڵێت, ئەوا من دەتوانم بڵێم پشت بەم چاوگە دەبەستم و دەگەڕێمەوە سەری. لێرەوە چەمکەکان ئەو وردییەیان تێدا نیە کە چەمکەکانی فەیلەسوفەکان هەیانە.

*** ئەوەی لە کتێبەکانتدا سەرنج رادەکێشێت, بزربی وردی نیە بە قـەدەر ئـەوەی لایـەنی وەحشییانەی ئەو چەمکانەیە کە دەیانخوڵقێنیت..**

رۆلان بارت: دەڵێیت وەحشی, ئەمە راستە. من چەشنە یاسایەکی هەڵلوشـەر دەقۆزمـەوە کـە بـاش مانـای سەرچـاوەکان نازانێـت. ئـەوەش بـە پشتبەسـتن بـە رەتکردنـەوە یـان نـاڕەزایی نـا. بـەڵکو بـە پشتبەسـتن بـە فەورییـەتی ئـارەزوو, هـەروەها بـە تۆزێـك چاوچـنۆکی و لرفلێدەرییـەوە. بـەم چاوچـنۆکییەوە, بـەم





لرفلێدەرییەوە دەست دەگرم بەسەر بیرۆکەو وشەکانی ئەوانیترداو پێیان دەژیم. پاشان منیش خۆم ناڕەزایی دەرنابڕم کە خەڵکی شتێکم لێ دەستێنن.

*** بۆیە تەنهایی لەم جۆرە پرۆسانەدا زیاتر هەیە لەچاو بیرۆکەکاندا..**

رۆلان بارت: بە تەواوی. راستر کاتێک مەسەلەکە پەیوەندیی بە جوڵەو پرۆسێسەکانەوە هەبێت زیاتر لەوەی پەیوەندی بە بیرۆکەو چەمکەکانەوە هەبێت. بۆ نمونە "خزان" خزانی وێنەکان. خلیسکانی مانای وشەکان, یان هانا بردن بۆ ئەسڵی وشەکان. یان گۆڕین و شێواندنی چەمکەکان. واتە کۆمەڵە رێگایەك کە پێویست بوو لەسەرم هەوڵ بدەم لە کتێبی "رۆلان بارت بە قەڵەمی خۆی" دا زاراوەکانیان روون بکەمەوە.

*** ئامانجی ئەو رێگایانە چیە. ئایا ئامانجێکیان هەیە, بێ گوێدانە مومارەسە پوختەکەیان؟**

رۆلان بارت: من بە دوای نوسینێکدا دەگەڕێم ئەویتر ئیفلیج نەکات. لە هەمانکاتیشدا ئەو نوسینە ئاشنا نەبێت. هەموو سەختییەکە لێرەدایە: دەمەوێت بگەمە نوسینێك ئیفلیج نەبێت بێ ئەوەی نوسنێك بێت لە هی تر بچێت.

*** جاران دەتووت تۆ بە دوای "چەند رەمزێك"دا دەگەڕێیت کە لە توێیانەوە واقیع بگریت و ببیت بە خاوەنی.**

رۆلان بارت: پێموانیە باسی رەمزم کردبێت. بە هەرحاڵ, من خاوەنی ئەو رەمزانە نیم, کە غەیری ئەدەب هیچی تر نابن. من بۆ هەر کوێ بچم لەگەڵ خۆمدا دەیانبەم. وەلێ من پێموایە شوێنەوارەکانی وروژاندنی واقیعیی, وەکو هاوڕێیەکم دەڵێت, بێ ئەو رەمزانەش شیاوە. ئەگەر من ئەمەم وت, هی ئەوەیە گرفتەکە گرفتی سیمیۆلۆجیایە: کۆمەڵێك رەمز هەبوون, من خۆشم هەوڵمدا وایان لێبکەم. کاتێك وایان لێهات, ئیتر هیچ شتێکیان نەوروژاند. بۆیە ناچاربووم رووبکەمە بواری تر, بێ ئەوەی خۆمیشیان لێ نەبان بکەم.

*** ئەوانەی خۆشیان ناوێیت باسی کتێبەکانت دەکەن و دەڵێن خورافەو بەخشینی پیرۆزیی بە نوسینیان تێدایە.**





رۆلان بارت: بەخشینی پیرۆزی.. من دژی ئەمە نیم. ماوەیەکی کورت پێش ئێستا لاکان وتی بێباوەڕە راستەقینەکان دەگمەنن. هەمیشە لە شوێنێکدا پیرۆز هەیە.. با وای دابنێین ئەو پیرۆزە لەوەدا هەیە کە من دەینوسم. من پێدادەگرم و دەڵێم: زەحمەتە شتێکمان لا پیرۆز نەبێت. بە نیسبەتی من خۆمەوە, دەڵێم من پیرۆزی دەبەخشم بەوەی دەینوسم.. پیرۆزی دەبەخشم بە چێژ, بە چێژی نوسین..

* حەز لەچی دەکەیت و حەز لە چی ناکەیت..

رۆلان بارت: حەزم لە زەڵاتەو دارچینی و پەنیرو بیبەرو هەویری بادەم و بۆنی هەنجیر و گوڵ و گوڵاڵەسورە و شەمپانیا و هەڵوێستی هێمن لە سیاسەتداو جین گۆڵد و بیرەی زۆر تەزیو و دۆشەکی تەخت و نانی سورکراوەو سیگاری هاڤاناو هاندال و پیاسەی هاوسەنگ و قۆخ و شوفتالو و توو, رەنگەکان و کاتژمێر, قەڵەم و شیرینی و خوێ و رۆمانی واقیعی و پیانۆ و قاوەو بۆلۆك و توامبلی و هەموو مۆزیکی هاوچەرخ و سارتەر و برێخت و فارن و فۆربی و ئاینشتاین و شەمەندەفەر و میدۆکە (شەرابێکی فەرەنسییە), حەز دەکەم پارەم هەبێت و حەزم لە بۆڤارۆبیکیشی (رۆمانێکی فلۆبێرە)ە, حەزدەکەم بە پێڵاوی سووکەوە بە رێگاکانی باشوری خۆراوادا بڕۆم, هەروەها برایانی مارکسیشم[28] خۆشدەوێت.

حەزم لە سەگی لولوی سپی و ژنی پانتۆڵ لەپێ و شلیك و ژەنینی گیتارو خوان میرۆ و خاڵ و وێنەی بزواو و ڤێلا و ئارسەر رۆبینشتاین و کاتی

---

[28] برایانی مارکس Marx Brothers پێنج بران, لە سەدەی بیستەمدا لەشاری نیویۆرك لەدایك بوون . بە نازناوەکانیانەوە ناسرابوون: چیکۆ مارکس (لیۆنارد 1891 –1961), گومۆ مارکس (میلتۆن 1892 –1977), هارپۆ مارکس (ئارسەر 1893 1964), گرونچۆ مارکس (جولیۆس 1895 –1977), زێپۆ مارکس (هێربێرت 1901 –1979).





نیوەڕوان و ساتی و بارتۆك و ڤیڤالدی و عەفەوییەت و وەفاو ئاهەنگی شەوان لەگەڵ خەڵکانی نەناسدا, نیە.

حەزم لێیەو حەزم لیّ نیە: ئەمە لای کەس هیچ گرنگ نیە. ئەمەش, بە رووکەش مانای نیە. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەمە مانای: جەستەی من جەستەی تۆ نیە. بەمجۆرە لەناو ئەم کەفاوە بێسەرەوبەرەیەدا لە زەوق و نا زەوق, بە شێوەیەکی نزیکەیی وێنەی مەتەڵێکی جەستەیی دروست دەبێت کە بانگەشەی دەستێکەڵکردن یان نیشانە دەکات. لێرەدا هەرەشەی جەستە دەستپێدەکات, ئەوەی کە ئەویتر ناچار دەکات کە بەشێوەیەکی "لیبرالییانە" بەرگەم بگرێت, بە بێدەنگی بمێنێتەوە و لەبەردەمی چێژەکاندا یان لەبەردەمی ئەو رەتکردنەوەیەدا کە لەگەڵمدا بەشی دەکات رەفتاری جوان بێت.

**سەرچاوە:**

**کتێبی "المتاهات"**

**وەرگێڕانی "حسونە المصباحی"** 1990

**لاپەڕەکانی** 73 ـــ 86.





**کاتێك جیل دۆلۆز هەردوو کتێبی "جیاوازی و دووبارە بوونەوە" و "لـۆجیکی مانـا" ی بڵاو کردەوە, میشیل فۆکۆی گەورە فەیلەسوفی فەرەنسا وتی: " رۆژێك دێـت ئـەم سـەردەمە دەبێت بە سەردەمێکی دۆلۆزی". دوای حەڤدە ساڵ بەسەر تێپەڕینی ئەو قسـەیەدا, دۆلـۆز سەلماندی کە یەکێکە لە سیما فەلسەفییەکانی سەرانسەری جیهان.**

**دۆلۆز لە بواری فیکری فەلسەفیدا چەندان کتێبی نوسیوە, فەلسەفەکاران سەریان لـە کتێبەکانی سوڕماوە, لێوان لێون لە دیدی نوێ و نامۆ دەربارەی مرۆڤ و بوون و هونـەرو رۆح و جەستە. توانای دۆلۆز لە دەربازکردنی روداودایە کـە لـە چـنگی پـۆزەتیڤیزمی[1] نـوێ و فینۆمینۆلۆجیا[2]و فەلسەفەی مێژوو قوتاری کرد. رووداوی لە کامڵی ژین و لە "مـن" رزگـار کرد. رووداو لە کاتی وێناکردنی بیردا روداو لە دیالەکتیك و نەفی و ناکۆکی رزگاری دەبێت و دەبێت بە یەقین و هێز و هێڵی جیاکـەرەوەو ژیـن. روداو لـە یـەك کاتـدا, بەرجەسـتەو ئامادەو ناوازەشە.**

---

[1] پـۆزەتیڤیزم Positivism سیسـتمێکی فەلسـەفییە لەسـەر زانینـی ئـەزمونیی و رەخنـەیی دەربارەی دیاردەی سروشتی دامەزراوە, لێرەدا میتافیزیاو یەزدانگەریی وەکو دووسیستمی ناتەواوو نادروستی زانین مامەڵـەیان لەگەڵدا دەکرێت. . دامەزرێنـەری ئـەم پێڕەوە ئۆگیست گۆمتە.

[2] فینۆمینۆلۆجیا Phenomenology جوڵانەوەیـەکی فەلسـەفییە لـە سـەدەی بیسـتەمدا, کـە بایـەخی داوە بەوەسـفکردنی, ئەزمونـەکان وەك چـۆن خۆیـان لـە هۆشمانـدا دەخەنـە روو, بـەبێ پەنابردنـە بـەر تیۆرییـەك یـان بـەرەنجامێك یـاخود هەڵگرتنـەوەی هـیچ دیسـپلینێك, وەك ئەوانـەی لەزانستە سروشتییەکاندا هەیە.





**جیل دۆلۆز لە کانونی دووەمی ساڵی 1925 دا, لە پاریس هاتۆتە دونیاوە, لە نێوان ساڵانی 1944 – 1948 لە زانکۆی سۆربۆن[3] فەلسەفەی خوێندووە. لەوێ فرانسوا شاتلێ و میشیل تۆرینی ناسیوە, پاشان لە قوتابخانە ئامادەییەکاندا وانەی فەلسەفە دەڵێتەوە. لە ساڵی 1958 دا, کورسی ئوستادی یاریدەدەر وەردەگرێت. لە ساڵی 1960 بە دواوە دەبێت بە پسپۆڕ لە سێنتەری لێکۆڵینەوەو تۆژینەوە. لە ساڵی 1962 دا مشیل فۆکۆ دەناسێت, پاشان لە ساڵی 1969 دا, تێزەکەی خۆی "جیاوازی و دووبارەبوونەوە" بڵاو دەکاتەوەو فیلیکس گاتاری دەناسێت و دواتر پێکەوە بە دووقۆڵی چەند کارێکی فەلسەفی دەکەن.**

**لێرەدا, دەقی گفتوگۆکەی دۆلۆز لەگەڵ گۆڤاری NAGAZINE LITTERAIRE دا , ژمارەی ئەیلولی ساڵی 1988, بڵاو دەکەینەوە, کە بە بۆنەی دەرچوونی کتێبە نوێیەکەیەوە: لۆچ, یان لایینیتز و بارۆکیزمەوە سازدراوە.**

*** لەم دواییانەدا کتێبێکت لەسەر لایینیتز[4] نوسی. لە ساڵی 1953شدا, کتێبێکت لەسەر هیوّم داناوە. ئەگەر دوای مێژووی کتێبەکانت بکەوین, دەتوانین لە سێ قۆناغدا ببینین: قۆناغی یەکەمت تەرخانە بۆ فەلسەفەو مێژوو, لوتکەی ئەم قۆناغە کتێبەکەتە لەسەر نیچە , لە ساڵی**

---

[3] سۆربۆن, Sorbonne ناوی یەکێك لەبیناکانی زانکۆی پاریسە, بەشێوەیەکی میللی بەکارهێنراوە بۆئەوەی گوزارشت لە تەواوی زانکۆکە بکات. ناوەکە لەناوی کۆلێجێکی ئاینییەوە خواستراوە کە لە دەوروبەری ساڵی 1257دا, لەلایەنی رۆبەرت سۆربۆنەوە, دامەزرێنراوە.

[4] لایبنز, گۆتفرید ویلهێلم Leibniz, Gottfried Wilhelm (1646 –1716) مەزنترین فەیلەسوفی ئەڵمانییە لەپێش سەردەمی کانتدا, هەروەها زانای ماتماتیك و کیمیاگەرو دیپلۆمات و مێژوونوس و ئەندازیاریشە. لەتەمەنی حەڤدە ساڵییدا نامەیەکی پێشکەش کرد بەناونیشانی " نامەیەك دەربارەی پرەنسیپی بەرجەستە بوون" و بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە هونەردا وەرگرت. هەروەها لەماوەی نێوان ساڵانی (1661 ـ 1666) دا یاسای خوێندووە, بەڵام دواتر خووی داوەتە ماتماتیك و میتافیزیك. نوسراوەکانی زۆرن, پیاوێکی ئینسایکلۆپیدیایی زۆر چالاك بووە. دیارترین و دواکتێبی بریتیە لەمۆنادۆلۆجیا . 1710, کە تێیدا لە مەسەلەی عەدالەتی یەزدانیی دەکۆڵێتەوەو هەموو شتێك دەباتەوە بۆسەر زانین و ئارەزوو.





**1962 دا, پاشــان جیــاوازی و دووبــارە بوونــەوە ــــــ 1969, ئینجــا ســەرمایەداری و شیزۆفرینیا[5] 1972 – 1980, ئەمیانت لەگەڵ فیلیکس گاتاریدا نوسیوە. ئیتر فەلسەفەیەکی تایبەتیت دامەزراند, ئەمڕۆ دوای ئەوەی لە ڕێگای (بایکۆن) ەوە لەسەر هونـەری شـیوەکاریت نوسی. لەسەر سینەماشت نوسی. وا دیارە ئارەزوو دەکەیت بە یەکێك لە لایەنەکانی فەلسـەی کلاسیکەوە پێوەست بیت دەکرێ خۆت لەو ڕەوتـەدا ببینیتـەوە؟ ئایـا کارەکانـت یەکێتیـەکی تەواون یان گۆڕان و پچڕانیان تیا دەبینی ؟**

جیـل دولـۆز: سـێ قۆنـاغ! راسـتە . سـەرەتا بـە کتێبـی مێـژوو و لـە فەلسەفەشـدا دەسـتم پێکـرد . بـەڵام خـاڵی هاوبـەش لـە نێوانی ئـەو فەیلەسـوفانەدا هـەبوو کـە بایـەخم پێـداون .. ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو یەکێتیـەی سـپنۆزا[6] و نیچـە بـە یەکەوە کۆدەکاتەوە . مێژووی فەلسەفە بە شێوەیەکی تایبەتی رژێمێکی تێرامان نییـە . راسـتتر مێـژووی فەلسـەفە وەکو پۆرتریێت وایـە لـە هونـەری شێوەکارییدا . مێـژووی فەلسـەفە کێشـانی پـۆرتریێتی زەینـە . هـەروەك لـە شێوەکاریشـدا وایـە ، دەبـێ بـە کەرەسـتەی جیـا شـتی هاوشـێوە و لێکچـوو بێتـە بەرهـەم ، دەشـبێت لێکچوونەکە بە جۆرێکی وا ئەنجام بدرێت کە کەرەستەکان شتی نـوێ نـەبن (نـابێ لە فەلسەفەدا بە قسەیەکەوە بوەستین کە پێشتر کراوە). فەیلەسوفەکان بۆچـوونی نوێ دەهێنن و دەیخەنە روو. بەڵام ئەوانە هەموو شتێك ناڵێن . بـەڵکو بەشـێك لـەو

---

[5] شــیزۆفرینیا Schizophrenia نــاوی دەســتەجەمیی کۆمــەڵێك نەخۆشــیی عەقڵییــە, کــە چــەندان نیشـانەی جیاجیایـان هەیـە, لەوانـە نـەمانی پەیوەنـدی بـە واقیعـەوە, رەفتـاری سـەیرو سـەمەرە, پەرت و بڵاویی بیرکردنەوەو ئاخاوتنی پچڕ پچڕ. نەتوانینی گوزارشتکردن لە هەست و سۆزەکان بەشێوەی ئاسایی, کشانەوە لە بوارە کۆمەڵایەتییەکان. بەشێوەیەکی ئاسایی تەنها هەندێك لەو بیشانانە لە یەك کەسدا دەردەکەون. زاراوەی شیزۆفرینیا لە وشە یۆنانییەکەوە هاتووە کە مانای پەرت و بڵاویی بیرکردنەوە دەگەیەنێت.

[6] سپینۆزا باروخ, یان بینديکێت Spinoza, Baruch or Spinoza, Benedict (1632-1677), فەیلەسوفێکی نەمسایی سەر بەپێڕەوی عەقڵییە, بیریارێکی ئاینییشە, خۆی زۆر بـەوەوە خـەریك کـردووە کـە پرەنسـیپەکانی یـەکێتی بـوون بدۆزێتـەوە. دیـارترین کتێبـی بریتیـە لـە نانـەی یەزدانگەرایی ـ سیاسیی , کە لەکاتی خۆیدا کەنیسە هێرشێکی زۆری کردە سەری.





گرفتانە یان مەسەلانە باس دەکەن کە بۆ چوونەکانیان وەڵامیان پیێ دەدەنەوە ، بۆ نموونە هیوم[7] بۆچونێکی نویێ لەسەر باوەڕ دەخاتە روو . بەڵام ناڵێت بۆچی یان چۆن گرفتی زانین بە شێوەیەکی وەها دەخرێتە روو ــ کە لە دوتوێی باوەڕدا دیاری بکرێت ــ ئەوە ئەرکی مێژووی فەلسەفە نیە کە جارێکی تر شتی وتراو دابرێژێتەوە . بەڵکو دەبیێ شتە شاراوەکان بڵێت, واتە ئەوانەی نەیوتوون بەڵام لەناو قسەکانیدا ئامادەییان هەبووە .

ئەرکی فەلسەفە هەمیشە دۆزینەوەی بۆچوون و مانای رووتە، هی تازە ــ من هەرگیز لە تێپەراندنی میتافیزیك یان مەرگی فەلسەفە هەستم بە دڵەڕاوکە نەکردووە ، فەلسەفە هەردەم وەزیفەیەکی کاراو ئامادەی هەیە کە ئەویش رەنێوهێنانی بۆچوون ومانای پەتییە ، فەلسەفە نەبێت هیچی تر ئەمەی پێناکرێت بە درێژایی مێژوو، دژ و بەرەنگاری هەر هەبووە هەر لە رەقیبەکانی ئەفلاتونەوە[8] تا دەگاتە لێبووکەکەی زەردەشت.

---

[7] هیوم , دەیڤید ,Hume, David (1711-1776), Hume, David (1711-1776) مێژوونوس و فەیلەسوفێکی سکۆتلەندییە, کاریگەریی هەبووە لەسەر پەرەسەندنی هەردوو پێڕەوی گومانگەرایی و ئەزمونگەرایی. هیوم نەچۆتە قوتابخانەوە لەماڵەوە خوێندوویەتی و لە تەمەنی دوازدەساڵیدا چۆتە زانکۆی ئێدینبۆرگ, هەروەها تەندروستییشی باش نەبووە. دیارترین نوسراوی بریتیە لە نامەیەك دەربارەی سروشتی مرۆڤ, A Treatise of Human Nature لە سێ بەرگدا لە ماوەی نێوان ساڵانی 1739 . 1740دا نوسیویەتی . پاشان لە ساڵی 1741 . 1742دا دووبەرگی ئاکاری سیاسیی بڵاوکردەوە.

[8] ئەفلاتون Plato (circa 428–c. 347 bc) فەیلەسوفێکی یۆنانییە, یەکێکە لە کاریگەرترین و ئەفرێنەرترین بیریارەکانی فەلسەفەی خۆراوا. ئەفلاتون لە خێزانێکی ئەریستۆکراسی ئەسینایدا لە دایك بووە, دەڵێن ئەریستۆنی باوکی نەوەی دواین پادشای ئەسینایە, دایکیشی خزمی سۆلۆنی یاساناس بووە. منداڵ بووە کە باوکی مردووەو دایکی شووی کردۆتەوە بە پیلامپس کە هاوکاری پێرکلیسی سیاسەتمەدار و پیاوی دەوڵەت بووە. لە لاویدا حەزی لە سیاسەت بووە, بەڵام سیاسەتمەدارانی ئەسینا تووشی بێئومێدییان کردووەو رای گۆڕیوە. سەرەنجام دەبێت بە قوتابی سۆکرات و پاشان گەورەترین تۆمارکەرو لێکدەرەوەو گەشەپێدەری فەلسەفەی





دەتوانین بڵێین ئیمڕۆ زانیاریگەرایی و هۆیەکانی پەیوەندی و شتی تری لەوانەی وایان لێ هاتووە ببنە خاوەنی وشەکانی (بۆچوون) و خوڵقاندن. رەگەزێکی پۆخڵی وا هاتۆتە پێش کە گوزارشت لە کردەی فرۆشتن دەکات وەك بڵێین لوتکەی فیکری سەرمایەداریی و کۆجیتۆی باڵایە. فەلسەفە لە بەرامبەری ئەم هێزانەدا هەست بە بچووکی و تەنهایی خۆی دەکات, بەڵام ئەگەر بمرێت, ئەوا هەر هیچ نەبێت لە پێکەنیندا دەمرێت.

---

مامۆستاکەی. فەلسەفەی سۆکرات شێوازێکی دیالەکتیکی هەیە, ئارگیومێنت و دەمەتەقێ و پرسیار و وەڵامە. هەتا ساڵی 399 کە تێیدا سۆکرات دەرمانخوارد دەکرێت, لەگەڵ مامۆستاکەیدا دەمێنێتەوە, پاشان روو دەکاتە ئیتاڵیا و سیسیلی و ئینجا میسر. دوای گەشت و گەڕانێکی زۆر لە ساڵی 387 ی پێش زایینیدا لە ئەسینا ئەکادیمیاکەی دادەمەزرێنێت, کە بە یەکەمین زانکۆی مێژووی ئەوروپا لە قەڵەم دەدرێت. ئەکادیمیا پێڕەوی خوێندنی تایبەتی خۆی هەبوو, بابەتگەلێکی وەکو ئەناتۆمی, بایۆلۆجی, ماتماتیك, تیۆری سیاسی, فەلسەفەی تێدا دەوترایەوە. دیارترین قوتابی ئەکادیمیا ئەرەستۆیە کە دواتر قوتابخانەی سەربەخۆی خۆی دادەمەزرێنێت. نوسینەکانی ئەفلاتون هەموویان لە شێوەی دیالۆگدان, لەو دیالۆگانەدا ئایدیاو چەمکە فەلسەفییەکان دەخرێنە بەر لێپرسینەوەو تاقیکردنەوەو رەخنەیان لێدەگیرێت. سەرجەمی کارەکانی ئەفلاتون 35 دیالۆگ و 13 نامەن, کە گومان لە خاوەندارێتی هەندێکیان دەکرێت. دیالۆگەکانی ئەفلاتون دەکرێن بە سێ کۆمەڵەوە: سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی, بەشی کۆتاییان زیاتر شێوەی پەخشانی وەرگرتووە. لە دیالۆگەکانی سەرەتایدا پێڕەویی لە شێوازە دیالەکتیکییەکەی سۆکرات دەکات, لە زۆرینەیاندا سۆکرات پرسیار لە کەسێك دەکات کە خۆی بە دانا دادەنێت, لەچیدا شارەزایت و پاشان لە رێگەی پرسیار و وەڵامەوە دەری دەخات کە دانا نیە. هەندێك لەم دیالۆگانە بریتین لە: خارمیدس: میانڕۆیی, لیسیس: هاورێیەتی, لاخیس: ئازایەتی, پرۆتاگۆراس: فێرکردنی فەزیلەت, یوتیفرۆن: سروشتی ئاینداریی, هەروەها کتێبی یەکەمی کۆمار: دادپەروەریی. پاشان دیالۆگەکانی ناوەڕاست هی ئەو ماوەیەن کە لە رووی فەلسەفییەوە گەشە دەکات و تێروانینی فەلسەفییانەی خۆی دەبێت, بەڵام هێشتا هەر سۆکرات کاراکتەری سەرەکیی دیالۆگەکانە, لەوانە: گۆرگیاس: رەوانبێژیی, ئەپۆلۆجی: داکۆکیەکەی سۆکرات لەبەردەمی دادگادا, مینۆن: زانین, کریتۆن: هەڵنەهاتنی سۆکرات, فایدۆن: رۆح, سیمپۆزیەم: خۆشەویستی.





فەلسەفە گەیەنەر نیە, تێرامێن و پاساودەریش نیە, فەلسەفە ئەفرێنەرەو بە سروشتی خۆی شۆڕشگێڕە. لە رەنێوهێنانی بۆچوون و مانای پەتی پەکی ناکەوێت. تاکە مەرجیش ئەوەیە ئەو بۆچوون و مانایانە پێویست و سەمەرە بن, لەبەرئەوەی وەڵامی گرفتە راستەقینەکان دەدەنەوە, ئەوا مەرجەکەیان تێدایە. بۆچوون وا دەکات بیرۆکە بریتی نەبێت لە رایەکی رووت و دەمەتەقێیەکی رووت و زۆربڵێییەکی رووت, هەموو بۆچوونێك و مانایەکی پەتی, بە زەرورەت (ناکۆکی)شن.

من و فیلیکس گاتاری, لە ئەنتی ئۆدیپۆس و چەند نوسینێکی تردا هەوڵمانداوە فەلسەفەیەك دابمەزرێنین, پێکەوە هەندێك کتێب و وتارمان نوسی. هەر یەکێك لە ئێمە خاوەنی رابردوو و نوسینی پێشووتری خۆیەتی, ئەو لە سایکۆلۆجیاو سیاسەت و فەلسەفەدا کارامەبوو, لە بۆچووندا دەوڵەمەندبوو, منیش پێش ئەوەی لەگەڵیدا کاربکەم, دوو کتێبم هەبوو: (جیاوازی و دووبارەبوونەوە), (لۆجیکی مانا). ئێمە وەکو جووتێك پێکەوە کارمان نەکردووە, بەڵکو راستییەکەی ئێمە دوو زێ بووین و یەکمان گرت بۆ دروستکردنی رووبارێك, ئەویش روباری ئێمە بوو.

پاشان با وا دابنێین کە ئەمە قۆناغی سێیەمە. قۆناغێك تێیدا بایەخم دا بە هونەری شێوەکاری و سینەماو وێنە. بە رای خۆم کتێبەکانم لەو بوارەدا فەلسەفی بوون, چونکە لە تێڕوانینی مندا مانای پەتی دوو رەهەندە هەیە, رەهەندی هەستپێك و رەهەندی کارتێك, من ئەمەیانم بەلاوە گرنگە نەك وێنەکان. ئەو شتانەی بە هەست درکیان پێدەکەین خۆیان درکی هەستی نین, هەستپێك کۆمەڵێك هەست و پەیوەندییە کە دوای ئەوەی یەکێك هەستیان پێدەکات و مومارەسەیان دەکات, پەیدا دەبێت. کارتێکەکانیش هەست و سۆز نین, بەڵکو دروسان (صیرورات) و رودرانن (حدوثات), کاتێك بەناو شتێکدا دەڕۆن و دەرژێن و دەبن بە هی تر. رۆماننوسانی ئینگلیز بە زۆریی بە هەستپێك دەنوسن, بەڵام





**کلایست[9] و فرانز کافکا[10] بە پێی کارتێك و هەستپێك و مانای پەتی دەنوسن, ئەمانە سێ هێزی لێکجیانەکراوەن, لە هونەرەوە روودەکەنە فەلسەفەو بە پێچەوانەشەوە.**

**ئایا دەتوانین ئێستا دەربارەی پەیوەندیی ژیانی خۆت بە کارەکانتەوە بکەین؟**

**جیل دۆلۆز: هەموو کاتێك ژیانی مامۆستا سەرنجڕاکێش نیە. راستە بڕێك گەشتوگوزارم هەیە, وەڵێ کرێی گەشتەکانی مامۆستا بە وشەو ئەزمون و وانەو**

---

[9] **کلایست, (بێرند) هینریخ ولیەم ڤۆن** Kleist, (Bernd) Heinrich Wilhelm von (1777-1811) **درامانوسێکی ئەڵمانییە, کە پسپۆڕ بووە لە وێناندنی نیگەرانیی مرۆییدا بە هۆی پێداویستییە دژ بەیەکەکانییەوە, شێوازی نوسینەکەی وای کردووە بە یەکێك لە دیارترین درامانوسەکانی ئەڵمان بناسرێت, گەرچی ماوەیەکی کەمیش ژیاوە. لە فرانکفۆرت لە خێزانێکی سەربازییدا لەدایك بووە. دوای حەوت ساڵ خزمەتکردن لە سوپای پروسیادا, ماوەی نێوان ساڵانی** 1799 – 1710 **ی لە خوێندنی یاساو فەلسەفەدا سەرف کردووە, هەروەها فەرمانبەرێکی بچوکیش بووە لە بەرلین و کۆنیگسبۆرگ, هەروەها بەناو ئەوروپاشدا سەفەری کردووەو نوسیویشێتی. گرنگترین شانۆنامەکانی بریتین لە: وێنەی شکاو** – 1806, **میری هامبۆرگ** –1811, **هەندێك شیعرۆ نۆڤلێتیشی نوسیوە, دوای ئەوەی فەرەنسییەکان ئەڵمانیایان داگیرکرد, لە نزیکی بەرلیندا خۆی و خۆشەویستەکەی دەکوژێت.**

[10] **کافکا, فرانز** Kafka, Franz (1883-1924)**, رۆماننوس و چیرۆکنوسێکی چیکییە, بە ئەسڵ جولەکەیە, بەئەڵمانی نوسیویەتی. ئەندامی کۆمەڵەیەی ئەو جولەکانەی بەئەڵمانی دەدوێن , لە پراگ , بووە. ماوەی چواردە ساڵ لەئۆفیسێکی حکومییدا فەرمانبەر بووەو, ئەوەش لەهەموو کارەکانیدا رەنگی داوەتەوە. نوسینەکانی هەموویان ئەندێشەی ئاماژەیین و زۆر زوو ئەندێشەی ئەو سەرکوتکردن و نائومێدبوونەی کردووە کە سەدەی بیست لەگەڵ خۆیدا دەیانهێنێت. کافکا یەکێکە لەنوسەر هەر ناودارەکانی جیهان.. زاراوەی کافکاوییەت بەکارهاتووە بۆ گوزارشت کردن لەو نیگەرانییی و دڵە راوکەیەی لەمرۆڤی مۆدێرندا بەدیی دەکرێت, بەو شێوەیەی لە ئەدەبدا تەوزیف دەکرێت. کافکا لەخێزانێکی مامناوەند لەدایکبووە, هەرگیز ژنی نەهێناوە, گەرچی دووجاریش هاوسەری نیشانە کردووە. نێوانی لەگەڵ باوکیدا خۆش نەبووە. یاسای خوێندووەو لەخزمەتی مەدەنیدا دامەزراوە. لە شێتخانەی کیرلین کۆچی دوایی دەکات. دیارترین کاری: میتامۆرفۆس ( مەسخ) ـ** 1915, **لەبەردەمی دادگادا ـ** 1919, **دادگا ـ** 1925, **قەڵا ـ** 1926, **ئەمریکا ـ** 1928.





کۆڕ دەژمێردرێت. ئەو قسە دەکات, هەردەم قسە دەکات, رۆشنبیران خاوەنی رۆشنبیرییەکی بێئەندازەن. من رۆشنبیر نیم, چونکە رۆشنبیرییەکی ئامادەم نیەو زەخیرەشم نەخستووە. ئەوەی ئێستا دەیزانم, پێداویستییەکانی کارێکە کە بە نیازم ئەنجامی بدەم. گەر دوای چەند ساڵێك بێمەوە بۆ سەر ئەم کارە, دەبێت سەرلەنوێ هەموو شتێك فێر ببمەوە. شتێکی زۆر جوانە مرۆڤ لە شتێکدا بێ ڕاو بێ فیکر بێت. ئێمە هۆی پەیوەندییمان کەم نیە, بگرە بە پێچەوانەوە بە دەستی ئەو هەموو هێزانەوە دەناڵێنین کە ناچارمان دەکەن بدوێین, لە کاتێکدا قسەی زۆرمان نیە بیکەین. من زۆر حەزم لە سەفەرکردن نیە, وەلێ پێویستە بجوڵێین بۆ ئەوەی دروسان و رودرانەکان بێزار نەکەین. رستەیەکی تۆینبی[11] سەرنجی راکێشاوم "کۆچەران ئەوانەن کە ناجوڵێن, ئەوانەی بزاوتن رەت دەکەنەوە, دەبن بە کۆچەری".

کتێبی یەکەمم زوو نوسی. پاشان بۆ ماوەی هەشت ساڵ بێدەنگ بووم. ئەو ماوەیە بە چاکی دەمزانی چی دەکەم و لە کوێ دەژیم. بەڵام بە شێوەیەکی تۆزێك تەژم دەمزانی. وەك ئەوەی کەسێك بێت و هەندێك بیرەوەرییم بۆ بگێڕێتەوە کە خۆم بڕوایان پێدەکەم, بەڵام لە راستیدا بیرەوەریی خۆم نین. ئەو هەشت ساڵە وەکو چاڵێك وایە لە ژیانمدا. لە ژیانی خەڵکدا, ئەمە جێگای بایەخدانە: چاڵێك لە ناو ژینیاندا. هەندێجار هەڵەی کارەساتاویەو هەندێجاریش بە هیچ جۆرێك کارەساتاویی نیە. ژیانی زۆربەی خەڵك, لە ناو حاڵەتی بێداریدا, ماوەی چەند ساڵێك راوەستان و خەوتنی تێدەکەوێت. رەنگە لەناو ئەو چاڵانەدا, جووڵان رووبدات. چونکە پرسیارەکە ئەوەیە چۆن دەکەوینە جووڵە, چۆن دیوارەکە کون دەکەین, کەچی رادەوەستین و چیتر سەرمانی پێدا ناکێشین. رەنگە, ئەوکاتەی زۆر ناجوڵێینەوە, زۆر ناڵێین, خۆمان لە جوڵەی هەڵە بپارێزین, لەوێدا بمێنینەوە

---

[11] تۆینبی , ئارنۆڵد جۆزێف Toynbee, Arnold Joseph (1889-1975) مێژوونووسێکی ئینگلیزییە, زیاتر بایەخی داوە بەمیراتیی بەجێماوی رابردووی شارستانێتییەکان, لەوەی بایەخ بدات بەکاروبارە سیاسییەکانیان.





کە بە هیچ جۆرێك یادەوەریی لێ نیە. سکۆت فیتزگیراڵد[12] چیرۆکێکی جوانی هەیە: پیاوێك لەناو شاردا دەگەڕێت و بۆشاییەك لە ئەندێشەیدا هەیە کە ماوەکەی دە ساڵە.

*** بەڵام ئەی فەیلەسوف چۆن چۆنی بیری خۆی دەگەیەنێتە جەماوەر؟ بە چ ڕێگایەك؟ فەیلەسوفەکان هەر لە ئەفلاتونەوە کتێب دەنوسن و لە توێی کتێبەوە گوزارشت لە بیرەکانی خۆیان دەکەن. تا ئێستاش ئەمە هەر نەگۆڕاوە. لەگەڵ ئەوەشدا دوو جۆر لەوانە دەبینین کە پێیان دەوترێت فەیلەسوف, یاخود خۆیان ناودەنێن فەیلەسوف: ئەوانەی وانە دەڵێنەوەو بەردەوامیشن لەسەر وانە وتنەوەو لە زانکۆ کورسییان بەدەستهێناوە, پێشیان وایە ئەوە شتێکی گرنگە. هەروەها ئەوانەی وانە ناڵێنەوەو نایانەوێت ئەوە بکەن, بەلام هەوڵ دەدەن پلەو نێوەندەکانی میدیا داگیر بکەن. مەبەستم لەوانەیە کە ئێستا لە فەرەنسا پێیان دەڵێن "فەیلەسوفە نوێیەکان". پێموایە تۆ لە چەشنی یەکەمیت تەنانەت جارێکیات بەیانێکیشت دژی فەیلەسوفە نوێیەکان دەرکرد. وانەوتنەوە لای تۆ چی دەگەیەنێت؟**

جیل دۆلۆز: وانەوتنەوە بەشێك بووە لە ژیانم, چێژی زۆرم لێبینیوە. وانەکانی من لەوانە نیە کە کاتێکی زۆریان بوێت, بە جەماوەرێکیش بوترێتەوە کە بە درێژایی ساڵان نەگۆڕێت. وانەی من لە تاقیگەی لێتۆژینەوە دەچێت, واتە من دەربارەی ئەو شتە وانە دەڵێمەوە کە خۆم لێی دەکۆڵمەوە, نەك ئەوەی دەیزانم. دەبێت ماوەیەکی دوورو درێژ خۆمان ساز و ئامادە بکەین بۆ ئەوەی چەند خولەکێك لە هێزی ئەفرێنەرامان دەسگیر ببێت. من کامەران بووم بە راوەستانەکەم, چونکە بۆم دەرکەوت پێویستە بیر و شتی زۆرتر ئامادە بکەم بۆ ئەوەی بە ڕێگایەکی زۆر

---

[12] فیتزگیراڵد, ف(رانسیس) سکۆت (کەی) Fitzgerald, F(rancis) Scott (Key) (1896-1940) نوسەرێکی ئەمریکییە, رۆمان و کورتە چیرۆکەکانی باسی گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان دەکەن لەماوەی بیستەکانی سەدەی رابردوودا, ئەو سەردەمەی نوسەر خۆی بە سەردەمی جاز ناوی دەبات. زیاتر بەهۆی رۆمانی گاستبی مەزن –1925 و شەو راشکاوە 1934ەوە ناسراوە, کە هەردوکیان باس لە خەونی ئەمریکییەکان دەکات بۆ ژیانی باشتر و سامان و سەرکەوتن لە توێی کاری سەخت و تێکۆشانەوە.





قورسترو ئازاراویتر, هێزێکی ئەفرێنەرانەم دەست بکەوێت. ئەو کاتە راوەستام و بە راوەستانەکەشم دڵخۆش بووم.

وانە لە مۆزیکەوە نزیکترە هەتا شانۆ. هیچ شتێك رێگە لەوە ناگرێت کە وانە تا رادەیەك لە ئاهەنگێکی (رۆك) بچێت. ئێمە لە فەلسەفەدا, کایەی چینایەتیبوونی فەلسەفەمان رەتکردبۆوە. بۆیە دەشیا هەمان وانە بە خوێندکارانی پۆلی یەکەم و چوارەمیش بوترایەتەوە. بە خوێندکارو غەیرە خوێندکار, فەیلەسوف و نا فەیلەسوف, پیر و لاو, گەل و نەتەوەی جیاواز. بەردەوام نیگارکێش و مۆزیکژەن و بیناساز لە وانەکانی مندا ئامادە بوون, تامەزرۆییەکی فیکریی زۆریشیان پێوە دیار بووە. وانەکانی من چەندان کاژێری درێژیان دەخایاند, کەس نیە گوێ لە هەموو شتێك بگرێت, بەڵکو هەریەکە بایەخ بەوە دەدات کە پێویستی پێیەتی, گەرچی لە کارەکەشیەوە دوور بێت.. هەرگیز ئەوەی هاتۆتە بەرچاوم, یان شتی پێبەخشیوم, بە جەماوەرم نەوتووە. بە بڕوای من فەیلەسوف پێویستی بەوە نیە لە توێی بۆچوون و مانا پەتییەکانەوە تێگەیشتنی فەلسەفیی بەدەست بهێنێت و هیچی تر, بەڵکو پێویستی بەوەشە لە کارتێك و هەستپێکەکانیشەوە بەدەستی بهێنێت, واتە هەردوو رێچکەکە پێویستن.

فەلسەفە بریتیە لە پەیوەندییەکی بنەڕەتی و ئەرێیانە لەگەڵ ئەوانەدا کە فەیلەسوف نین. با سەمەرەترین نمونە بهێنمەوە: سپینۆزا, فەیلەسوفی رەها, کتێبەکەشی (زانستی ئاکار) گەورەترین کتێبی ئەوەو زۆرترین بۆچوون و مانای پەتی گرتۆتە خۆی. لە هەمانکاتیشدا ئێمە دەزانین کە رەسەنترین فەیلەسوف ئەوەیانە, رووی دەمی دەکاتە هەموو خەڵك, هەر کەسێك بە پێی پێویست خۆی بداتە دەستی ئەم بایەو ئەم ئاگرە, دەتوانێت زانستی ئاکار بخوێنێتەوە. هەمان شتیش بۆ نیچە. بە پێچەوانەشەوە, زێدەڕۆییەکی ئەوتۆ لە زانیندا هەیە, کە هەموو شتێکی زیندووی ناو فەلسەفە دەکوژێت. تێگەیشتنی نافەلسەفییانە, شتێکی ناتەواو و سەرپێیی نیە, بەڵکو یەکێکە لە دوو نیوە, یەکێکە لەوانەی یاریدەمان دەدەن.

*** لە پێشەکی کتێبی (جیاوازی و دووبارەبوونەوەدا) دا وتت, ئێمە خەریکین لە سەردەمێك نزیك دەبینەوە, کە ئیتر ناتوانین کتێبی فەلسەفی بەو شێوازە بنوسین کە کتێبە فەلسەفەییەکانی دیکەی پێ نوسراوە. پێویستە "هۆکارە گوزارشتییەکان" ئەوەی نیچە دەستی پێکرد, بکەین بە بناغەی پەرەپێدانی چەند هونەرێکی تری وەکو شانۆ و سینەما. ئینجا بۆرخیس وەك نمونەیەکی پێوانەیی بۆ خەملاندنی مێژوییانەی فەلسەفە دەهێنیتەوە. ئێستا, مەسەلەی شێوازی فەلسەفییانە و هونەری بیناسازیی و ئامادەکردنی کتێبێکی فەلسەفە چۆن دەبینیت؟ کارکردن لەگەڵ خەڵکیدا بە لای تۆوە مانای چیە؟ وەك چۆن لەگەڵ فیلیکس گاتاریدا کاردەکەیت؟ دانەری راستەقینەی ئەو کتێبەی کە خەریکن دەینوسن, کێیە؟**

جیل دۆلۆز: فەیلەسوفە گەورەکان زمانزانی گەورەشن, لە فەلسەفەدا, شێواز بریتیە لە جولآنەوەی بۆچوون و مانای پەتی. بێگومان لەدەرەوەی رستەدا, شتی وەها نیە. وەلێ تاکە ئامانجی رستە ئەوەیە ژیانی پێببەخشێت, ژیانێکی سەربەخۆ. شێواز یانی خولقاندنی حاڵەتێك لە گۆڕین و جێگۆڕکێی هارمۆنییانە لە زماندا, بارگاویکردنی زمانە بە شلۆقییەك کە ئاڕاستەی دەرەوە بگرێتە بەر. کاری ناو فەلسەفە هەر ئەوەیە کە لە رۆماندا پەی پێدەبەین. پێویستە بپرسین: (چی روودەدات؟) و (چی روویدا؟), کەسێتییەکان تەنها بۆچوون و مانای پەتین, بەلآم دیمەن و شوێنەکان بریتین لە فەزاکان و کاتەکان. بەلآم دیمەنەکان و جێگاکان ئاسمان و زەمانن, ئێمە هەمیشە دەنوسین هەتا ژیان ببەخشین, لەوێ کە بەندکراوە, هەتا هێڵەکانی هەلآتن بکێشین. بۆیە پێویستە زمان سیستمێکی لە قاڵبدراو نەبێت, بەڵکو پێویستە بە درێژایی کات بریتی بێت لە نەمانی هاوسەنگی و لەیەك دوورکەوتنەوەو ناسازو نەگونجاو بێت, شێوازیش لە ناویدا ناتەباییەکانی هێزە شاراوەکان هەڵبکۆڵێت, بتوانێت گوزارشت لە شتێك بکات, شتێك رووبدات, بروسکەیەك لە ناو خودی زمانەوە هەڵبقولێتە دەرەوەو وامان لێبکات ئەو وشانە ببینین کە لە سێبەردا ماونەتەوە, بیریشیان لێبکەینەوە, واتە بیر لەو بوونەوەرانە بکەینەوە کە هێندەی نەماوە گومانیان لێبکەین و لە بوونیان دڕدۆنگ بین. دوو شت لەگەڵ شێوازدا ناتەبان: زمانێکی کوك و ساز, یاخود





ناسازیی بکاتە رادەیەك کە بگاتە ئاستی بێموبالاتی و گوێ پێنەدان و خۆڕایی بوون, بە جۆرێکی وەها کە هیچ شتێك دیارنەمێنێت کە بە نێوانی دوو شەپۆلەکەدا تێبپەڕێت. پێویستە لە نێوانی دەستەواژەیەکی سەرەکی و یەکێکی پاشکۆدا جۆرە مۆلەقییەك هەبێت, جۆرێك لە زیکزاکی , بە تایبەتی ئەگەر رستە خۆی رێك و راست بوو. ئەگەر وشەکان بریسکەیان کردو بریسکەکە لەوشەیەکەوە گەیشتە وشەیەکی تر ئەگەرچی دووریش بن, ئەوکاتە شێوازێك هەیە. لێرەوە نوسین لەگەڵ ئەویتردا گرفت نیە, بگرە بە پێچەوانەوە, ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندیی بە چەند کەسێکەوە هەبێت و هەریەکەیان ژیانی تایبەتی خۆی و راو بۆچوونی تایبەتی خۆی هەبێت و پێشنیاری ئەوە بکات کە لەگەڵ ئەویتردا مامەڵە بکات و گفتوگۆ بکات. کاتێك وتم من و فیلیکس گاتاری وەکو دوو زێ وەهابووین, ئەوا مەبەستم ئەوەیە بەکەسێتی بوون بە زەرورەت شتێکی کەسیی نیە. ئێمە بە تەوایی لەوە دڵنیا نین کە کەسین: رێڕەوێکی هەوایی, رەشەبا, کاژێرێك لە رۆژ, زێ, جێگە, جەنگ, نەخۆشی, هەموو ئەمە تاکایەتی ناکەسیی خۆی هەیە. هەریەکێك لە ئێمە ناوی تایبەتی خۆی هەیە. هەردوکیان وەکو دوو زێ و دوو کانی. ئەوانە لە توێی زمانەوە گوزارشت دەکەن, تێیدا جیاوازیەکان هەڵدەکۆڵن. وەلێ زمان ژیانێکی تایبەتی و کەسییان پێدەبەخشێت, شتێك لە نێوانیاندا رایەڵ دەکات. بۆیە لەم رووەوە نوسین لەگەڵ ئەویتردا شتێکی ئاساییە. هێندە بەسە شتێك تێبپەڕێت, رێڕەوێك, ناوێکی تایبەتی خۆی هەبێت. تەنانەت کاتێك مرۆڤ بە تەنهاش دەنوسێت, ئەوا مەسەلەکە وەك ئەوە وایە لەگەڵ ئەویترێکدا بنوسێت, کە هەموو جارێك ناوی نەنراوە.

***ئەدەب قۆرتێکە لە کارەکانتا, بگرە خەریکە هاوتەریبی فەلسەفە دەبێتەوە: پێشەکیت بۆ "گاڵتەجارەکەی مازۆخ" کتێبە بچووکەکەی دەربارەی پرۆست[13] , بەشی هەر زۆری "لۆجیکی**

---

[13] پرۆست, مارسیل ( Marcel Proust 1871 . 1922 ) یەکێکە لە رۆماننوسە ناسراوەکانی فەرەنسا , سەراپای ژیانی بریتییە لە چیرۆکی گەڕان بە دوای حەقیقەتدا , دیارترین کاری بریتییە لە گەڕان بە دوای زەمەنی ونبوودا .





**مانا"لە ناوەڕاستی ئەو کتێبەی تەرخان بوو بۆ لویس کارۆل, ئەو پەراوێزانەش کە تەرخانت کردبوون بۆ ئاخاوتن دەربارەی کلۆسۆڤسکی[14] و میشێل تۆرنی و زۆلا[15] , کتێبەکەی دەربارەی کافکا کە لەگەڵ فیلیکس گاتاریدا نوسیت, بەشێك لە وتووێژەکەت لەگەڵ کلێر بارنیدا کە تەرخان بوو بۆ ئاخاوتن دەربارەی سەرکەوتوویی ئەدەبی ئەنگلۆساکسۆنی.. لیستەکە درێژە. ئایا ئەدەب زۆر نزیکە لە فەلسەفە, سەر بە هەمان گوزارشتی فەلسەفەیە, بە رادەیەك کە پێویست بکات هاودەمی بیرەکانی هەموو جوڵانەوەیەکی تۆ بێت؟ یاخود هۆیەکی تر هەیە؟**

جیل دۆلۆز: نازانم. پێموانیە ئەو جیاوازیەیان هەبێت. دەتوانم خەون بە کۆمەڵە لێکۆڵینەوەیەکەوە ببینم ناونیشانێکی گشتییان هەبێت "رەخنەو عەیادە". ئەمە مانای ئەوە نیە کە گەورە نوسەران و گەورە هونەرمەندان نەخۆشن, ئەگەر بە شێوەیەکی بالاییش بێت, یاخود ئێمە لە ناویاندا بە دوای نیشانەی نیرۆسی دەرونیی یاخود سایکۆس دەگەڕێین, وەك بڵێی ئەوانە نهێنییەکن لە نهێنییەکانی کارەکانیان, یاخود ئاماژەیەکن بۆیان. ئەوان نەخۆش نین. بەڵکو بە پێچەوانەوە, ئەوان دکتۆری ئاوارتەن. بۆچی مازۆخ[16] ناوی خۆی دەبەخشێت بە نەخۆشییەکی

---

[14] کلۆسۆڤسکی (- 1908) Balthus (Balthasar Klossowski de Rola) نیگارکێشێکی فەرەنسیە, بایەخی دەدا بەکێشانی دیمەنەکانی ناوەوەی مرۆڤ. وێنەکانی گوزارشتن لەنهێنییە تەماوییەکانی مرۆڤ کە دەتوانرێت ئیرۆتیکایەکیان لێ پێکبهێنرێت. یەکێك لەناودارترین نیگارەکانی بریتیە لە وێنەی کچێکی هەرزەکار لەناو شلەیەکدا خۆی دەنوێنێت.

[15] زۆلا, ئەمیل 1840-1902) Zola, amile), رۆماننوس و رەخنەگرێکی فەرەنسییە, رابەری بزوتنەوەی سروشتییە لە فەرەنسادا. نوسەرە سروشتییەکان بە شێوەیەکی بابەتی وێنەی ژیان و رەفتارەکانی مرۆڤ دەگرن و خەسڵەتە بۆماوەیی و غەریزەکان و هەست و سۆزەکان پانتاییەکی بەرین لەبیرکردنەوەیان داگیر دەکەن, لەپاڵ ژینگەی ئابوریی و کۆمەڵایەتییدا. لەساڵی 1864دا کۆمەڵە چیرۆکێك بەناونیشانی چەند چیرۆکێك بۆ نینۆن بڵاو دەکاتەوە, هەروەها رۆمانێکی درێژیشی هەیە بە ناونیشانی دانپیانانەکانی کلۆدیا.

[16] ساخەر مازۆخ, لیۆبۆڵد ڤۆن 1836-1895) Sacher-Masoch, Leopold von) نوسەرێکی نەمسایيە, ناوەکەی بووەتە سەرچاوەی وشەی مازۆخیزم, کە زاراوەیەکی سایکۆلۆجییانەیە





دێـرین بـە قـەدەر کـۆنیی جیهـان؟ لەبـەر ئـەوە نیـە کـە ئـەو ئـازاری بەدەسـتەوە دەچـێژێت, بـەڵکو لەبەرئـەوەی ئامـاژەو سـیماکانی دەدۆزێتـەوەو وێنەیـەکی هەڵاواردەی بۆ دەکێشێت و دەیکات بە یەکێك لە گرێ سەرەکییەکان, رەفتاری مازۆخییانە گرێ دەدات بە رەوشی کەمینە رەچەڵەکییەکان و رۆڵی ژن لەناو ئەو کەمینانەدا: بەمەش مازۆخییەت دەبێت بە کردەوەی بەرەنگاریی, لە قۆشمەچێتی کەمینـەکان جیانابێتـەوە. مـازۆخ چـاك نیشـانەو ئاماژەکـانی نەخۆشـییەکە دەناسـێت. لای پرۆسـت, ئـەوەی دۆزراوەتـەوە, یـادەوەریی نیـە, بـەڵکو هـەموو چەشنەکانی ئاماژەکانە کە پێویستە لە توێی نێوەندەکان و شێوازی ناردنو مادە و سیستمەکەوە بدۆزرێنەوە. گەڕان بە دوای کاتی ونبوو بریتیە لە لێکۆڵینەوەی نیشانەکانی جیهانەکان. بەڵام دانراوەکانی کافکا, بریتیە لە دەستنیشانکردنی نەخۆشـییەکانی هـەموو ئـەو هێـزە شـەیتانییانەی چاوەڕێمانن. نیچـە دەیـوت هونەرمەندو فەیلەسوف دوو پزیشکەکەی شارستانێتیین. هونەرمەند ناتوانێت بە ژیانێکی سەرفکراو, یان ژیانێکی شەخسییەوە دابکەوێت. ئەو لەگەڵ منەکەی خۆیدا, لەگەڵ یادەوەریی خۆی و نەخۆشییەکانی خۆیدا نانوسێت. لە کردەوەی نوسیندا, هەوڵێك هەیە بۆ ئەوەی وا لە ژیان بکەین شتێکی زیاتر بێت لە ژیانی شەخسیی, ژیان لەو شتانە رزگار بکەین کە زیندانییان کردووە. هونەرمەند یان فەیلەسوف, بە زۆریی تەندروستییەکی زۆر فشەڵ و جەستەیەکی لاوازی هەیە,

---

مانای چێژوەرگرتن لە ئازار دەگەیەنێت, چ ئەگەر ئازاری جەستەیی بێت یان ئازاری دەرونیی, کە دووچاری کەسی تووشهاتوو دەبێت. چێژەکە ریشەیەکی سێکسییانەی هەیە, گەلێك لە کاراکتەرەکانی ئەم نوسەرە, لە کورتەچیرۆك و رۆمانەکانی و شانۆنامەکانیشیدا, ئەم خەسڵەتەیان هەیە. مازۆخ لە لێمبێرگ لە دایك بووە (ئێستا پێی دەڵێن لیڤ و دەکەوێتە ئۆکرانیاوە). لە زانکۆی پراگو گراز خوێندوویەتی و ماوەیەکی کورتیش مامۆستا بووە. سەرچاوەی نوسینەکانی ئەزمونە سێکسییە تایبەتییەکانی خۆی بوون. لەناو چیرۆك و رۆمانە زۆرەکانیدا: چیرۆکە گالییەکە –1846 , دۆن جوان لە کۆلۆمیاوە –1866 , وەسێتەکەی کاین (1870– 1877), هەروەها چیرەکە جولەکەییەکان –1878.





هاوسەنگییەکی وەهاش کە بە ئاسانی تێکدەچێت. سپینۆزاو نیچە و لۆرانس ئاوا بوون. بەڵام ئەوەی لەناویان دەبات مەرگ نیە, بەڵکو زێدەڕەویکردنە لەو ژیانەدا کە بینیویانەو هەستیان پێکردووەو تێیدا ژیاون. ژیانێکی زۆر گەورە بە نیسبەتی ئەوانەوە. بەڵام بەوانەوە "نیشانەکە نزیك دەبێت": کۆتایی زەرادەشت, لە کتێبی پێنجەمیان لە "زانستی ئاکار" دا. ئێمە بە پێی گەشتێکی داهاتوو دەنوسین کە هێشتاکە سیماکانی زمانەکەی نەڕسکاوە. ئەفراندن مانای گەیاندن نیە, بەڵکو بەرەنگارییە. پەیوەندییەکی قووڵ هەیە لە نێوانی ئاماژەکان, روداو, ژیان, زیندەگانییدا. ئەوە هێزی نائۆرگانییانەی ژیانە, کە دەشێت هێڵێك بێت لە نیگارێکدا, یان لە نوسێنێك یاخود مۆزیکێکدا. ئەم ئەندامانەن کە دەمرن. نەك ژیان. هیچ کارێکی هونەریی لە ئارادا نیە ئاماژە نەکات بۆ دەروویەك بۆ ژیان. هەموو ئەوەی من نوسیومە زیندەگانیی بووە, خۆشم بەهیوام لانیکەم وابێت, تیورییەك بۆ نیشانەکان و روداو پێکدەهێنێت. من پێموانیە لە ئەدەب و هونەرەکانی تریشدا, مەسەلەکە بە ڕێگایەیەکی جیاواز بخرێتە روو, بەڵام لەو بڕوایەدام کە من دەرفەتم بۆ نەڕەخساوە دەربارەی ئەدەب ئەو کتێبە بنوسم کە خۆم حەزم لە نوسینێتی.

*دەرونشیکاریی بەشێوەیەکی ناوازە لە ناواخنی "جیاوازی و دووبارەبوونەوە"و "لۆجیکی مانا"دا هەیە. لە "ئەنتی ئۆدیپۆسەوە", بەرگی یەکەم لە سەرمایەداری و شیزۆفرینیا", دەرونشیکاری بووەتە ئەو دوژمنەی پیویستە بروخێنرێت. بەڵام بە شێوەیەکی قووڵتر, لەوکاتەوە, بووە بەو دیدەی کە پێویستە خۆمانی لیّ رزگار بکەین بۆ ئەوەی بتوانین بیر لە شتێکی نویّ بکەینەوە, یاخود سەرلەنویّ بیربکەینەوە. ئەمە چۆن روویدا؟ بۆچی "ئەنتی ئۆدیپۆس" یەکەمین کتێب بوو بۆ بارودۆخەکانی روداوەکانی ئایاری 1968, بگرە لەوانەیە وەکو مانیفێستی فەلسەفیشیان وەهابێت؟ ئەم کتێبە دەڵێت ئاینده لە تیۆرییەکدا نیە کە مارکسیزم و فرۆیدیزم پێکەوە ئاشتبکاتەوە, لە فرۆید و (لاکان و بونیادەکانی) رزگارمان دەکات, رێك وەك ئەوەی چۆن واماندەزانی "فەیلەسوفە نوێیەکان" لە مارکس و (شۆڕش) ڕزگارمان دەکەن. ئەمە چۆن دەبینیت کە وەکو هاوشێوەییەکی سەمەرە دیارە؟





جیل دۆلۆز: شتێکی سەیرە, من فیلیکس گاتاریم لە دەرونشیکاری نەهێناوەتە دەرەوە, بەڵکو ئەو منی قوتار کردووە. لە لێکۆڵینەوەکەمدا دەربارەی مازۆخ, پاشان لە "لۆجیکی مانا"دا, وام دەزانی چەند ئەنجامێکم بە دەستهێناوە دەربارەی یەکێتیی سادیزم و مازۆخیزم, یاخود سەبارەت بە روداو, کە لەگەڵ دەرونشیکاریدا ناسازێن. بە پێچەوانەوە, فیلیکس گاتاری هەر بە پێوەستی بە دەرونشیکاری مایەوەو قوتابی لاکان بوو, بەڵام بە شێوازی "کوڕ" ێك کە پێشوەخت دەزانێت هیچ شێمانەیەکی ئاشتبوونەوە لە ئارادا نیە. ئەنتی ئۆدیپۆس بریتیە لە دابڕانێك کە بە تەنها خۆی لە نێوانی دوو بیرۆکەدا روودەدات: نەست شانۆ نیە, بەڵکو کارگەیە, ئامێری بەرهەمهێنانە. نەست دەربارەی بابە و دایە وڕێنە ناکات, بەڵکو دەربارەی رەچەڵەکەکان و هۆزەکان و کیشوەرەکان و مێژوو و جوگرافیا, وڕێنە دەکات, هەمیشە کایەیەکی کۆمەڵایەتی هەیە, ئێمەش بە دوای چەمکێکی ئاوادا دەگەڕاین, بۆ بەکارهێنانێکی هاوشێوەی دەسکەوتەکانی دەرونیشکاریی, بەرهەمگوزارێتی یان بیناسازێتی نەست. ئەوکاتەش وریابوونەوە کە دەرونشیکاری هەرگیز لەوە تێنەگەیشتووە کە "منداڵ.." مانای چیە, چارەنوس چیە (چارەنوسی گیانەوەرەکان, پەیوەندیی لەگەڵ گیانەوەرەکاندا), ئارەزوو مانای چیە, راڤەکردن یان دەقی وتراو مانای چیە. لە دوایین دەقمانەدا دەربارەی دەرونشیکاری " لە مرۆڤەوە بۆ گورگ" روونمان کردەوە, کە چۆن, واتە دەرونشیکاری ناتوانێت بیر لە کۆمەڵە یان فرە بکاتەوە, لە رەوە گورگێك و نەك بە تەنها گورگێك, پەیکەری ئێسکی, نەك تەنها لە یەك ئێسك.

بە لای ئێمەوە دەرونشیکاریی کارێکی گەورە بوو, ئارەزووی دەبردە سەر رێگایەکی داخراو, رێگەی لە خەڵکی دەگرت ئەوەی ئارەزوو دەکەن, بیڵێن. کارێك بوو دژی ژیان, سرودی مەرگ بوو, یاسای خەساندن بوو, تیونێتی و لوتبەرزی و کاهینچێتی بوو. ئەگەر ئەم کتێبە دوای روداوەکانی ئایاری 1968 سودی هەبێت, لەبەر ئەوەیە پەیوەندیی بەو هەوڵانەوە پچڕاندووە کە پشت بە مارکسیزم

و فرۆیدیزم دەبەستن و هەوڵ دەدەن پێکەوە بیانسازێنن: ئێمە هەوڵمان نەداوە ئاستەکان دابەش بکەین, یاخود ئاشتیان بکەینەوە. بەڵکو بە پێچەوانەوە, دەمانویست لە هەمان ئاست و هەمان کاتدا بەرهەمێك دابنێین کە کۆمەڵایەتی و ئارەزووکراو بوو, بە پێی لۆجیکی داڕژان و ڕێکردن. وڕێنەش ڕۆڵی خۆی لە واقیعییدا دەبینێت, ئێمە توخمێکمان نەدەناسی جگە لە حەقیقی و واقیعی, بە لای ئێمەوە ئەندێشەکراو ڕەمزیی دوو وتەزای هەڵەبوون.

کتێبی "ئەنتی ئۆدیپۆس" بریتیە لە خۆخزاندنە ناو واقیعییەوە, چەشنێکە لە سپینۆزاییەتی نەست. وەلیٚ من پێموایە ڕوداوەکانی ئایاری 1968, داهێنان بوون. ئەوانەی ڕقیان لەو ڕوداوانەیە, یاخود ئەوانەی پاساوی نکوڵیلێکردنی دەدەنەوە, پێیانوایە ڕەمزی و ئەندێشەیین. بەڵام هەرگیز وا نەبوون. بەڵکو بریتی بوون لە بەشدارییکردنێکی پەتیی واقیعیی. بەهەرحاڵ, من هیچ جووتبوونێك لە نێوانی پێڕەوی"ئەنتی ئۆدیپۆس" بەرامبەری فرۆید و پێڕەوی "فەیلەسوفە نوێیەکان" بەرامبەری مارکس, نابینم. ئەگەر ئەوە رووی بدایە دەیتۆقاندم. ئەگەر "ئەنتی ئۆدیپۆس" بانگەشەی ڕەخنەگرتن لە دەرونشیکاری کردبێت, ئەوا ئەوەی بە پێی چەمکی نەست کردبێت, کە چاك بێت یان خراپ, لە کتێبەکەدا بە درێژی باسکراوە. بەڵام فەیلەسوفە نوێیەکان, کاتێك گازاندە لە مارکس دەکەن, هەرگیز شیکردنەوەیەکی نویٚ بۆ سەرمایە ناکەن, ئەمە ڕەگەزێکە بە شێوەیەکی سەیر لە کارەکانی ئەواندا بزرە, ئەوانە پەردە لەسەر چەند ئەنجامێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ستالینییانە لادەدەن و پێیانوایە ئەوە لە مارکسیزمەوە هاتووە. بە ڕاستی ئەوانە زۆر نزیکن لەوانەی ترەوە کە کۆمەڵێك ئەنجامی نائاکارییانەیان دەدایە پاڵی فرۆید, ئەمەش پەیوەندیی بە فەلسەفەوە نیە.

*** یەکێك لە کتێبەکانی پێشووت بۆ فۆکۆ تەرخانکردووە. ئایا ئەوە کتێبێکە دەربارەی مێژووی فەلسەفە, هەروەها بۆچی فۆکۆ؟ لە نێوانی فەلسەفەکەی تۆ و فەلسەفەکەی ئەودا چ پەیوەندییەك هەیە؟**





جیل دۆلـۆز: فۆکـۆ فەیلەسـوفێکی سەراسـیمەکەرە, هـەروەها شـێواز زانێکـی زۆر دڵگیریشـە. بـە شـێوەیەکی جیـاواز زانین و دەسـەڵاتی شـیکردەوە و لـە نێوانیانـدا چـەندان پەیوەنـدیی تایبـەتی دۆزییـەوە, لەگـەڵ ئـەودا فەلسـەفە بـوو بـە خـاوەنی مانایـەکی نـوێ. پاشـان پرۆسێسـە خودانییـەکان وەکـو رەهەنـدێکی سـێیەمین بـە "دەقـەکان", هـەروەها وەکـو ئامـانجێکی سـێیەم کـە سـەرلەنوێ زانینـەکان بـەرەو پێشـــەوە دەبـات و دەســـەڵاتەکان راســـت دەکاتـــەوە: بـــەم شـــێوازە تیۆرییـــەك و مێژوویەکی داڕشتەکان و شکڵەکانی بوون و خودانییەتی گریکیی ئاوەڵا دەکات.. شـــێوازەکەی ئـــەو گەردونییـــەکان وەدەردەنێـــت و چـــەندان پرۆسێســـی نـــوێ دەدۆزێتەوە, کە هەردەم لـە فرەییدا روودەدەن. ئەوشتەی زیـاتر لـە هـی تر کاری تێکردم بریتیە لە تیۆرییەکەی دەربارەی دەقی وتراو, چونکە ئەوە چەمکێکی بۆ زمان تێدایە, وەك ئەوەی گشتێکی چوونیەك نەبێت, هاوسەنگیی لەدەستدابێت. ئـەم تیۆرییـە بوارمـان دەدات بیر لـە دروسـتبوونی چـەندان شـکڵی نـوێ لـە دەقـە وتراوەکانی هەموو بوارەکان. هەتا وتار و لێکۆڵینەوەکانی کۆ نەکرێنەوە, بایـەخی ئەدەبییانەی فۆکۆ, وەکو رەخنـەگرێکی ئـەدەبیی و هونـەریی روون نابێتـەوە. ئەو دەقەی فۆکۆ کە ناونیشانی "ژیانی پیاوە هیچ و پووچەکان" ە, کارێکی مەزنـە کـە گاڵتەو جوانیی پێکەوە کۆدەکاتەوە. فۆکۆ شتێکی لە چیخۆف تێدایە.

کتیبەکـەم دەربـارەی فۆکـۆ, هـەرگیز کتێبێـك نیـە دەربـارەی مێـژووی فەلسـەفە. کتیبێکــە خۆزگــەم دەخواســت پێکــەوە بماننوسـییایە, بــەپێی ئــەو بیرۆکەیــەی دەربــارەی ئــەو هەمــە, هــەروەها بــەپێی سەرســامبوونم پێــی. ئەگــەر ئــەم کتێبــە بەهایــەکی شــیعریی هەبوایــە, کتێبێــك دەبــوو لەچەشــنی ئــەو کتێبانــەی کــە شاعیرەکان ناوی دەنێن شیعری سەر گۆڕ.

پێموایـە لـە چـەند ماوەیەکدا لـە فۆکـۆ تێنەگەیشـتوون. ئـەم بێـزاری نـەدەکرد, بەڵام بێوازی دەکرد. پیاوێکی ترسێنەر بوو, واتە بوونی ئەو رێگەی لە بێئـابڕوویی گەمژەکان دەگرت. فۆکۆ ئـەو ئـەو وەزیفەیـەی فەلسـەفەی بەجێدەگەیاند کـە نیچـە دیاری کردبوو, واتـە "خراپـەکردن لەگـەڵ گێلەکاندا". بیر لـە لای ئـەو بریتیـە لـەو





ڕۆچوونە بە قووڵاییدا کە هەمیشە شتێك دەهێنێتە بەر ڕۆشنایی. ئەوە بیرێکە لۆچ دروست دەکات, بەڵام هەرزوو لۆچەکانی دەکرێنەوەو خاو دەبنەوە. فۆکۆ لەو چەشنە نوسەرانەیە کە بە پێی قەیرانەکان و ڕاچەنینەکان کاردەکەن, چونکە لە ناخیاندا, شتێکی بورکانی هەیە.

*** وادیارە دوایین کتێبت "لۆچ, لایبنیتز و بارۆکیزم" پەیوەندیی دەگرێت لەگەڵ سەرجەمی ئەو کتێبانەدا کە تەرخانت کردوون بۆ گەورە فەیلەسوفان: کانت, بێرگسۆن, نیچە, سپینۆزا. پەیوەندییت چیە بە لایبنیتزەوە"**

لایبنیتز سەرسوڕهێنەرە, چونکە هیچ فەیلەسوفێکی تر ئەوەی نەئەفراندووە کە ئەو ئەفراندوویەتی. چەمکگەلێکی بە رواڵەت زۆر نامۆ, بگرە خەریکە شێتانەش دەبن. یەکێتییەکەیان تەژم دیارە, وەك "هەموو بارکراوێك لەناو بابەتەکەدایە". هێندە هەیە کە بارکراو سیفەت نیە, بەڵکو ڕوداوە, بابەتیش بابەت نیە, بەڵکو ئاوەڵکردارە. لەگەڵ ئەوەشدا یەکێتییەکی بەرهەستی چەمکەکە هەیە, پرۆسێسێك یان بینایەك. سەرلەنوێ لۆچ لەسەر ئەم ڕەهەندە دووبارە دەبێتەوە, لۆچەکانی زەوی, لۆچەکانی ئەندامەکان, لۆچەکانی ناو ڕۆح. هەموو شتێك لۆچ دەکرێت و دەکرێتەوە, ئێمە لەناو لۆچەکاندا درك دەکەین, جیهان لەناو هەموو ڕۆحێکدا لۆچکراوەو بەپێی سیستمی فەزاو کات لۆچی ئەم ناوچەیە یان ئەوەیان دەکاتەوە. یەکسەریش دەتوانین سوسەی ئەو دۆخە نافەلسەفییە بکەین کە لایبنیتز حەواڵەمان دەکات بۆی, وەك ئەوەی حەواڵەی کەنیسەیەکی نامۆمان بکات "بێ دەرگاو بێ پەنجەرە", کە لەوێ هەموو شتێك ناوەکییە, یاخود حەواڵەی مۆزیکێکی نەسرۆمان بکات کە هارمۆنی لە ئاوازەکەوەو لە نەغمەکەوە وەردەگرێت. بارۆکیی ئەوەیە لۆچەکە بەرەو ناکۆتا ڕاست دەکاتەوە. ئێمە لە تابلۆکانی گریکۆدا دەیبینین, لە پەیکەرسازیی بارنینیدا, دەیبینین, هەرئەوە کە تێگەیشتنی نافەلسەفییمان لە کارتێك و هەستپێکی هەستییەکان بۆ ئاوەڵا دەکات.





کتێبەکەم دەربارەی لایبنیتز وەکو بەردەوامی و دەرەنجامکردن وایە. پێویستە لە هەمان کاتدا, لە کارەکانی شوێنکەوتووانیدا بۆ لایبنیتز بگەڕێین (بە دڵنیاییی فەیلەسوفێکە زۆرترین ژمارەی فەیلەسوفان لەدەوری خڕبوونەتەوە) هەروەها لە کاری ئەو هونەرمەندانەشدا کە بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن, لەگەڵیدا هاوسۆزن, وەك هینری میشێل و مالارمێ و هانتای و بۆلاز, هەروەها هەموو ئەوانەی جیهانێك لە لۆچەکان و کردنەوەی لۆچەکان دادەهێنن.

**سەرچاوە:**

**کتێبی "المتاهات, نصوص و حوارات فی للادب"**

**وەرگێڕانی : حسونە المصباحی**

**ل:** 104 – 118.

چالاکییەکانی فۆکۆ هەزار روویان هەیە, لە لایەکەوە کەشفکەری ئەرشیفەکانە, ئالودەی مۆزیکە, تێکۆشەر و رۆژنامەنووس و شتی تریشە . رەوتی فەلسەفەی فۆکۆ چوستی و چالاکییەکی فرە شێوەیە.

یەکێك لە ئاماژە ناوازەکان بریتییە لەوەی کە مەرگ تاقە یەك دەمامکیشی بۆ نەهێشتەوە . ئەمەش وادەکات دیاریکردنی سنورەکانی سەخت و گران بێت, دیاریکردنی سنور بۆ فۆکۆ ناشێت چونکە ئەو هەمیشە وەکو جەنگاوەرێك لە هەوڵەکانی گەمارۆدان یاخی دەبێت. ئەم گفتوگۆیە لە 20 ی حوزەیرانی ساڵی 1975 دا ئەنجامدراوە, واتە دوای ئەوەی لە شوباتی هەمان ساڵدا کتێبی چاودێری و سزای بڵاوکردەوە, هەروەها بەر لە دەرچوونی کتێبی ئیرادەی زانین لە کانونی یەکەمی ساڵی 1976 دا . لێرەدا پێویست دەکات رەوشی ئەوکاتە روون بکرێتەوە . لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا من لەگەڵ فۆکۆدا بۆ نوسینی کتێبێکی دیمانە کارم دەکرد, مەسەلەکە پەیوەندیی بەو پرسیارانەوە هەبوو کە کارەکانی ئەو بە هەڵواسراویی هێشتبوونییەوە, رۆشنایی خستنە سەر چەند خاڵێکی تەژم, قووڵکردنەوەی ئەو هێڵە سەرەکییانەی کە لێرەو لەوێ دیاری کردبوون . بە کورتییەکەی ئێمە دەمانویست لە رێگەی وتووێژەوە کتێبێکی تا رادەیەك جیاوازتر بنوسین . بەڵام لەبەر چەند هۆیەکی جوان هەست پێکراو, وەلێ نارەحەت راڤە کراو, هەوڵەکە نەگەیشتە ئەنجام . فۆکۆ حەزی دەکرد زیاتر بچینە پێشەوەو شتی تازەتر بەرهەم بهێنین, بەڵام پرسیارەکانی من دەیانگەڕاندەوە بۆ سەر کارەکانی خۆی و فرێیان دەدایە جێگەی راڤەکەرێکەوە . پرسیارەکانی من پاڵیان پێوە دەنا دەربارەی رەوتی خۆی بدوێت, هۆکەشیان ناکارامەیی من و قورسیی هێنانە گۆی ئەو بوو, تا باس لە کەلتوری خۆی بکات و حەزیشی لەوە نەدەکرد . بۆیە بە رازیبوونی هەردوولامان واز لە پرۆژەکە هێنرا. ئەم ئاخاوتنەی ئێستا هیچی لێ نەقرتێنراوەو جارێکی تریش نەنوسراوەتەوە, بۆیە شێمانەی ئەوە لە ئارادا نییە کە فۆکۆ بەسەریاندا چووبێتەوە. تەنها ئەو پەرەگرافانەم هەڵبژاردووە کە دەربارەی ئەدەبن و لە کاسێتی شەشەمی ئاخاوتنەکان دەرم هێناون. من خۆم هەندێ درێژەپێدانم لابردووە . ئەوەی ماوەتەوە من بەرپرسیاری یەکەمم لێیان و رستەکان لە دارشتنەوەی خۆمن, بۆیە دەڵێم تەنها شتێك کە لەم دەقانەدا تۆمار نەکرابێت, پێکەنین و هێماو گەرموگوڕییەکەی فۆکۆیە, کە پانتاییەکی فراوانی لە ئاخاوتنەکان داگیر کردووە, ئەوەی فۆکۆی لە کاتی وانە وتنەوەدا دیبێت, هەست بە گرنگیی ئەوانە دەکات. ئومێدەوارم ئەوەندە شت مابێتەوە تا روونی و رەوانیی ئەو دەربخەن.





*** لە تۆژینەوەکانی تۆدا چ پلەو پایەیەك دراوە بە دەقە ئەدەبییەکان ؟**

فۆکۆ: لە مێژووی شێتی و وشەکان و شتەکاندا, تەنها هەر ئیشارەتم پێداون و بە شێوەیەکی سەرپێیی ئاماژەم بۆ کردوون, من ئەو پێناسەکەرە بووم کە دەیووت: "کەواتە ناتوانین لێرەدا باسی Le neveu Rameav نەکەین – یەکێکە لە نوسراوەکانی دیدرۆ[17]" بەڵام من هیچ بایەخێکی پێنادەم لە کۆنترۆڵکردنی رەوتەکەدا.

لای من, هەمیشە ئەدەب بابەتی وردبوونەوە بووە, نەك بابەتی شیکردنەوە یان کورتکردنەوە یان تێکەڵ کردن بە خودی کایەی شیکردنەوە, ئەدەب پشوودان و وێستگەو دروشم و ئاڵا بووە.

*** ناتەوێت ئەو دەقانە ملکەچ بکەیت بۆ دەوری گوزارشت کردن, یان بۆ پەرچەکردنەوەی پرۆسێسە مێژووییەکان ؟**

فۆکۆ: نا .. (بێدەنگیی و بیرکردنەوە) رەنگە پێویست وابێت لە ئاستێکی تردا خۆت لە مەسەلەکە بدەیت .

لە راستیدا, هەرگیز لە بارستەی ئەو شتانەوە کە دەوترێن و لە سەرجەمی ئەو گوتارانەوە[18] کە بە راستیی هەن, دەستمان نەکردووە بە شیکردنەوە, چۆن

---

[17] دیدرۆ, دینیس ,Diderot, Denis (1713-1784) فەیلەسوف و ئینسایکلۆپیدیکارێکی فەرەنسییە, رۆمان و وتارو شانۆگەریی و رەخنەی ئەدەبییشی نوسیوە. دیدرۆ لە پەیمانگای یەسوعییەکانی لانگەر خوێندوویەتی و, پاشان چووە بۆ پاریس و لە ساڵی 1732دا بووە بە ئوستادی هونەرە جوانەکان. لەساڵی 1742دا دەبێتە هاورێی رۆسۆو, هەر لەو ساڵەدا کتێبی مێژووی یۆنان وەردەگێرێت بۆ فەرەنسیی. لەساڵی 1746دا لەگەڵ دالامبێری ماتماتیکزاندا, ئینسایکلۆپیدیای ئینگلیزیی وەردەگێرێیت بۆ فەرەنسیی کە سی و پێنج بەرگی گەورە دەبێت. هەر لەو ساڵەدا کتێبی بیرۆکە فەلسەفییەکان دەنوسێت و یەکسەر دادگای پاریس تاوانباری دەکان بە لە دین دەرچوون. ساڵی دواتر کتێبی پیاسەی گومان دەنوسێت و بە تەواوی لەگەڵ ئاینزاکاندا تێك دەچێت. چەندان دەقی شانۆییشی نوسیوەو ئامادە کردووە.

[18] گوتار discoures گروپێکی تایبەتە لە گوزارشتەکان, بە وەزیفە کۆمەڵایەتییەکەی و پرۆژە ئایدیۆلۆجییەکەی دیاری دەکرێت. بەمجۆرە زاراوەکە ئاماژە دەکات بۆ سیستمێکی فیکری کە چەندان چەمك و وتەی تیوری دەگرێتە خۆی لە پاڵ چەند رەهەندێکیشدا بۆ پراکتیك, هەمووی





ژمارەیەکی دیاریکراو لە گوتارەکان (گوتاری ئەدەبی, گوتاری فەلسەفی) پیرۆزیی خۆیان و وەزیفەی تایبەتی خۆیانیان هەیە . پێدەچێت ئێمە بە شێوەیەکی تەقلیدی گوتارە ئەدەبییەکانمان کردبێتە ئەڵتەرناتیڤێك, یاخود بەرگێکی گشتی بۆ هەموو گوتارەکانی ترو, پێویستیشە لەسەر ئەدەب ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە کە دەمێنێتەوە.

یەکێك مێژووی ئەوەی نوسیوەتەوە کە لە سەدەی هەژدەیەمدا دەوترا, کە بە فۆنتانیلدا[19] تێدەپەڕی, یان ڤۆڵتێر[20] یاخود دیدرۆ, یان La Nouvelle Hëloîse[(3)] . . .

---

لە دەوری یەکێك لە پانتاییەکانی واقیعی کۆمەڵایەتی و بگرە ناکۆمەڵایەتییش, بە مەبەستی نزیکبوونەوەو تێگەیشتن و کارلێککردن لە گەڵیدا.

[19] فۆنتانیڵ, بێرنارد لا بۆڤێر, سیوار دی Fontenelle, Bernard le Bovier, Sieur de (1657- 1757) نوسەرو زانایەکی فەرەنسییە, لە رۆبین لە دایك بووەو لە کۆلێجی مەسیحیی رۆبین خوێندویەتی و پاشان یاساشی خوێندووە, بەڵام خووی داوەتە ئەدەب. لە تەمەنی سی ساڵیدا دراماو ئۆپێراودیالۆگ و کورتەچیرۆکی نوسیوە, هەروەها تێزیشی دەربارەی زانست ئامادە کردووە. کارە فەلسەفییەکانی "دیالۆگەکانی مەرگ –1683" وەکو پیاوێکی نوسەر شۆرەتیان پێ پەیدا کردووە. لە ساڵی 1691 دا, چووەتە ئەکادیمیای فەرەنسی. لە ساڵی 1699 ەوە تا 1739, وەکو سکرتێری زانست لە ئەکادیمیا خزمەتی کردووە, بەشێوەیەکی تایبەتی نوسینە زانستییەکانی شۆرەتیان پەیدا کرد. مەزنترین کاری, بریتیە لە پرەنسیپەکانی سیستمی کۆپەرنیکۆسی. لە هەندێك نوسینیدا هێرشی کردۆتە سەر خورافیاتی ئاینیی. فۆنتانێڵ بە هەڵوێستە پرسیارکەرو لێکۆڵەرەکەیەوە پێش رۆحی پشکنەری رۆشنگەریی سەدەی هەژدە کەوتووە.

[20] ڤۆڵتێر (1694–1778), Voltaire ناوی خواستراوی فرانسیس ماری ئارۆیتە, نوسەرو فەیلەسوفێکی فەرەنسییە, یەکێکیشە لە رابەرانی رۆشنگەریی. یەکێکە لەنوسەرە مەزنەکانی سەدەی هەژدە لەفەرەنسا, دوژمنی سەرسەختی ستەمکاری بوو, نوسینەکانی تاڕادەیەکی زۆر رەخنەئامێز و گاڵتەجاڕ بوون. زۆرجار بۆچونە لیبراڵ و کراوەکانی کێشەیان بۆ دروست کردووە, دیارترین نوسینەکانی ئارگیومێنتە فەلسەفییەکان و کاندیدە, هەروەها ژمارەیەکی زۆریش شانۆنامەی نوسیوە. ژمارەیەك لەنوسینەکانی بریتین لەهەجوویەکی توندی دادوەرێکی فەرەنسیی کەناوی فیلیپی دووەم بووە, لەبەر تاوانە درێژەکانی, تا سەرەنجام لەبەندیخانەی پاستێلدا بۆ ماوەی یازدە مانگ زیندانیی دەکرێت. لەم ماوەیەدا شانۆنامەی ئۆدیپۆس تەواو دەکات, کە لەئۆدیپۆسی ستەمکاری گریکەوە وەرگیراوە, کە سۆفۆکلیس نوسیویەتی. هەروەها





هتـد. یـاخود وای بـۆ چـوو ئـەو دەقانـە گوزارشـت لـە شـتێك دەكـەن كـە ناكرێـت لـە كۆتاییدا لە ئاستێكی رۆژانەتردا دابڕێژرێت.

لە بەرامبەری ئەم هەڵوێستەی پێشبینیكردندا (واتە ئاماژەكردن بۆ ئەدەب لە هەر كوێ بێت، بە بێ دیاریكردنی پەیوەندییەكانی بەوەوە كە دەمێنێتەوە) بە راشكاوی گواستمەوە بۆ هەڵوێستێكی نەرێ، هەوڵمدا بە شێوەیەكی ئەرێیانە سەرلەنوێ هەموو گوتـارە نائـەدەبیی یـان نیمچـە ئەدەبییـەكان دەربخەمـەوە، ئەوانـەی كـە بـە راسـتی توانیویانـە لـە سـەردەمێكی دیـاریكراودا دروسـت بـن، ئەدەبیشـم خسـتە لاوە. لـە چاودێریی و سزادا مەسەلەكە تەنها پەیوەندیی بە ئەدەبی خراپەوە هەیە.

* چۆن ئەدەبی خراپ لە هی چاك جیا دەكرێتەوە؟

فۆكۆ: بە راست، دەبێت رۆژێك لە رۆژان دەست بۆ ئەمە ببەین، لە لایەكەوە پێویستە بپرسـین، ئـا ئـەو چـالاكییە چییە كـە لـە كۆمەڵگایەكـدا.. لـە بازارگـەرمی ئەندێشـەو هۆنراوەو نوسینە سەردییەكاندا وێنا دەبێت، هەروەها پێویستیشە پرۆسەیەكی تر شی بكەینەوە: چی وا دەكات لە نێوانی ئەم هەموو نوسینە سەردییەدا، ژمارەیەكی دیاریكراویـان پیرۆز بن، ئیتر دەستدەكات بە ئیشكردن وەك ئەدەب و یەكسەر لەناو دەزگایەكدا وەردەگیرێتـەوە كە لە ئەسلا زۆر جیاوازە: ئـەویش دەزگـای زانكۆییـە كـە ئێسـتا دەسـتی كـردووە بـەوەی لەگـەڵ دەزگـای ئەدەبیـدا هـۆی هاوتـاو هاوشـوناس بكات.

هێڵێكی لێژبوونـەوەی زۆر دیـار لـە رۆشـنبیرییماندا هەیـە. لـە سـەدەی نۆزدەیەمدا، زانكـۆ ئـەو رەگـەزە بـوو كـە لـە ناویـدا ئـەو شـتە پێكـدەهات كـە پێـی دەوتـرا ئـەدەبی

---

چەند شیعرێكی هەجووی دەربارەی هینری چوارەمیش نوسی. پاش ئازاد بوونی ، جارێكی تریش بۆ ماوەی دوو هەفتە دەگیرێتەوە لەبەر ئەوەی لەگەڵ چەند خێزانێكی نێوداری فەرەنسادا بەشـەڕدێت، پاشـان بـەو شـەرتەی فەرەنسا جێبهێڵێـت و بـەرەو ئینگلتـەرە بكەوێتـە رێ، ئـازاد دەكرێت. مـاوەی دووسـاڵ لەلەنـدەن دەمێنێتـەوەو هـەر زوو فێـری زمـانی ئینگلیزیـی دەبێـت و شیعرەكانی خـۆی پـێ بڵاو دەكاتـەوە، هـەروەها دوو وتـاری زۆر گـرنگیش دەنوسێت، یـەكێكیان دەربارەی قەسیدەی داستان و ئەوی تریشیان دەربارەی مێژووی جەنگی ناوخۆی بەریتانیا.





کلاسیکی کە بە پێی پێناسەی ئەو, ئەدەبێکی هاوچەرخ نەبوو, کە بە ڕێسایەکی تاقانە دادەنرا بۆ ئەدەبی هاوچەرخ و لە هەمانکاتیشدا ڕەخنەگرتن بوو لە خودی ئەم ئەدەبە. گەمە سەیرەکەی سەدەی نۆزدە لە نێوانی ئەدەب و زانکۆدا, لە نێوانی نوسەرو زانکۆکاردا لەمەوە هاتووە.

پاشان هێواش هێواش, هەردوو دەزگا موتوربەکراوەکە, سەرباری کێشەی نێوانیشیان, ملیان دا بۆ تێکەڵاوبوونی تەواوەتی. ئەمڕۆ باش دەزانین کە ئەو ئەدەبەی پێی دەوترێت پێشەنگ, تەنها زانکۆکاران دەیخوێننەوە, هەروەها دەشزانین ئەو نوسەرەی تەمەنی لە سی ساڵ تێپەڕی کرد, دەوری بە خوێندکارانێك دەگیرێت کە بڕوانامەکانیان لەسەر کارەکانی ئەو ئامادە دەکەن. دەشزانین کە نوسەران بە زۆریی بە وانە وتنەوە و بەو سیفەتەی زانکۆیین, گوزەران دەکەن.

کەواتە, لە ڕاستیدا شتێکمان هەیە, ئەویش ئەوەیە ئەدەب بە هۆی گەمەی هەڵبژاردن و پیرۆزکردن و ڕاستکردنەوەی دەزگاییەوە, وەك ئەدەب کار دەکات, لە هەموو ئەمەشدا زانکۆ بزوێنەرو پەسەندکەرە.

*** ئایا هیچ پێوانەیەك هەیە بۆ ناوەوەی دەقەکان, یان مەسەلەکە لەوە تێپەڕناکات پرۆسەیەکی پیرۆزکردن بێت کە دەزگای زانکۆیی ئەنجامی دەدات؟**

فۆکۆ: هیچ نازانم, تەنها دەمەوێت ئەمەی خوارەوە بڵێم: بۆ ئەوەی لەگەڵ ژمارەیەکی دیاریکراوی ئەفسانەکاندا یەکلایی ببینەوە, بە مۆرکی گوزارشتییانەی ئەدەبیشەوە, پێویست بوو ئەم پرەنسیپە گرنگە دابنێین, ئەویش ئەوەیە ئەدەب پێوەست نیە بە خۆیەوە نەبێت, ئەگەر پێوەست بێت بە نوسەرەکەیەوە, ئەوە پەیوەندی بە ڕێگای مەرگ و بێدەنگییەوە هەیە, تەنانەت بە پووکانەوەی ئەوەی دەنوسێت.

مەبەستمان ئەوە نیە بگەڕێینەوە بۆ بلانشۆ[21] یان بارت, گرنگ بەهای ئەم پرەنسیپەیە, واتە پێویستێتیی ئەدەب. ئەوە قۆناغی یەکەم بوو کە بە هۆیەوە,

---

[21] بلانشۆ, مۆریس Blanchot, Maurice ( 1907 – ) ڕۆماننوس و ڕەخنەگرێکی فەرەنسییە, بەشداریی کردووە لەدامەزراندنی جوڵانەوەی ڕەخنەی نوێی فەرەنسییدا. یەکەمین ڕۆمانی ناوی ئەمیناداب . 1942, شۆرەتێکی جیهانیی پەیداکرد, کە لەژێر کاریگەریی فرانز کافکادا





توانیمان لەو بیرۆکەیە خۆمان رزگار بکەین کە دەڵێت ئەدەب شوێنی پەڕینەوەیە یان ئەو خاڵەیە کە هەموو پەڕینەوەیەك پێی دەگات، یاخود گوزارشتە لە هەمەکەکان.

بەڵام بەلامەوە ئەوە تەنها قۆناغێك بوو. چونکە بە هێشتنەوەی شیکردنەوە لەم ئاستەدا، ناگەینە ڕماندنی ئەو هەموو پیرۆزکارییانەی لکێنراون بە ئەدەبەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە پیرۆزییەکی زۆرتری بۆ زیاد دەکەین. ئەمەش بوو کە لە ساڵی 1970 دا بە راستی روویدا، سەرنجمدا هەندێك لە بابەتەکانی بلانشۆ یان بارت، بە شێوەیەك لە شـکۆدارکردنی زۆر لیریکییانـەو بەعـەقلانیکردنی ئـەدەب بـەکاردەهێنرێن، وەکـو بونیادێکی زمانەوانی کە ناتوانرێت شی بکرێتەوە بۆ خودی خۆی نەبێت، بە دەسپێك لە خودی خۆیەوە نەبێت.

تێـوەگلانی سیاسـی لـەم شـکۆدارکردنەدا بـزر نـەبوو، کـە بـە هۆیـەوە گەیشـتینە ئەوەی کە نوسین، خۆی لە خۆیدا، تا ئەو ئاستە لە هەموو سنورکردنێك ئازاد بووە، هــەروەها پرۆســەی نوســین خــۆی لــە خۆیــدا رماندنــە، هــەروەها نوســەر، لــە مومارەسەکردنی هەمان پرۆسەدا، مافێکی ڕماندنی هەیە کە قابیلی کۆنبوون نیە! بەمەش بە قەدەر ئەوەی نوسین نوسین دەبێت، نوسەریش شۆڕشگێڕ دەبێت، بەناو پێوە پێوەستبوونیدا رۆدەچێت و جووڵەی شۆڕش بەرهەم دەهێنێت! تۆش دەزانیت کە بەداخەوە ئەمانە شتگەلێکن کە وتراون...

بە راستی پێڕەوەکەی بلانشۆ و پێرەوی بارتیش دەیانەوێت سیفەتی پیرۆزیی لە ئــەدەب دابمــاڵن، بــە هەڵوەشــاندنەوەی ئــەو پێوەســتانەی دەیخەنــە جێگــەی گوزارشتکردنی رەهاوە. ئەم دابڕانە مانای ئەوەیە کە جوڵانەوە لایەنگیرەکە بریتیە لە داماڵینی سیفەتی پیرۆزیی لێی بە شێوەیەکی تەواوەتی، هەروەها هەوڵ بدەین لە توێی بارستەی گشتیی ئەوەی وتراوە، بزانین لە کاتێك لە کاتەکان و بە شێوەیەکی دیاریکراو، ئەم ناوچە تایبەتییەی زمان چۆن پێکهاتووە، ئەو ناوچەیەی نابێت داوای

---

نوسیبووی. پاشان رزگارکردنی ئەوەی ماوە . 1948، ئینجا لێکۆڵینەوە ناودارەکەی پانتایی ئـەدەب . 1955. ئینجـا شـێتبوونی ئـەمرۆ 1973. ژمارەیـەك وتـاری ئەدەبیشـی نوسـیوە کەبناونیشانی تێرامانی ئۆرفیۆسەوە وەرگێڕدراون بۆ زمانی ئینگلیزیی.





لێبکەین بڕیارەکانی کەلتورێك بخاتە ئەستۆی خۆی. بەڵام پێویستە لێی بپرسین: چۆن کەلتورێك دەتوانێت بڕیار بدات ئەم جێگا ناوازەو نامۆیەی پێببەخشێت؟

*ئەمە شێکی نامۆیە؟

فۆکۆ: کەلتورەکەی ئێمە بە مانایەك لە ماناکان پشکێکی سنورکراو بۆ ئەدەب دیاری دەکات، بە جۆرێك مایەی سەرسوڕمانە: چەندن ژمارەی ئەوانەی ئەدەب دەخوێننەوە؟ ئەو پلەو پایەیە چیە کە ئەدەب لە توێی درێژبوونەوەی گشتیی گوتارەکاندا داگیری دەکات؟

بەڵام ئەم کەلتورە هەر خۆی بەسەر نەوەکانیدا دەسەپێنێت روو بکەنە کەلتور، لە ماوەی خوێندنیاندا بەناو ئایدیۆلۆجیایەکی کامڵدا تێبپەڕن، ئایدیۆلۆجیای ئەدەب، چەشنە ئایرۆنییەك لە گۆڕێیە.

ناتوانین ئەمە لەو وتەیە جیابکەینەوە کە دەڵێت نوسین کارێکی روخێنەرانەیە، راگەیاندنی ئەمەش لەم گۆڤارە یان ئەوەی تردا هیچ بایەخێك یان قورساییەکی نیە. بەڵام ئەگەر لە یەك کاتدا هەموو ئوستادەکان، هەر لە مامۆستاکانەوە تا دەگاتە ئوستادی کۆلێجەکان، بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پێیان وتیت کە پێویستە لای دیدرۆ یان ساد[22] یان هێگڵ یان رابیلیٚ[23] بگەڕێین بۆ بڕیارە گەورەکانی

---

[22] ساد، مارکیز دی Sade, Marquis de (1740–1814)، ناوی شۆرەتی دۆنیتین ئەلفۆنس فرانسیۆسە، رۆماننوس و شانۆنامەنوسێکی فەرەنسییە، لێکۆڵینەوەی فەلسەفییشی هەیە. زیاتر بەو کارانەی ناسراون کە پڕن لەسەرکوتکردن و چەپاندن، لەبەر چەند تاوانێکی سێکسی دەگیرێت و دەخرێتە زیندانەوە، بەڵام هەڵدێت بەرەو ئیتالیا، پاش ماوەیەك دەگەڕێتەوە. دیسان دەیگرن و فڕێی دەدەنە زیندانەوە، ئازاد دەکرێت و دیسان دەگیرێتەوەو لە زینداندا دەمرێت.

[23] رابیلیٚ، فرانسیۆس Rabelais, François (1494?-1553) نوسەرێکی فەرەنسییە کارە پڕ لە هەراو هوریاو گاڵتەجاڕییەکانی، لەگەڵ جەختکردنیدا لەسەر ئازادیی تاکەکەس، هەروەها پەرۆشیی بۆ ژیان و زانین، کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر مرۆڤدۆستییەکەی رێنیسانس هەبووە. باوکی خانەدان و دەوڵەمەند بووەو پارێزەرێکی ناسراویش بووە. رابیلیٚ بە منداڵی لە کەنیسەی بێندێکتییەکان خوێندوویەتی، لەوێ فێری زمانی یۆنانی بووە. لە ساڵی 1532دا یەکەمین چیرۆکی نوسیوە دەربارەی زەبەللاحێکی شەهوانیی یەکجار بەهێزو زۆر خۆر ، بە ناونیشانی





کەلتورێك و ئەو خاڵانەی تێیاندا دەچەمێتەوە, ئەوا بە باشی دەبینیت کە مەسەلەکە لە کۆتاییدا پەیوەندیی بە هەمان شتەوە هەیە. هەمووان وا لە ئەدەب دەکەن بە یەك شێوە کار بکات. کاریگەرییەکانی پشتیوانیکردن لەسەر

ئەم ئاستە ئاڵوگۆڕە, گرووپە پێشەنگەکان, وەك ئاوا ناویان لێنراوە, هەروەها جەماوەری زانکۆ, هەموویان کۆکن, ئەم مەسەلەیەش گەیشتە گەمارۆیەکی سیاسییانەی توند.

***تۆ چۆن خۆت لەم گەمارۆیە رزگار کرد؟**

فۆکۆ: یەکەمجار شێوازی من لە دەستبردن بۆ گرفتەکەدا, لە کتێبەکەمدا دەربارەی ریمۆن روسێلدا وێنا دەبێت, پاشان بە شێوەیەکی تایبەتی لە کتێبی بیار ریڤییردا. لە نێوانی هەردوو کتێبەکەدا هەمان پرسیارکردن هەیە. لە چ سنورێکەوە گوتارێك لە تویێی کایەیەکدا دەکەوێتە گەڕ (چ ئەگەر گوتاری نەخۆشێك یان تاوانبارێك بێت ..هتد) کە پێی دەوترێت کایەی ئەدەبی؟

بۆ زانینی ئەوەی ئەدەب چیە, نامەوێت لە بونیادی ناوەوەی بکۆڵمەوە, بەڵکو دەمەوێت دەستم بگەیەنمە ئەو جوڵەیە, ئەو دروسانە وردەی کە لە تویێیەوە چەشنێك لە گوتاری نائەدەبی و داگیرکراو و پشتگوێخراو و لەبیرکراو, دەچێتە ناو کایەی ئەدەبییەوە. ئا لێرەدا چی روودەدات؟ ئەوەی دەستدەکات بە کارکردن چیە؟ چۆن لە رێگای دانپیانانییەوە بەوەی گوتارێکی ئەدەبییە, رەنجەکانی مشتوماڵ دەکرێنەوە.

---

(گەشتە نایاب و لە بەها نەهاتووەکانی گارگانتۆ کە زەبەللاحێکی نایاب و بێوێنەیە). پاشان لە ساڵی 1534دا (ژیانە زۆر ترسناکەکەی گارگانتۆی زەبەللاح دەنوسێت), کە چیرۆکی باوکی پانتاگرۆیلە. ئەم کتێبە لە ژێر ناوی خواستراوی ئەلکۆفریباس نەیسیردا بلاوکراوەتەوە. هەردوو کتێبەکەی لەلایەنی سۆربۆنەوە بەهیچ دانراون, بەلام سەرکەوتنێکی بێوێنەیان لەناو جەماوەردا بەدەست هێناوە. کارەکانی تری Tiers Livre 1546 , پاشان Quart Livre 1552.





*** تۆ چەند دەقێکت تەرخان کردووە بۆ چەند کارێکی ئەدەبی کە تێیاندا ئەم پرسیارە ناخرێتە ڕوو، بە تایبەتی مەبەستم لە وتارە ڕەخنەییە بڵاوکراوەکانتە دەربارەی بلانشـۆ، کلۆسۆڤسـکی، باتـای[24]، ئەگەر هەموویان پێکەوە کـۆ بکەینـەوە، وێنەیـەکی نائاسـایی دەربـارەی ڕەوتـی تـۆ دەدەن بـە دەستەوە. . .**

فۆکۆ: بەڵێ، بەڵام ... (بێدەنگی) لـە ڕاسـتیدا ڕەنگـە قسـەکردن دەربـارەی ئەمـە قـورس بێت، بلانشۆ و کلۆسۆڤسکی و باتای، ئەم سیانە کـە لـە کۆتـایی شەسـتەکاندا بایـەخم پێداون، بە نیسبەتی منەوە زیاتر بوون لە کاری ئـەدەبی و گوتـاری نـاو ئـەدەب، ئەوانـە گوتارگەلێکن لە فەلسەفەوە هاتوونەتە دەرەوە.

**مەبەستت چیە؟**

فۆکـۆ: ئەگـەر پێتخۆشـە بـا نیچـە وەربگـرین، ئـەو بـە نیسـبەتی گوتـاری فەلسـەفی زانکۆییـەوە کـە دەسـبەرداری گێڕانـەوەی جەمسـەری دەرەکـی بـەرەو خـۆی، نابێـت. بێشك، ڕەوتێکی تەواوی فەلسـەفەی خـۆراوایی دەتوانێـت لای نیچـە خـۆی بناسـێتەوە. ئـەفلاتون و سـپینۆزاو فەیلەسـوفەکانی سـەدەی هـەژدەو هـیگڵ... هـەموویان بـەناو نیچـەدا دەڕۆن، لەگـەڵ ئەوەشـدا، ئەوەنـدە تایبـەت بێـت بـە فەلسـەفە، نیچـە تونـدی و سادەییەکی زبـرو دەرەکـی و چەشنێك لـە گوندنشـینیی کێوییانـەی هەیـە، کـە ڕێگـەی پێدەدات دەست بکێشێت بە شانماندا، بێ ئـەوەی بـەهیچ جۆرێك بێبـەها بێـت، بـەوەی بـە گرژییەکـەوە کـە نـاتوانین خۆمـانی لێ نـەبان بکـەین، پێمـان بڵێـت: "ئەمـە هـەمووی هەراو هوریایە..."

ڕزگـاربوون لـە فەلسـەفە، بـە زەرورەت مانـای لاسـارییەکی وەك ئەمـە دەگەیـەنێت. ئێمە بە مانەوەمان لە ناو فەلسەفەدا، لێی ناچینە دەرەوە، بـەڵکو بـە دژایـەتیکردنی، بـە

[24] باتـای، جـۆرج Georges Bataille ( 1897 ـ 1991 ) فەیلەسـوفێکی فەڕەنسـییە ، خوێنـدنی پچڕپچڕ بووەو ژیانێکی نائاسایی بەسەر بردووەو وەکو نیچە ژیـانی خـۆی پەیوەندییـەکی زۆری بـە نوسـینەکانییەوە هەیـە ، فەیلەسـوفێکی فرە ڕەهەنـدەو بـە سـانایی لـەناو پێناسـەیەکدا جێـی نابێتەوە ، گرنگترین کتێبەکانی بریتین لە ئەزمونی دەرونیی ، گوناهکار ، دەربارەی نیچە.





جۆرێك گەمژەیەتی سەرسوڕهێنەرو قۆشمە, چەشنە قاقایەکی ناڕوون, کە لە کۆتاییدا خۆی تێدەگات. یان هەرچۆنێك بێت خۆی دەشکێنرێت, بەڵێ, زیاتر لەوەی تێدەگات, دەشکێنرێت.

بەو حوکمەی من زانکۆکارو ئوستادی فەلسەفە بووم, ئەوا ئەوەی لە گوتار ماوەتەوە, لە گوتاری فەلسەفی تەقلیدی, لەو کارەدا کە دەربارەی شێتی کردم, بێزاری دەکردم, لێرەدا شوێنەوارێکی هێگڵ دەبینینەوە, ئیبرازکردنی شتگەلێکی بێبەهای وەکو راپۆرتەکانی پۆلیس, ئیجرائاتی دەسبەسەرکردن, قیژەی شێتەکان, بەس نین بۆ چوونە دەرەوە لە فەلسەفە.

لە توندو تیژییەکەی باتایدا, لە شیرینی فریودەرانەو نیگەرانی بلانشۆدا, لە لولپێچەکانی کلۆسۆڤسکیدا, شتێك هەبوو کە لە هەمان کاتدا لە فەلسەفەوە دەهات, ئەویش بەکاری دەهێناو دەیخستە بەر لێپرسینەوە, پاشان لێی دەچووە دەرەوەو دەگەڕایەوە... شتێك هەیە, وەك تیوری موعانات لای کلۆسۆڤسکی بە ژمارەیەکی زۆری داوەکان فەلسەفەی خۆراوایی رادەکێشێت, پاشان لە رێگای هونەری فرێدانە دەرەوەوە بە تەواوی لێی دەچێتە دەرەوە, هەروەها لە رێگای داڕشتن و ئەو شێوازەشەوە کە بە پێی ئەو لە Baphomet دا, کاردەکات:

ئەم هاتن و چوونە لەسەر لێواری فەلسەفە خۆی وادەکات سنوری نێوانی فەلسەفی و نافەلسەفی قابیلی سمین بێت, واتە لە کۆتاییدا بەهای نیە.

* ئەم چاوپێکەوتنە لە لایەنی رۆجەر پۆڵ دۆزواوە ئەنجام دراوەو, لە رۆژی 3ی ئەیلولی ساڵی 1986دا لە رۆژنامەی لۆمۆندا, دوای دووساڵ لە کۆچکردنی فۆکۆ, بڵاوکراوەتەوە. لێرەدا فۆکۆ رای خۆی دەربارەی ئەدەب و رێگاکانی رزگاربوون لە سنوری داخراوی فەلسەفە دەردەبڕێت.

وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: محەمەد میلاد / تونس

سەرچاوە:

مجلة: العرب و الفكر العالمي, العدد التاسع ـ شتاء 1990.





# دیدارێك لەگەڵ كلۆد لیڤی شترۆس

**سازدانی: فرانسوا دۆس**

"هیچ شتێك هێندەی ئەوە قێزەوون نیە كە لە ناو سیستمە ئاسنینەكانی بیركردنەوەدا دابخرێیت"

*** سكالاتان دەبیسترێت لە دەستی ئەو بارو دۆخەی كاری تێدا دەكەن.**

ـ نەمویستووە باسی حاڵەتێكی شەخسیی بكەم, بە قەدەر ئەوەی ویستوومە ئاماژە بكەم بۆ سەمەرەیی سیستمی فەرەنسی. بۆ نمونە لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا, ئەو ئوستادەی خانەنشین دەكرێت, هەموو ئەو شتانەی بۆ دەمێنێتەوە كە ئاسانكاریی بۆ دەكەن تا لە كارەكەیدا بەردەوام ببێت. بەلام لە فەرەنسا كاتێك ئوستاد خانەنشین دەبێت, ئیتر هەموو شتێك كۆتایی دێت. هەرچی شتێك كارەكەی بۆ ئاسان كردبێت, هەمووی لیێ وەردەگیرێتەوە. من شتێك لە بریندارکردن لەمەدا دەبینم. سەبارەت بە خۆشم, من سكالام نیە, هێشتا هەر لە كارگەی ئەنترۆپۆلۆجیای كۆمەلایەتیدا كاردەكەم, كە بیست ساڵ لەمەوبەر خۆم لە كۆلیج دۆفرانس دامەزراندووە. لەم دواییانەدا لە دانانی كتێبێك بومەوە, بێشك





دەستنوسەکەی بە خەتێکی ناخۆش نوسراوەو سکرتێری تایپێستیشم نیە.. هەمیشە نارەحەتیی بچووکی لەم بابەتە هەیە.

*** ئەو کتێبە.. کارێك نیە دەربارەی پەیوەندییەکانی نێوان ئەنترۆپۆلۆجیاو دەرونشیکاریی؟**

ـ نەك هەمووی. کارێکە تێیدا بەشێوەیەکی سەرپێیی دەستدەبەم بۆ ئاخاوتنم لەگەڵ دەرونشیکارییدا, بەڵام جێگەیەکی سێنتەریی داگیر ناکات.

*** ئەوە ئاخاوتنێکە لەوەتەی دەستتان کردووە بە نوسین بەردەوامە, لە کتێبی "مەدارە غەمگینەکان" فرۆید وەکو سەرچاوەی سرووش پێشکەش دەکەن, کەچی کاتێك جەخت دەکەن کە دەرونشیکاریی راڤەی هیچ ناکات, چونکە هەموو شتێك دەباتەوە بۆ سەر چێژ, ئێوە لەگەڵ دەرونشیکارییدا توندن. هەڵوێستی ئەمڕۆتان چیە؟**

ـ پێویستە سێ مەسەلە لەیەکتری جیابکەینەوە. یەکەم لایەنی سەرگوزەشتەی خود لەو کارەدا هەیە. من زوو بوونی دەرونشیکارییم زانی, کاتێك قوتابی بووم لە قوتابخانەی ئامادەیی. لە نێوانی سالانی 1925 و 1930 دا, ئەوەی ئەو کاتە لە کارەکانی فرۆید کرابوو بە فەرەنسی, خوێندوومنەتەوە. بۆیە فرۆید رۆڵێکی هەبووە لە پێکهاتەی فیکرییمدا. دووەم پێرەوەکەی فرۆید بە نیسبەتی منەوە شتێکی جەوهەریی تێدا بووو مەبەستم لە زەرورەتی فراوانکردنەوەی چوارچێوەی عەقڵانییەتی دێرین و رەچاوکردنی ئەوەی چەند بوارێك بۆ فیکر هەن کە دەشێت سەرباری ئەو یاخیبوونەی دژی هەر لێکدانەوەیەکی لۆجیکییانە, پێوەیان دیارە, دەشێت ملکەچبکرێن بۆ شیکردنەوەی ورد. ئەمەش وانەیەکی بنەڕەتی بوو بۆ من, هەمیشە کارم پێی کردووە. پاشان خاڵێکی سێهەمیش هەیە ئەویش ئەوەیە دەرونشیکاریی ئامێرێکی چارەسەرکردنە کە هەست بە گومانێکی زۆر دەکەم بەرامبەری. لە لایەکی تریشەوە دەتوانم بڵێم فرۆید شتێکی سەرەکیی فێر کردووم ئەویش ئەوەیە ئەو یەکێکە لە هەرە دەگمەنترینی ئەو بیریارانەی زانیویانە چۆن بە زاراوەو وێنەکانی ئەفسانەکان بیردەکەنەوە. ئەوەی فرۆید کردویەتی ئەوەیە چەند ئەفسانەیەکی گەورەی لە واقیعدا دروست کردووە. سەرلەنوێ لێکدانەوەی

**ئەفسانەی ئۆدیپۆس[1] , چەشنێکی لاوەکیی ئەفسانە ئەسڵییەکەیە. هەمان شتیش بۆ ئەوەی دەربارەی ئەفسانەی پرۆمیسیۆس[2] و لایبرینس و پەیمانی دێرین[3]**

---

[1] ئۆدیپۆس Oedipus لە میتۆلۆجیای یۆنانیدا, پادشای سێبەسە, کوری لایۆسی پادشای سێبەسە و دایکی ناوی جاکارتایە. جادووگەران بە لاوسیان راگەیاند کە کوڕەکەی خۆی دەیکوژێت و ژنەکەشی مارە دەکاتەوە. ئەویش بۆ ئەوەی لە چارەنوسەکەی هەڵبێت, دەستوقاچی کوڕە ساواکەی دەبەستێت و لەناو چیاکان جێی دەهێڵێت بۆ ئەوەی بمرێت. بەڵام شوانێك فریای دەکەوێت و دەیدات بە پۆلیبۆسی پادشای کۆرینس, ئەویش ناوی دەنێت ئۆدیپۆس (واتە لاق هەڵاوساو), وەکو کوڕی خۆی گەورەی دەکات. کوڕەکە نەیدەزانی کە هەڵیانگرتەوە, بۆیە کاتێك باسی قسەی جادوگەرەکەی بۆ دەکەن, کۆرینس جێدەهێڵێت. لە رێگا دەگات بە شا لایۆس پاسەوانەکانی و وا دەزانێت رێگرن, پەلاماریان دەدات و لایۆس دەکوژێت. بەتەنهاو بێکەس و بێ خانە دەگاتە سێبەس. لەوێ دەبینێت درنجێك کە ناوی سفینیکسە, شارەکەی تۆقاندووەو لەسەر رێگای شارەکە دانیشتووە, هەرکەسێك بەوێدا بڕوات, پرسیارێکی لێدەکات, ئەگەر وەڵامەکەی نەزانێت هەڵی دەلوشێت, پرسیارەکەش ئەمەیە: ئەوە چیە بەیانی لەسەر چوار قاچ دەڕوات و نیوەڕۆ لەسەر دوان و ئێوارە لەسەر سیان؟ وەڵامەکەشی مرۆڤە کە بە ساوایی گاگۆڵکێ دەکات و بەلاوی بە دوو پێ دەڕوات و بە پیریش گۆچان هەڵدەگرێت. ئۆدیپۆس مەتەڵەکە هەڵدەهێنێت و درنجەکەش خۆی دەکوژێت. خەڵکی سێبەسیش کە وایان دەزانی دزوجەردە پادشاکەیانی کوشتووە, لە خەڵاتدا ئۆدیپۆس دەکەن بە پادشای خۆیان و جاکارتاشی لێ مارە دەکەن. چەند ساڵێك بە خۆشی دەژین و نازانن کە دایك و کوڕن. پاشان پەتایەکی کوشندە لەشاردا دادەکەوێت, جادوگەران دەڵێن پێویستە بکوژی لایۆس سزا بدرێت, ئینجا پەتاکە دەڕەوێتەوە. ئۆدیپۆسیش بۆی دەردەکەوێت کە باوکی خۆی کوشتووەو دایکیشی مارە کردۆتەوە. جاکارتا خۆی دەکوژێت, ئۆدیپۆسیش دەزانێت کە چی کردووەو منداڵەکانیشی بەر نەفرەت کەوتوون, هەردوو چاوی خۆی دەردەهێنێت و دەسبەرداری تەختی پادشایەتی دەبێت. چەند ساڵێك لە سێبەس دەمێنێتەوەو پاشان دەری دەکەن. ئەپۆڵۆ پەیمانی پێدەدات کە ئەو خاکەی تێیدا دەمرێت پیرۆزە. ئیتر لەگەڵ ئەنتیگۆنی کچیدا چەند ساڵێك شاران دەگەڕێن و سەرەنجام دەگەنە کۆڵۆنۆس کە مەزارێکی پیرۆز دەبێت لە نزیکی ئەسیناو تەرخانە بۆ ئیمێندێسی خوداوەند, لەوێدا گیانی دەردەچێت.

[2] پرۆمسیسۆس Prometheus لەمیتۆلۆجیای گریکییدا, یەکێکە لە زەبەللاحەکان Titans, وەکو هاوڕێی و پەروەردەکەری مرۆڤایەتی ناسراوە, کوڕی ئایاپیتۆسی زەبەللاحەو دایکیشی کلیمنی Iapetus حۆری دەریایە, هەندێك دەڵێن نەخێر دایکی ناوی سیمینسەو Themis





نوسیوێتی. ئەوانە چەشنی ئەفسانەیین کە شایستەی نرخاندنن, بەڵام من پێموانیە فرۆید دەخەنە سەروو یان دەرەوەی ئەفسانەوە.

*** ئەگەر دەرونشیکاریی یاریدەی دابن بۆ لێکۆڵینەوە لە نەستی کۆمەڵگاو دۆزینەوەی چەند مەسەلەیەکی بەهادار بۆ دیاردەکانی, وادیارە ئامانجی بنەڕەتیتان بریتی بووە لە دۆزینەوەی ئەو شێوازەی کە رۆحی مرۆیی کاری پێدەکات. پێموایە ئێوە هەست بە گەشبینی ناکەن دەربارەی توانای ئەنترۆپۆلۆجیای کۆمەڵایەتی لە بەدیهێنانی ئەم مەبەستەدا.**

ـ پێموایە ئێمە بەشدارییەکی پەرتیی دەکەین لە چاککردنی زانینەکانماندا دەربارەی ئەو شێوازەی کە رۆحی مرۆیی کاری پێدەکات. بەڵام ئێمە تەنها نین لەمەدا, بە دڵنیایی ئێمە کلیلەکانی چارەسەری گرفتەکە شك نابەین. وەڵامەکە لای نەشتەرگەرانی مێشکە.

*** مەبەستان لەوەیە کە وەڵامەکە لە زانایانی بایۆلۆجیاوە دێت؟**

---

ئەویش وەکو هاوسەرەکەی لە زەبەللاحەکان بووە.. پرۆمیسیۆس و ئیمپیتیۆسی برای ئەرکی خولقاندنی مرۆڤیان خرابووە سەرشان و ئەو گیانەوەرو ئامێرانەیان بۆ ئامادەبکەن کە پێویستیان پێانە, هەروەها بەشی گوزەرانکردنیش بەهرەو زیرەکییان پێ ببەخشن. دوای تەواو کردنی ئەرکەکانیان, ئینجا پرۆمیسیۆس دەشێت بۆ جیهانی ژێرەوەو لەوێ مەشخەڵێك بەگڕێ خۆر دادەگیرسێنێت و دەیهێنێتەوە بۆ مرۆڤ و فێری ئاگریشیان دەکات. بەمەش زیۆسی گەورەی خوداکان لێی تووڕە دەبێت و بەکۆت و پێوەندکراوی دەینێرێت بۆ بەردی کۆکیسێس و داڵێکیشی بۆ نارد بۆ ئەوەی وردە وردە بیخوات, هەتا هیراکلیس فریای دەکەوێت و رزگاری دەکات.

[3] کتێبی پیرۆز Bible, بریتیە لە کتێبی ئاینیی جولەکە( تەورات) و مەسیح ( ئینجیل). تەورات و ئینجیل لەیەکتریی جیاوازن. تەورات سی و نۆ کتێبە و هەموویان لەئەسڵدا بەزمانی عیبریی نوسراون, جگە لەچەند بەشێکی کەمی کە بەزمانی ئارامیی نوسراوە . ئینجیل دوو بەشە, پەیمانی دێرین و پەیمانی نوێ کە بیست و حەوت کتێبە. پەیمانی دێرین لەلایەنی دوو قوتابیی مەسیحەوە نوسراوەتەوە, کە ئەمیان بەتۆزێك لێ زیادکردنەوەوە, لەگەڵ حەوت کتێبی تردا, تەورات پێکدەهێنن.





ـ ئێمە لە قۆناغێكی تێڕامانداین كە وردە وردە ئەو سنورە سەپێنراوانەی سەرمان دەسـڕێتەوە, ئەوانـەی ئێمـە لـە زانسـتە سروشـتییەكان و زانسـتەكانی مـرۆڤ جیادەكەنەوە. ئەو سنورانە دەڕەونەوە چونكە هەریەكە لە زانستە سروشتییەكان و زانستەكانی مرۆڤ یەك یەكتریی دەپیتێنن.

*** لە سەرەتادا ئۆمێدی ئێوە بریتی بوو لەوەی بـە هـۆی ئـەنترۆپۆلۆجیاوە ئـەم لێكجیابوونەوەیـە بەزێنیت.**

ـ بەڵێ. تا رادەیەك دەمەوێت بیبەزێنم ئەگەر بە چەند ملیمەترێكیش بێت.

*** چەند رۆژێك لەمەوبەر " ج . مـالوری" لـە رۆژنامـەی لۆمۆنـددا پرسـیار لـە سـودی زانسـتە كۆمەڵایەتییەكان دەكات. كاتێك گرفتی دورگـەكانی كالیـدۆنیا تەقییـەوە, وای وت, هـەروەها وتیشی دەسەڵاتی سیاسی و پیاوانی بڕیار ئاگایان لە كاری پسپۆڕان نیە.**

ـ حیكایەتێكی بچكۆلەت بۆ دەگێڕمەوە. ئەو كارگە ئەنترۆپۆلۆجییەی بیست ساڵ لەمەوبەر دامەزراندووە. ئامێرێكی گەورەی كاركردنی تێدایە كە زانكۆی ییل لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بەرهەمی دەهێنێت. ئەم ئامێرە بریتیە لە ملیۆنان بیتاقەی چەندان كتێبی تەواو كە دێر بە دێر ژمارەیان لێدراوەو پێڕستێكیشی هەیە كە دنیایـەك وردەكـاریی گرتۆتـە خـۆی و لـە كـاتی پرسـیاركردندا دەربـارەی هـەر ناوچـەیەكی جیهـان, لـە ماوەیـەكی كورتـدا چـەند زانیارییـەكی بـاش دەدات. بیست دانە لەم ئامێری كاركردنە لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئـەمریكا هەیـە, یـەكێكیش لە یابان و یەكێكیش لە فەرەنسا كە دیاری یۆنسكۆیە, بە هۆی ئیشتیراكێكی ساڵانەوە بـۆ وەدەسـتهێنانی زانیـاریی نوێـوە, سـاڵ لـە دوای سـاڵ دەوڵەمەنـدتر دەبێـت. ئـەم ئـامێرە خراوەتـە بەردەسـتی ئێمـە. لـە ویلایەتـە یـەكگرتووەكانی ئـەمریكادا هـیچ روداوێـك لـە جیهانـدا روونـادات بـێ ئـەوەی وەزارەت یـان وەكالـەتی تایبـەت بـەو روداوە, پرسیار لـەم ئـامێرە نـەكات. بەڵام ئێمە, لەو كاتەوە كە ئامێرەكەمان هەیە, واتـە لـە بیسـت سـاڵ لەمەوبـەرەوە, هـیچ دامـەزراوێكی فەرەنسـی هـیچ پرسـیارێكی ئاڕاسـتە نـەكردووە. ئێمـە لـەم ئـامێرەدا بەرپرسـیارین لـە لـە بیتاقـەكانی زانیـاریی تایبەت بە سـەرجەمی ئـەوروپا. ئەمـەش مانـای ئەوەیـە لێكۆڵـەری ئـەوروپیمان هەیـە





کە دێن بۆ کارکردن, بەڵام هیچ پرسیارێکی تایبەت بە هیچ گرفتێکی ئەوروپاییمان لە لایەنی هیچ وەزارەتێکی فەرەنسییەوە لێنەکراوە.

*** ئایا ئەمە مانای خۆگێلکردن لە یەکتریی نیە.. ئەو خۆگێلکردنەی هەمان خۆگێلکردنە کە لە مێژووی پووکانەوەی کۆلۆنییە فەرەنسییەکاندا دەیبینینەوە, کە مێژوویەکی بە ئازاریشە.**

ــ نابێت زێدەڕۆیی بکەین لە حوکمدانی نەرێ بەسەر ئەم گۆشەنیگایەدا. دەڵێم پسپۆڕیی گەورە فەرمانبەرانی فەرەنسە کەمبایەخترە لە بایەخی هاوەڵە ئەنگلۆ ـ ساکسۆنییەکانیان, ئەوانە رۆشنبیرترن, وەلێ فەرمانبەرانی ئێمە پێیان وایە دەتوانن بە تەنها هەر خۆیان و بێ هانابردن بۆ کەس بیرو بۆچوونەکانی خۆیان دروست بکەن.

*** لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە مەسەلەی پرەنسیپێکە تایبەتە بە رەفتارێکی دیاریکراو بەرامبەری ئەویتر یان ئەوەی کە ئێمە نین.**

ـ من حەزم لە حوکمە رووتەکان نیە و لە کۆتایی ژیانمدا دەڵێم هیچ شتێك هێندەی ئەوە قێزەوون نیە کە لەناو سیستمە ئاسنینەکانی بیرکردنەوەدا دابخرێیت.

*** لەگەڵ ئەوەشدا, لە موحازەرەکانتدا لە رێکخراوی یۆنسکۆ دەربارەی سێکس و مێژووو جەختت لەوە کرد کە دەوڵەمەندیی شارستانێتییەك لە پەیوەندیکردن بە جیاوازەوە دێت, لە کاتێکدا کە تەمەڵیی لە گۆشەگیرییەوە دەکەوێتەوە. کاتێك ئەمەم بیست, وتم بێشك ئێوە لایەنگیری فرەچەشنین, بەڵام لە کۆتایی موحازەرەکەدا وتتان, کە رەنگە مەحاڵیی پەیوەندیکردن بەویترەوە بریتی بێت لە نرخی ئەوەی هەموو خێزانێکی رۆحیی لە مرۆڤایەتیدا, سیستمی بەهاکانی خۆی بپارێزێت, ئەمەش شتێکی سەیرەو مایەی حەپەسانە, ئەگەر ناکۆکیەکیشی نەگرتبێتە خۆی؟**

ــ لە راستیدا من هەردوو مەسەلەکەم وت, بەڵام خەڵکێك هەیە تەنها نیوەی ئەوە دەبیستن کە دەیڵێم, من پێویستیم بەوە بوو سەرنج رابکێشم بۆ رووە شاراوەکەی مانگ. لە هەمان ئەو موحازەرانەدا باسی زەرورەتی بوونی ئاستێکی ئەوپەڕی هەمەچەشنیی کۆمەڵگا مرۆییەکان دەکەم. راستە ئەو کۆمەڵگایەی بە داخراویی بەسەر خۆیدا دەژی کۆتاییەکەی دەگاتە رەقهەڵاتن و وشکبوونەوە. بەڵام لە لایەکی





تریشەوە ئەو کۆمەڵگایەی بە تەواوەتی بەسەر هەموو بە ها کۆکەڵایەتییەکاندا یان کەلتورە جیاجیاکاندا دەکرێتەوەو هەموویان لە هەمان ئاستی بەهاو کەلتورەکەی خۆیدا دادەنێت, کۆمەڵگایەکە رۆحی خۆی لە دەستداوە. من پێموایە ئەوەی ناوی دەنێم ئاستی ئەوپەڕی پەیوەندی. لە سەدەکانی شازدەو حەڤدەو هەژدەیەمدا بەو ئاستە گەیشتووین, کە لەو کاتەدا پێکگەیشتن لە نێوانی گەورە بیریاراندا بوو, بەڵام پێویستە ئەوەت لە بیر نەچێت کە لەو سەردەمەدا پۆستە خێرا نەبووە. کاتێك هەبوو بۆ تێڕامان و وەڵامدانەوە. دەبێت کەلتورەکان پەیوەندیی بە یەکەوە بکەن, بەڵام بە هێواشی و لەسەر خۆ و بە زاڵبوون بەسەر بەرەنگاریی شەریکی گفتوگۆکەدا, بۆ ئەوەی هەموو ئەمە ببێت بە شتێکی ئەرێ.

*** لەگەڵ ئەوەشدا ئایا سڵ لەوە ناکەنەوە کە لە کاتی زێدەڕۆییکردن لە پشتبەستن بە زانستی جیناتیك لە ئەنترۆپۆلۆجیادا, گورگ بکەنە ناو تەویلەی مەڕەکانەوە؟**

ـ هیچ زێدەڕۆییەك نیە کاتێك دەڵێین بڕێکی زۆری زانیاریی هەیە کە بیست ساڵی رابردوو لەگەڵ سەرهەڵدانی زانستی جیناتیکی گەلاندا, بە خۆیەوە بینوێتی. گەرچی ویستیشمان بە زاراوەکانی پانی و درێژیی ئێسکەکانی کەللەسەرو توورەهاتەکانی تر, بەردەوام بین لە لێکۆڵینەوەی گرفتەکانی جیاوازیە جەستەییەکان لە نێوانی رەچەڵەکەکاندا...

*** ئێوە کۆمەڵگا بەرایەکان کە پشت بە هاوڕایی دەبەستن, و کۆمەڵگا نوێیەکان, ئەوانەی بەپشتبەستن بە تایبەتمەندێتی ئەرکەکان و دەسەڵاتی خودسەربەخۆو جیا لەوەی کۆمەڵایەتییە, کاردەکەن, لە یەکتریی جیادەکەیتەوە, ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە لای ئێوە پێکەوە نەگونجانێك هەیە لە نێوانی مۆدێرنیزم[4] و دیموکراسیدا؟**

---

[4] مۆدێرنیزم Modernism بریتییە لەهەوڵێك کە لەلایەنی گرووپێك لێکۆڵەرلەتیۆلۆجیاو فەلسەفەدا, بۆ سەرلەنوێ پێناساندنەوەی پێڕەوی مەسیحیی بەبیری زانستییانەی سەدەی نۆزدە. گەرچی هەموو هەوڵەکان بەسەریەکەوە لەیەك دانە سیستم و یەك بواردا کۆناکرێنەوە, بەڵام لەساڵی 1907دا, لە لایەنی پاپا پیۆسی دەیەمەوە, ئەم ناوەی لێنرا. دواجار مۆدرێنیزم





ـ ناتوانین بڵێین ئەو کۆمەڵگایەی هاوڕایی تێدایە, لەناوماندا هەیە. ئەوە بۆ نموونە لە کۆنگرەکانی حیزبە سیاسییەکاندا هەیە, کە لەوێدا گرفتە قووڵەکان حەواڵەی لیژنەکانی بڕیاردان دەکەن, کە ئەوانیش کار بۆ ئەوە دەکەن بگەنە شتێك کە هەموان لەسەری کۆك بن. لێرەش لە کۆمەڵگا پیشەسازیی یان بازرگانییەکاندا روودەدات. بێشك لەسەر ئاستی نەتەوەیی ئەمە شیاو نیە, چونکە کۆمەڵگاکانمان ئاڵۆز بوون و جوڵاندنیان زەحمەتە. بەڵام لەناو کۆمەڵگاکانماندا کۆمەڵگای بچووکتریش هەن کە ئەم تەرزە بونیادانە تێیاندا بەردەوامە.

*** ئێوە دوودڵن لە نێوانی داکۆکیکردن لە مرۆڤدۆستییەکی نوێی گشتی کە زانای ئەنتۆلۆجیا هەڵیگرتووەو باسی ئاشتبوونەوەی نێوان مرۆڤ و ئەویتر یان سروشت دەکەیت, بەڵام لە هەمان کاتیشدا بەرەو ئەوە مل دەنێن کە سێنتەریەتی مرۆڤ پووچەڵ بکەنەوە بەوپێیەی جیهان بێ ئەو دەستی پێکردووەو بێ ئەویش کۆتایی پێدێت. میشیل فۆکۆش دەستخۆشی لەو پێداچوونەوە رادیکاڵانەیە بە مرۆڤ و مرۆڤێتیدا, کرد کە ئێوە لە توێی ئەنترۆپۆلۆجیاوە کردووتانە, کە ئەو پێی وایە شێوازێکی بیرکردنەوەی کۆنەو سەر بە سەدەکانی ناوەڕاستە.**

ـ نازانم, رەنگە دوودڵ بووبێتم, لە کۆتاییدا منیش مرۆڤم. هەموو ئومێدم ئەوەیە مەیلی مرۆڤدۆستی لەوە زیاتر میانڕۆ بێت و درك بەوە بکات کە باشترین شێواز بۆ داکۆکیکردن لە مرۆڤ لەوەدا نیە کە لە سەرباقی ئەوانی تر دابڕێت, بەڵکو بەوەی بخرێتە ناو باقی بونەوەرەکانی ترەوە. رێزگرتن لە مرۆڤ بە رێزگرتن لە ژیان دەستپێدەکات. پارێزگاری لە مرۆڤ ناکرێت و داکۆکی لێناکرێت بە هاوکاریی لەگەڵ هەموو چەشنە زیندووەکاندا نەبێت.

*** بێشك, بەڵام ئێوە دەگەنە گومانکردن لە توانای مرۆڤ لە دروستکردنی مێژووی تایبەتی خۆیدا.** ئەوپەڕی دانایی ئەوەیە مرۆڤ هەمیشە دڕدۆنگ بێت بەرامبەری ژمارەیەکی دیاریکراوی بتەکان کە یەکێکیان .. عەقڵی خۆیەتی.

---

هەموو بوارەکانی تری بیرکردنەوەو ئەدەب و هونەرو بیناسازیی و نیگارکێشان و سیاسەت و ... هتدیشی گرتەوەو مانای نوێکردنەوەو بەهاوچەرخکردنی وەرگرت.





*** تێڕوانینتان بۆ مێژوو تێڕوانینێکی زۆر رەخنەییانەیە. لە کتێبی "بیری کێوی" دا دەڵـێن مێـژوو بەرەو هەموو شتێك دەچێت بەو مەرجەی لێی بچینە دەرەوە. ئەو رەوشە چیە کە ئێوە دەیدەن بـە مێژوو؟ ئایا پێویسـتییە یـاخود پەرتێتییـە, یـان تەرەفدارییـە یـان سـاختەکردنە؟ ئایـا لای ئێـوە کەمکردنەوە لە پایەی مێژوو ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ملکەچ نیە بۆ تەدارەکی لەقاڵبدان کـە خـۆی یەکێکە لە خەسڵەتەکانی ئەنترۆپۆلۆجیا؟**

ـ من زۆرتـرین رێـز لـە مێـژوو دەگرم. لەوانەشـە سەرسـامت بکـەم ئەگـەر بڵـێم مـن بـە کـردەوە هـیچ ناخوێنمـەوە کـارە مێژوویـیـەکان نـەبێت. چـیتر نـاتوانم رۆمـان یـان کتێبـەکانی فەلسـەفە بخوێنمـەوە, یاداشـتنامە دەخوێنمـەوە, یـان کتێبـی مێـژوو نوسەکان دەخوێنمەوە, تەنها ئەوان دەتوانن هەستی رەزامەندیم لا دروست بکـەن لـە کۆمەڵگایـەکی ... ئـەم هەسـتکردن بـە رەزامەندییـەی کـە زانـای ئـەنترۆپۆلۆجیا لـە گەڕان بە دوایدا زۆر دوور دەکەوێتەوە. رەنگە لێم بپرسیت کەواتە من رەخنە لـە چـی دەگرم. من رەخنە لە مێژوو ناگرم, بەڵکو رەخنە لە فەلسەفەی مێژوو دەگرم یان ئـەو فەیلەسوفانەی ویستوویانە رەوشێکی دیاری بدەنێ.

**واتە ئەوانەی مانای دەدەنێ؟**

ــ هەنـدێك مێـژوونووس هـەن پێیـان وایـە کـە مێـژوو جووڵـە یـان مانـای هەیـە, هـی تـریش هـەن کـە پێیـان وانییـە, مـن لەمانـەم. ناتوانرێـت دیوارێـك بـە دەوری مێـژوودا بکێشرێت چونکە دەمانخاتە بەردەمی پێویستیی رەهاوە. مەحاڵە لەبـەردەم سـاتێکی ئێستادا بڵێین سبەینێ چی دەبێت.

*** هەست ناکەن جووڵەی مێژووی نوێ, جوڵەی قوتابخانـەی سـالانە, شـۆڕەتی سـەرکەوتنی لێ زەوت کردوون؟ ئێوە بە مانایەك لە ماناکان وەکو باوکی ئەو جولانەوەیە وەهان.**

ـ ئەمە زۆر رۆیشتنە. قوتابخانەی سالانە لە ساڵی 1929 دا دامەزراوە, ئەو کاتە من لە سۆربۆن قوتابی بووم. بیرمە لە ساڵی 1950دا لە نیویۆرك بووم بـۆ بەشداریکردن لـە بازنەیـەکی وانەوتنـەوەدا دەربـارەی ئـەنترۆپۆلۆجیا, لـەکاتی دەمەتەقێـدا بـە بـێ وریاییـەکی زۆر وتم ئـەوەی زانایـانی رەچـەڵەکەکان دەیکـەن بریتیـە لـە پشـکنینی سـەبەتەی خـۆڵی مێژوونووسـەکان. ئـەوە ئابڕووچـوون بـوو, ئـەو وتەیـە نـاڕەزایی





هەمووانی وروژاند. دوای دەمەتەقێکە مارگرێت مید[5] هاتە لام, پێش ئەو کاتە بە ماوەیەکی کورت ناسیبووم, پێی وتم هەندێك وشە هەیە باش وایە هەرگیز نەوترێن. لەو ماوەیەدا ئەوە راست بوو. گەلێك شت هەبوو کە لای مێژوونوسان گرنگ نەبوو, بەڵام بۆ ئێمەی زانایانی رەچەڵەکەکان, نانی سپی بوو. مێژوونووسەکانیش درکیان بەوە کردو پێیان لێنا کە ئێمە لەسەر حەقین. ئەوەی ئیمرۆ پێی دەوترێت ئەنترۆپۆلۆجیای مێژوویی شانبەشانی ئەنترۆپۆلۆجیای کۆمەڵایەتی یان کەلتوریی دەڕوات. ئەمەشە بابەتی موحازەرەکانم دەربارەی مارك بلۆك و هەوڵیشمدا لەوێدا روونی بکەمەوە کە لە کاتێکدا جووڵەی مێژووی نوێ...

*** جل و بەرگەکانتان دەدزێت..**

ـ هەرگیز, بگرە دەیسەلمێنێت کە ئێمە لەسەر حەقین لە بایەخدانماندا بە هەموو ئەو شتە بچووکانەی کە زانای رەچەڵەکەکان بایەخی پێدەدات, دەستیشمان کرد بە بایەخدان بەو بوارانەی جوڵانەوەی مێژووی نوێ بایەخیان پێنادات, وەکو هاوپەیمانێتییەکانی خێزانە فەرمانڕەواکان و پەیوەندییەکانی خزمایەتی لە نێوانی خێزانە گەورەکاندا.. واتە هەموو ئەوەی ئیمرۆ بایەخی زانا لاوەکانی زانستی رەچەڵەکەکان دەوروژێنێت. کەواتە رووبەڕووبوونەوەو بەردەوامی هەیە لە نێوانی جوڵانەوەی مێژووی نوێ و زانستی رەچەڵەکەکاندا.

*** کەواتە دەشێت بڵێین ئێوە سەرکەوتنتان بەدەستهێناوە, چونکە مێژوونووسانیش کەوتنە ئەوەی بایەخ بدەن بە زانستی رەچەڵەکەکان, دوای ئەوەی ئێوە کارەکانی خۆتانتان بڵاو کردەوە,**

ــ سوپاس بۆ خودا. ئەوانەی پشت بە حاڵەتەکانی رابردووی کۆمەڵگاکانمان دەبەستن, لە ئێمە باشتر ئەوە دەزانن. من رقم لە ئاڕاستەی هاوەڵە ئەمریکییەکانە, ئەوانەی دان بە کاری ئەنترۆپۆلۆجیای سەردەمێکدا دەنێن کە تێپەڕیوە, بە پشتبەستن بە هەندێك کتێب کە بە رێکەوت دەستیان دەدرێتێ, هەروەها بێ ئەوەی

---

[5] مید, مارگرێت Mead, Margaret (1901-78), ژنە ئەنترۆپۆلۆجیستێکی ئەمریکییە, شۆرەتێکی زۆری هەیە بۆ ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر کۆمەڵگا بەراییەکان کردوونی, لەگەڵ بەشداریکردنی بەرچاویدا لە ئەنترۆپۆلۆجیای کۆمەڵایەتییدا.





زانینی مێژوویی یان پێکهاتەی زانستیی مێژووییان هەبێت. بیرمە هەمیشە بەو تیمەم دەووت کە لەگەڵیدا لە لێکۆڵینەوەی گوندێکی فەرەنسی کارم دەکرد: هەرگیز بیرتان نەچێت ئێمە کاتێک لێکۆڵینەوەکەمان دەربارەی کۆمەڵگایەکی خۆراوایی دەکەین کە ئەرشیفی خۆی هەیە، ئەوا 90٪ ی ئەوەی دەشێت بیزانن لە مێژووەوە وەرگیراوە، بەوپێیەی ئێوەش لێکۆڵەری زانستی رەچەڵەکەکانن، ئەوا 10٪ ی باقییەکەی بۆ زیاد دەکەن، بەڵام ئەوەی تایبەتە بەو کۆمەڵگایانەی سیستمێکی نوسینیان نیەو بەوەش ئەرشیفێکیان نیە، ئەوا رێژەکە بە تەواوی پێچەوانە دەبێتەوە.

*** چۆن ئەوە لێکدەدەنەوە کە ئێوە هیچ قوتابخانەیەکتان دانەمەزراندووە، سەرباری زیادبوونی بایەخدان بە گوتاری ئەنترۆپۆلۆجی و قوتابخانەی ساڵانەش بووە بە خاوەنی پایەی خۆی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا، بگرە توانیوەتی پایەیەکی سێنتەرییش بەدەست بهێنێت.**

ــ ئەوە چەند هۆیەکی هەیە، یەکەم لە سەردەمە زۆر دوورەکانەوە، لە زانکۆ فەرەنسییەکاندا، مێژوو وەکو زانستێك هەموو مافەکانی خۆی هەیەئامێر یان ئامرازی لێکۆڵینەوەی هەیە. بەڵام ئەتنۆلۆجیا ئامرازی نیە. دووەم لە لێواری جەنگی جیهانی دووەمدا، لە زانکۆکانی فەرەنسادا کورسییەك بۆ ئەتنۆلۆجیا نەبوو. ئەمەش دواکەوتنێکی زۆرە. لە ئەنجامی ئەوەشدا، کاتێك لە ساڵی 1925 بە دواوە ئەتنۆلۆجیا وەکو لقێکی ئەکادیمیی کەوتە چەکەرە کردن، هەر لێکۆڵەرێك لە رەچەڵەکەکان هەوڵیدا شانشینی بچووکی خۆی هەبێت، بەمەش هێزی دەرکەر بەسەر هێزی کێشکەردا زاڵ بوو. سێیەم، لە مردنی ریڤێتەوە، یان خانەنشینکردنیەوە لە ساڵی 1948 دا، چیتر لە نێوەندی ئێمەدا ئەو جۆرە پیاوانە نەماون کە توانای رێکخستنیان هەیە، وەك چۆن ل . لۆڤیڤەر و برۆدوێل لە دوای ئەو کردیان.

*** وادیارە بە نیسبەتی ئێوەوە ئاستی سیاسی ئاسۆیەکی مردووە، یان لانیکەم لە کارەکانتاندا. ئایا ئەمە بایەخنەدانە لای ئێوەوە، یاخود سیاسەت لە لێکۆڵینەوە بونیادگەراکانتاندا جێگەی نابێتەوە؟**





ــ پێموایــە جیهـانی خـۆراوا لــە ناوەڕاسـتی سـەدەی هـەژدەوە تـا جـەنگی یەكـەمی جیهـان لەسـەر ئـەم وەهمـە یـان خەونـە ژیـاوە كـە دەشـێت سیاسـەت بابـەتێك بێـت بـۆ تێڕامـان و گـەورە بیریـارانیش دەتـوانن كـۆنترۆڵی بكـەن. لـە لاویمـدا مومارەسـەی چالاكیی سیاسـییم كـردووەو لـە ئەنجومـەنی گـەل گـوێم لـە وتاربێـژانی زمانپـاراوی وەكو هیریۆ و بوانگاری و بریاند گرتووە. ئەوانە شتێك بوون. بەڵام ئەمڕۆ مەسـەلەكە وا نیـە, نـەك لەبـەر ئـەوەی پیـاوان كـەمتواناترن, بـەڵكو چـونكە مەحاڵـە فیكـری تـاك كـۆنترۆڵی بابـەتی سیاسـی بكـات. لانیكـەم وەهمـی ئـەوە نـەماوە كـە دەشـێت ئەمـە بكرێــت. سیاســەتیش ئەگــەر كــورت بكرێتــەوە بــۆ چــەند تێكەڵەیــەك كــە لەســەر بارودۆخی كاتی راوەستاوە, من دڵنیا نیم لەوەی دەشێت شتێكی تر بێت.

*** لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا ئەنترۆپۆلۆجیای سیاسەت هەیە. بەشێوەیەكی تایــەت باســی كارەكــانی ج. بالاندێ و كارەكانی پسپۆڕانی كاروباری ئەفریقیا دەكەم.**

ــ دەشـێت لـە كۆمـەڵگا ناخۆراوایییەكانـدا, لێكۆڵینـەوە لەسـەر ئـەوە بكـەین كـە لـە دوورەوە یـان نزیكـەوە پەیوەنـدیی بـەوەوە هەیـە كـە ئێمـە نـاوی دەنـێین سیاسـەت. گەرچی من پێشموایە ئەمە شیاو نیە, بەڵام چی تیایە با هەوڵ بدرێت.

*** هەڵوێستتان بەرامبەری ماركسیزم چیە؟ لە كارەكانتانەوە تێدەگــەین كــە ئێــوە ماركســیزم بــە پێرەوێك دادەنێن كە خەریكی لێكۆڵینەوەی بونیادە شاراوەكان یان ژێر رووتەختەكانە, ئەوانــەی كار دەكەنە سەر هەموو شــتێكی ماتریــاڵ و بەرهەســت. هــەروەها پەیوەندیشــتان لەگــەڵ زانــا ماركسیستەكانی ئەنترۆپۆلۆجیادا باشە, دوێنێ لەگەڵ د. سباگ و ئەمڕۆ لەگەڵ گۆدۆلێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئێوە وا ســەیری دەكــەن كــە فێڵێــك بێــت لــە لایــەنی مێــژووەوە كــە ئامــانجی بــە خۆراواییكردنی جیهانە.**

ـ ئایا ئێمە باسی ماركس دەكەین یان ماركسیزم؟ مەسەلەكە بە تەواوی جیاوازە. بە نیسـبەتی منـەوە مـاركس بـە زینـدوویی و جەوهـەریی دەمێنێتـەوە لەبـەر دوو هـۆ. یەكەم ئەو لە بیری كۆمەڵایەتیدا ئەوەی كردووە كە فرۆید لە بیری تاكدا كردوویـەتی, پاشان ماركس بو كە دەستی كرد بە بیناكردنی پێڕەوی نمونەكان لە زانستەكانی مرۆڤدا, لەبەر ئەم دوو هۆیە ماركس لای من وەك نمونەیەكی مەزن دەمێنێتەوە.





*** بەڵام ئێوە ئەو چەمکە مارکسییانەیە رەت دەکەنەوە کە باسی مانای مێژوو دەکات.**

ـ بە تەواوی.

*** لە وتووێژێکدا لەگەڵ گۆدۆلێدا وتتان ئێوە سەر بە نەوەیەکی ئەنترۆپۆلۆجیستەکانن کە بۆ ئەوەی کردەیی بێت, پێویست بوو لەسەری بە ژمارەیەکی دیارکراوی گۆڕاوەکان کیفایەت بکات. بەڵام ئەم نەوەیەی ئێستا, دەتوانێت ئەنترۆپۆلۆجیای ئابوریی دابمەزرێنێت.**

ـ بە دڵنیایی. ئەمەش بەشدارییەکی جەوهەرییانەیە لە لایەنی ئەنترۆپۆلۆجیستە فەرەنسییەکانی ئێستاوە, کە سروشیان لە مارکس وەرگرتووە. ئەمەش قەرزێکە پێویستە لە بەرامبەری مارکسیزمدا پێی لێبنێین. بێشك ئێمە بایەخێکی ئەوتۆمان نەدا بە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و کاتی کارو دابەشکردنی زەوی و زارەکان.. ئەم نەوەیەی ئێستا تەواو حەقێتی کاتی خۆی تەرخان بکات بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە.

*** کاتێك گۆدۆلیێ هەوڵیدا ئەنترۆپۆلۆجیایەکی شمولیی دابمەزرێنێت, وەك لە کتێبی "بیرۆکەو مادە"دا هەوڵیدا بوو, ئایا ئەمە بە بەردەوامیدان بە کاری ئێوە دەبینن یان دابڕانە لێی.**

ـ ناڵێم بەردەوامی یان دابڕان. ئەوە رێگایەکی ترەو ئێمە هاورێگاین.

*** کامەیە پایەی شێوازی نزیکبوونەوەکەی ئێوە لە ئەفسانەکان بە بەراورد لەگەڵ کارەکانی جۆرج دۆمۆزیلدا کە وەکو ئەندامێك لە ئەکادیمیای فەرەنسی پێشوازیتان لێکرد.**

ـ من سەرسامییەکی بێسنورم بەرامبەری کارەکانی دۆمۆزیل هەیە. هەست بە قەرزێکی فیکریی گەورە دەکەم بەرامبەری ئەو. ئەوەی بە شێوەیەکی دڵگیر پاساوی کارەکانی دەداتەوە ئەوەیە چۆن دەشێت بۆچوونە بە کۆمەڵەکان وەکو وەرچەرخانی ئەفسانەکانی تر وەها بن, چۆن ئایدیۆلۆجیای رۆمانی بریتیە لە وەرچەرخاندنی زاراوەکانی مێژووی ئایدیۆلۆجیایەکی ترکە بە زاراوەکانی میتافیزیا گوزارشتی لە خۆی کردبوو. ئەمە بەشداریکردنێکی یەکجار گرنگە, من کارەکانی دۆمۆزیل بێ هیچ سڵەمینەوەیەك قبووڵ دەکەم.





*** دەڵێن زەوی میتۆلۆجیا خرە. ئەگەر ئەفسانەکان لە نێوانی خۆیانـدا کاربکـەن, ئـەوا چـۆن دەشێت فاکتەرەکانی سیستمی ئابوریان بـۆ زیـاد بکـەین؟ بـەڵکو ئایـا ئـەم فاکتەرانـە هـیچ دەلالەتێکیان هەیە لە بواری ئەنترۆپۆلۆجیادا؟**

ــ هێنـدە بەسـە کتێبـی "ئەفسـانەییەکان" هـەڵبگریت و لـە پێرسـتی زاراوەکانـدا بگەڕێیت بۆ زاراوەی "بونیادی خواروو" ئیتر سـەرت سوڕ دەمێنێت لـە ژمـارەی ئـەو جارانەی ئـەو وشـەیەی تێدا هـاتووە. لـە راسـتیدا حەتمییـەتێکی دووسـەرە یـان دوو سیستمی تێکئالاو هەیە کە هەریەکەیان لەسەر ئەوەی تریان دەڕوێت.

*** دوو شێوەی کاتی دونیایی لێك جیادەکەنەوە, یەکـەمیان میکانیکییـەو تایبەتـە بـە کۆمـەڵگا بەراییەکان, دووەمیشیان گەرمی ــــ دینامییەو تایبەتە بە کۆمەڵگا نوێیەکان.**

ـ لە تێگەیشتنی ئەم مەسەلەیەدا زۆر هەڵە روویـداوە, واتـە ئـەوەی مـن نـاوم نـاوە بـە کۆمەڵگا ساردەکان و کۆمەڵگا گەرمەکان. ئـەم دوو چـەمکە هـیچ بەهایـەکیان نیـە لـەو رووەوە نەبێت کـە یاریـدەی لێکدانـەوە دەدەن. گـەلێك فاکتـەری ساردیی لـە کۆمـەڵگا گەرمـەکان و گـەلێك فاکتـەری گـەرمیش لـە کۆمـەڵگا سـاردەکاندا هەیـە. هەمیشـەو لـە هەموو شـوێنێك. دووەم ئەمانـە خەسـڵەتەکانی حاڵـەتێکی نـاو کۆمـەڵگاکان نین. ئـەم جیاکارییـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو شـێوازەی پێـی دەڕوانرێتـە کۆمـەڵگاکان خۆیـان. کۆمـەڵگای وا هەیـە بایـەخێکی زۆر دەدات بـە مێـژوو, وەك کۆمـەڵگای خۆمـان بـۆ نمونە, کۆمەڵگای واش هەیە وای پێباشە مێژوو لەناویدا بوونی نەبێت. بـەلام هەیـە. ئەوەی جیاوازە, بریتیە لە هەڵوێستی کۆمەڵگاکان بەرامبەری مێژوو.

*** لەم نزیکانەدا باسی مافەکانی هەموو ئەوەتان کرد کە زیندووە, وەك ئەوەی ویستبێتتان بـەوە لە مافەکانی مرۆڤ تێپەڕن, یاخود ئەنترۆپۆلۆجیا بکەن بە قوتابخانەیـەك بـۆ پشـتیوانیکردن لـە سروشت. ئەمە دەورێکی پێشەنگانەیە.**

ــ لـەم بـوارەدا تاکـە کـەس نـیم, بـەدڵنیایی ئەگـەر بینیمـان کـە مەحاڵـە بـۆ هـەر کۆمەڵگایەك بە بێ ژمارەیـەکی دیـاریکراوی ئـەو بەهایانـەی کە پێداچوونەوە قبووڵ ناکەن, دابمەزرێت و بژی, ئەوا ئەو کاتە رەنگە ئۆمێدی ئەوەمان هەبێت کە رێزگـرتن





لە ژیان رۆڵی خۆی لە کۆمەڵگای سبەینێدا بگێڕێت.. من خۆم زۆر بڕوا بەمە ناکەم, بەڵام ...

*** لە دەربڕینەکانی ئەم دواییەتاندا گوزارشتتان لە لایەنگیریی خۆتان کرد بۆ گەڕانەوە بۆ سیستمی کۆنی خوێندن.**

ـ یەکێك لە جوانترین ئەو کتێبانەی بەم دواییە خوێندوومنەتەوە, کتێبی "شوێنەکانی یادەوەریی" یە کە لە نوسینی ب . نورایە. دەتوانین لەم کتێبەوە تێبگەین کە لە کۆماری سێهەمدا سیستمی خوێندن تا چ رادەیەك پشتی بە ئایدیۆلۆجیایەك دەبەست کە بە شێوەیەکی میتۆدییانە بیناکراوە. لە راستیدا ئەوەندە بەس نیە باسی زەرورەتی ئەوە بکەین کە هەموو منداڵەکان بە یەك شێواز بخوێنن, بەڵکو پێویستە ئەو سیستمی بەهایانەی مامۆستاکانیان دەجولێنێت, ئەویش هەمان سیستم بێت.

*** لە کارەکانتاندا, سبەینێ رەهەندێکی سەرەکیی هەیە, هەروەها بە رای ئێوە هونەری هاوچەرخ لەناو بزرگەیەکدا دەڕوات.**

ـ پێموایە لە رێگایەکی داخراودایە. بە دڵسۆزیی وادەڵێم, بە تایبەتی کە لە لاویمدا یەکێك بووم لە هەرە پەرۆشەکانی وێنەکیشان و و مۆزیکی پێشەنگانە.

*** رەشبینی سیفەتێکە لە گەلێك کاری ئێوەدا دەیدۆزینەوە. ئایا ناشێت ئێوە سۆزێکتان هەبێت بۆ بەهاکانی رابردوو, بۆ ئەسڵ و رەگەکان. دەڵێن" مرۆڤ تەنها لە سەرەتادا شتە مەزنەکان دروست دەکات".**

ـ جگە لەو پێشکەوتنە زانستییەی زۆرترین رێزی لێدەگرم و بایەخی پێدەدەم, ئیتر من بەم جیهانە شادمان نیم کە تێیدا دەژیم.

**سەرچاوە:**

**گۆڤاری "المنار"** , **ژمارە (6)** , **ل** 157 – 160.





**دوابەدوای دەرچوونی "بیری 68"ی هەردوو نوسەر ڤێری و ئالان رینۆ، کە لێکۆڵینەوەیەکە دەربارەی دژایەتییە هاوچەرخەکەی مرۆڤدۆستی (گالیمار 1985) و چەندان گفتوگۆی توندی وروژاندووە. ئەو گرەوانەی سەرلەنوی خوێندنەوەکەی ئەوان بۆ بیست ساڵی فەلسەفەی فەرەنسی، هێناوییەتە ئاراوە، شایستەی قووڵبوونەوەو روونکردنەوەی ناواخنی ئارگیومێنتەکەیە. ئالان فینکلیکرۆت و کرزیسزتۆف پۆمیان ئەو نارەزاییانە دووبارە دەکەنەوە کە هەوڵەکەی ئەو دوو نوسەرە وروژاندوویەتی. پێکەوە مەرجەکانی دابڕان و نوێکردنەوە دەپشکنن، کە ئێستا پێشبینییان دەکات*.**

**کرزیسزتۆف پۆمیان:** لە وتارێکتاندا، هێگڵتان بە نمونە هێناوەتەوە دەربارەی "کرۆکی رەخنەی فەلسەفی"، کە ئەو جەخت دەکات "تەنها لای ئەوانە رەخنە مانای هەیە، کە بیرۆکەی فەلسەفەی یەکگرتووی تاقانەیان لا هەیە"، لەم بارەیەوە وتتان:" بۆ ئەوەی رەخنە کارێکی نەزۆك نەبێت، پێویستە دان بە دژدا بنێین و ئەزمونەکەی بە جدی وەربگرین و بە یەکێك لە هەوڵە شیاوەکان لە قەڵەمی بدەین بۆ نمایشکردنی ئەوەی هێگڵ ناوی دەنێت بیرۆکەی فەلسەفە، بە مەرجێك ئەوکاتە دەرك بەوە بکەین کە ئەو هەوڵە تەڵەزگەیەکی راستەقینەیەو لە ژێر ئەو ئاستەدا دەمێنێتەوە کە خۆی بانگەشەی بۆ دەکات". جارێکی تریش هێگڵ بە نمونە دەهێننەوەو دەڵێن:"کاتێك دانپیانان نامێنێت، ئیتر تەنها دوو خودێتی دەمێنێتەوە کە رووبەڕووی یەك دەبنەوە" ئیتر هەڵوێستی رەخنە دەبێت بە "نکولیلێکردن". ئەمەیە پرسیاری یەکەمم کە پێمخۆشە بیکەم:" رەخنەکەتان لە "بیری 68 " بەچی جیاوازە لە رووبەڕووبوونەوەی نێوان دوو خودێتی دژ، یان بە گوزارشتێکی تر ـ هەر بە بەکارهێنانی زاراوەکانی خۆتان ـ بەچی جیاوازە لە رەخنەیەکی تەواو دەرەکی بۆ بیری 68؟

---

* لە گۆڤاری Le Debat ژمارە (38).





**ئالان رینـۆ:** پێموانیـه مەسـەلەکە بـه راسـتی پەیوەنـدی بـه رەخنەیـەکی دەرەکییـەوە هـەبێت, چونکـه ئێمـه لـەو نەسـکانەدا کـه تـەرخانمان کـردووە بـۆ فۆکـۆ و دێریـداو بۆردیێو و لاکان, هەوڵمانداوە, لە لای هەریەکە لە نوسەرانی ناوبراو, هەموو جارێك ئـەو نمونـه فەلسـەفییە چـاوگییە روون بکەینـەوە کـە حەقیقـەت دیـاری دەکـات, هەڵوێسـتیان بەرامبـەری بابـەتێتی. کەواتـه, مەبەسـتەکە رەخنەیەکـە بـەوە دەستپێدەکات کە لە لای نوسەرێکی دیاریکراو, ئاگاداری نمونەی وێنەگرتنی ئەو واقیعـه بـبین کـە ئێمـه مەبەسـتمانە, بـە مـەرجێك دواتـر پیشـانی بـدەین کـه بـه بۆچوونی ئێمە هەڵبژاردن و ئەندێشەکردنی ئەم جۆرە بۆچوونە بۆ ئەو واقیعەی ئێمە مەبەستمانە, بۆی هەیە بەرەو چ تەڵەزگەیەك یان نارەحەتییەکمان ببات.

**لۆك ڤیری:** حەزدەکەم ئەوەش زیاد بکەم کە مەبەست لە چوار نمونە لێکۆڵراوەکە, واتـه لاکـان و بۆردیـۆ و دێریـدا و فۆکـۆ, بریتیـه لـه رەخنەیـەکی نـاوەکی, بەقـەدەر ئـەوەی ئامانجمـان ئـەوە بـووە نـاکۆکی و تەڵەزگـەکانی نـاو هەڵوێسـتێکی تیـۆریی روون بکەینەوە. کاتێك ئەم کارە دەکەین, دەتوانین لـە کـاتی پێویسـتدا ـ بەڵام بە تەنها دوای ئەوە ـ پرسیار لـە رەچـەڵەك بکـەین, واتـه هـۆی ئـەم گوتارانـەو شـوێنی مێژووییان لـە شەسـتەکاندا و پەیوەنـدییان بـە جوڵانـەوەی مایسـی 68 ەوە, هتـد. بەڵام رێخۆشکردنی حـەتمیی بریتیـە لـە رەخنـەی نـاوەکی, ئـەو کـارەش کـە لەسـەر بنەمای پوختەکردنی ئەو نارەحەتییانە دامەزراوە کە رەنگە یـەکێك لـە دانـەران لـە تـوێی بەڵگەنەویستەکانی خۆیـەوە, تێیـان بکـەوێت. هەنـدێك لـە رەخنـەکانمان بـە دڵرەقانەو تەنانەت هێرشکەرانەش لە قەڵەم دران, بەڵام ئەوەنـدەی مـن بـزانم, هـیچ شوێنەوارێك بۆ هیچ نزیکایەتییەکی شەخسیی لە کتێبەکەماندا نیـە ـ لـە کاتێکدا دەمانتوانی , دوای ئەوەی بانگەشـەی رەخنـەی ناوەکیمـان کـرد, خـوو بدەینـە ئـەم لایەنە. وەڵێ ئەوەی ئێمە روونمان کردەوە, بۆ نمونـه سـەبارەت بـە دێریـدا, ئەوەیـە کـە پـرۆژەی گوزارشـتکردن لـە "جیـاوازی" بـە خێراییـەکی زۆر بـەرەو چـەندان تەڵەزگـە دەڕوات, یـاخود پـرۆژەی رەخنـەگرتن لـە مـۆدێرنیزم لای فۆکـۆ, وەك "مێژووی شێتی" کۆی دەکاتەوە, نەزانییەکی تەواوی تێدایە دەربارەی سروشتی





جیاوازیە راستەقینەکانی نێوانی کۆمەڵگا کۆنینەکان و کۆمەڵگا نوێیەکان، هتد.

**ئالان رینۆ:** هەمان شتیش بۆ بۆردیۆ، ئەوەی هەوڵماندا روونی بکەینەوە، ئەوەیە ئەو بابەتەی دەربارەی تەرزی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیانەی) رایەکان، هەڵی دەگرێتەوە، رایدەکێشێت بۆ ناتوانایی لە پەرچکردنەوەی بەرهەمی هەڵوێستە تایبەتییەکانی، بە هەمان ئەو گوزارشتانە. بەراستی، ئەگەر هەموو گوتارێك پەرچبوونەوە بێت و لەناو ستراتیجەکانی جیاکاریی کۆمەڵایەتیدا بێت، ئەوا دەتوانین پرسیار بکەین رەوشی ئەو گوتارە چیە کە گوزارشت لە تیوریی ئەم گوتارانە دەکات، یاخود، ئەگەر مەسەلەکە وانەبوو، خۆی چۆن دەتوانێت خواستی ئەوەی هەبێت خۆی بە زانست لە قەڵەم بدات؟ ئەم رەخنەیە بەشێوەیەکی نمونەیی رەخنەیەکی ناوەکییە، دەست دەبات بۆ بەپێزیی گوتارە رەخنەلێگیراوەکە و بە دەسپێك لە پرەنسیپە تایبەتییەکانی خۆیەوە، ئاشکرایە کە ئێمە لای خۆمانەوە، هەرگیز نەمانپرسیوە، بۆچی بۆردیۆ باوەشی کردووە بەم پرەنسیپانەدا، دەبێت ئەم هەڵبژاردنە لە چوارچێوەی چ ستراتیجێکی جیاکارییدا دابنێین، هتد. ئەوەی بۆردیۆ خۆی دەربارەی گوتارەکانی ئەوانیتر دەیکات، تا رادەیەکی زۆر بۆ ئێمەش هەبوو بیکەین، بەڵام ئەمجارەیان مەسەلەکە پێوەست دەبوو بە رەخنەیەکی دەرەکییەوە کە بۆردیۆ لە لایەنی خۆیەوە بەرامبەری هایدگەر، مومارەسەی دەکات، وەلێ ئێمە هەردەم ئاماژەمان بۆ لاوازیی ئەم رەخنەیە کردووە.

**کرزیسزتۆف بۆمیان:** بۆ ئەوەی ساتێکی تریش لەسەر مەسەلەی ئەم رەخنەیە بمێنینەوە، پێموایە لێرەدا دوو مەسەلە هەیە: لە لایەکەوە، بە راستی رەخنەیەکی ناوەکیی دەگرن (بەڵام ئەمە پرسیارەکەی من نیە)، بە واتای ئێوە بەناو ئەو بینایانەدا قووڵ دەبنەوە کە رەخنەیان لێدەگرن و ناکۆکییە شاراوەکانیان روون دەکەنەوە. بەڵام ئەگەر پرسیار بکەیت هەتا چ مەودایە رەخنەکەتان بە رەخنەی ناوەکی لە قەڵەم دەدرێت، بە مانا هێگڵییەکەی ئەم دەستەواژەیەی بەکارهێنانی وشەی "ناسینەوە" روونی دەکاتەوە، ئەمەش چونکە من پێموایە ئێوە رەخنە لە سیستەمە فیکرییەکان دەگرن، ئێوە لێتان دەکۆڵنەوەو تۆێکڵیان لێدەکەنەوەو بە





نزیکــەیی لــەناوەوە توێتوێیــان دەکــەن, بــەڵام بــەبێ ئــەوەی دان بــە هــیچ بەشــداریکردنێکی ئەرێــدا بنــێن بۆیــان. هەنــدێجار, لــە خوێندنــەوەی ئێــوەدا, دەپرسین, خەڵك چۆن توانیویانە تا ئەم رادەیە ورێنە بکەن, وادیارە, ئەمە روونی دەکاتەوە ئەو فەلسەفەیەی ئێوە رەخنەی لێدەگرن, بە هیچ جۆرێك وەکو فەلسەفە دانــی پێــدا نــەنراوە. بــەم مانایــەش دەپرســم: ئایــا رەخنەکــەتان, رەخنەیــەکی ناوەکییە؟

**ئالان رینۆ:** بە رای من, ناتوانین بڵێین رەخنەکەمان بە تەواوی نەرێیانەیە, چونکە ئێمە بە راشکاویی دان بەوەدا دەنێین کە ئەو بیرانەی شیمان کردوونەتەوە, چەند ساتێکی راستەقینەیان تێدایە. بۆ نمونە, کاتێك رەخنە لە لاکان دەگرین, ئاشکرایە کە رەخنەکەمان بە ناوی بیرۆکەی تیواریی (شەفافییەت) خودی کامڵەوە نیە, بەمەش نارەزایی لە بیرۆکەی پارچەکانی خود دەردەبڕین, واتە لە کۆتاییدا لە بیرۆکەی دێرینی نەست ناڕازیین, چونکە بە لایەنی کەمەوە دەگەڕێتەوە بۆ (لایبنیتز): ئێمە وەکو هەمووان, لەگەڵ لاکاندا ین لە نارەزایی گرتن لە بیرۆکەی کۆحیتۆی دیکارتی! هەروەها لە گفتوگۆشماندا لەگەڵ دێریدادا, ئاشکرایە کە ئێمە نکولی لە مەسەلەی جیاوازی ئۆنتۆلۆجییانە ناکەین, بەو شێوەیەی دێریدا بەکاری دەهێنێت , (خوداش خۆی دەزانێت ئەگەر خراپ بەکاری هێنابێت!) لە رووی فەلسەفییەوە زۆر گرنگە و پێویستە ببێت بە ساتێکی پرسشی فەلسەفی: ئێمە لەو زیاتر داکۆکی لە شوناسی واقیع و عەقڵانی ناکەین! بۆیە, لێرەدا, چ لە گفتوگۆکردن لەگەڵ لاکاندا یان لەگەڵ دێریدادا, ئەو ساتی دانپیانانە دەبینن, هەقتانە کە دەڵێن, پێویستە ئامادە بێت بۆ ئەوەی بە راستی ئارگیومێنت لە فەلسەفەدا هەبێت. هەروەها بە مەبەستی سادەکردنەوەی رەخنەکەمان و هیچی تر, بگرە بۆ بەخشینی مۆرکێکی کاریکاتێرییانە پێی, لەوانەشە بۆ زامنکردنی دەرفەتی ئارگیومێنتێك بێت, کە جارجارە توانیومانە ئەم ساتانەی دانپیانان لە کتێبەکەمان بشارینەوە و لافی ئەوەمان لێداوە کە ئێمە, بۆ نمونە لای دێریدا رەخنە لە شێوازی بەکارهێنانی بابەتی جیاوازی, ناگرین, بەڵکو هەمان بابەت: لەم





حاڵەتـەدا, ئاسـانە بڵـێین ئێمـە ویسـتمان نكـولیی لەسـەدەونیوێك لـە فەلسـەفەو دۆزینەوەكانی نەست یان جیاوازی بكەین و بڵێین ئێمە دەمانەوێت بگەڕێینـەوە بـۆ هێگڵ یاخود تەنانەت دیكارت!

**ئالان فینكلیكرۆت:** لەگەڵ ئەوەشدا دەمەوێت بەو مانایـەی بۆمیـان مەبەسـتی بـوو, شوێنی پرسیارەكە بكەوم, چونكە منیش وەكو ئەو, بەهیچ جۆرێك بە وەڵامەكە قایل نیم. لـە راستیدا لـە كتێبەكەتاندا خۆتـان لـە زنجیرەی رەچەڵەكییەت لاداوە, ئەمـە ناتەواوییەكـە ناشـێت لەسـەرتان حیسـاب بكرێـت, ئێـوەش بـە باشـی ئـەو ناتەواوییە شیدەكەنەوە كە رەنگە لێی بكەوێتەوە, یاخود تۆقاندنی ئەو هەڵوێستە فیكرییــەی كـە گوتـار دیـاری دەكـات نـەك بـە ناواخنەكـەی, بـەڵكو بـە مەرجـە دەرەكییـەكانی بەرهـەمهێنانی. بـەڵام بـە رای مـن لـە شـتێكتان كەمـە: شـێمانەیەك هەیـە , گـە لـەو سەرپشـككردنەی پێـی هەڵدەسـتن لـە نێـوانی لێكۆڵینەوەیـەكی رێژەییـدا كـە بـە دەسـتەواژەی "لـەكوێوە قسـە دەكـەین؟" ی بەناوبانگ هێمـای بـۆ دەكرێـت, لێكۆڵینەوەیـەكی وەك ئـەوەی ئێـوە لەسـەر بنـەمای شـیكردنەوەیەكی پەتییانـــەی ناواخنـــەكان, ئێـــوە پرســـیار دەربـــارەی هانـــدەرە ناوەكییـــەكانی فەیلەسوفانی بیری 68, ئەو بیرەی رەخنـەی لێدەگرن. هـەروەها دەربارەی جۆری ئــەو هەســتیارییەش هــیچ ناپرســن كــە بــە گوزارشــتێكی تــر, پێوەســتە بــە رەخنەگرتنیانـەوە , ئێوە ژمارەیـەك نیشـانە شیدەكەنەوە, دڵرەقانـە دەستنیشـانی دەكەن, بەڵام هۆیـەكان دەرناخـەن, ئێـوە پـەردە لەسـەر تاوانەكە لادەدەن ــ مـەرگی مرۆڤ ـ وەلێ پێناچێت پاڵنەرەكانتان بەلاوە گرنگ بێت. لەم حاڵەتەشدا, پێموایە لە كەللـەڕەقیی دژ بـە مرۆڤایـەتی تێناگـەین, لـە رەوتـی نەهێشـتنی ئیمپریـالیزم و رەخنــەگرتن لــە رەچــەڵەكگەرایی خۆراواییــدا نــەبێت, كــە دەبێتــە هــۆی شیتاڵبوونەوەی مرۆڤ, هەروەها لێكترازانی رێژەیـەتی كـەلتوریی و لەتوپـەتبوونی خـودی مرۆیـی بـۆ ژمارەیـەك هەمـەكی وەهـا كـە مەحاڵـە لـە نێـوانی خۆیانـدا كزربكرێنەوە, هەر هەموشیان بەقەد یـەك شـەرعی و پەسـەندن. ویستراوە بە نـاوی مرۆڤی جیاوازەوە, كۆتایی بە مرۆڤ بهێنرێت. لە دەرەوەی ئەم رەوتـە, لـەم بیرە






تێناگەین. بە کورتی، هەستدەکەم نکولیلێکردن هەردوکتانی داگرتۆتەوە: چونکە مەیلی دژە مرۆیی ساتمەی پێداوون، ئێوە ویستوتانە بیسەلمێنن ئەم جوڵانەوەیە پڕووپووچ و نەسرۆیە. نکولیتان لە خەسڵەتەکانی کردووەو بەستوتانەتەوە بە فەلسەفەی ئەڵمانییەوە وتتان مەسەلەکە پەیوەندیی هەیە بە زێدەیەکی نەژادیی بۆماوەیی ئاساییەوە، زیاتر لەوەی پەیوەندی هەبێت بە ماوەیەکی نوێی ئەفرێنەرانە لە مێژووی فیکردا). لە لایەکی تریشەوە دەرتانخست کە دژایەتیکردنی مرۆڤایەتی توانیویەتی هەندێك لە نوێنەرەکانی خۆی بەرەو وڕێنەی فەلسەفییانە ببات؟ دەتانتوانی بە "دۆنادۆنێکی هۆشییانە" ی زیاتر لە ناڕەزایی و بەخشندەیی ئەم مەیلە دژە مرۆڤە تێبگەن. ئەمەش رەخنەکەی لاواز نەدەکرد، بەڵکو بگرە رەزامەندییەکی زیاتریشی بۆ دابین دەکرد.

**لۆك ڤیری**: زەحمەتە بتوانین خۆمان لەم مەسەلەیە لابدەین، وەك ئێستاش هێمام بۆ کرد، ئامانجی ئێمە بە شێوەیەکی تایبەت بریتی بوو لە ئەنجامدانی رەخنەیەکی ناوەکیی بۆ مەسەلە فەلسەفییە نمونەییەکانی شەستەکان ــ پێموایە دەبێت لە دیوی ئەم ئامانجەوە کتێبەکەمان هەڵبسەنگێنرێت. پاشان، سەرباری هەموو شتێك لەم کتێبەدا رەگەزێکی راڤەیی هەیە کە لە خودی ناونیشانەکەدا ئامادەیە، ئەویش بریتیە لە گەڕانەوە بۆ مایسی 68 وەکو جوڵانەوەیەکی تاکانیی. وریابە! من ناڵێم ئەمە تاقە راڤەکردنی شیاوی مایسی 68 ە، بەڵام پێموایە ئەگەر مەسەلەی تاکگەرایی وەك ئەوەی ئیمڕۆ لە لایەنی نوسەرانی وەکو مارسیل گۆشێ یان جیل لیبۆفیتسکی، سەرلەنوێ لە دیدێکی "تۆکیفیلییانەی[6] نوێ" وە

---

[6] تۆکڤیل Tocqueville, Alexis Charles Henri Maurice Clérel de (1805-1859) نوسەرێکی سیاسیی فەرەنسییە، زانایەکی کۆمەڵناسییە، رەوی کردووە بۆ ئەمریکاو لەوێ بیروبۆچوونەکانی خۆی لەسەر دیموکراسییەت و ئازادی و لیبرالییەت بڵاو کردۆتەوە

جەنگی سارد Cold War, زاراوەیەکە بەکارهێنراوە بۆ ململانێی پاش جەنگی جیهانیی دووەم لە نێوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو شۆڤێتی جاران و هاوپەیمانەکانیاندا. لە ماوەی جەنگی سارددا کە لەناوەڕاستی چلەکانەوە هەتا کۆتایی هەشتاکان بەردەوام بوو، سیاسەتی





ئامـادەکراوە, رەچـاو بکـەین, بۆمـان روون دەبێتـەوە کـە چـۆن تەقینەوەیـەکی تاکانیيانـەی وەکـو مایسـی 68, لـە یـەك کاتـدا بریتـی بـووە لـە رەخنـەگرتن لـە پێوانـەکان و روخانـدنی رۆشـنبیرییەکی چـێژگەرای نارسیسۆسـی, هـەروەها لـە هەمان جوڵانەوەشـدا, فەلسـەفەیەك هاتـە دەرەوە کـە داکـۆکی لـەو بیرۆکەیـە دەکات کە دەڵێت:"واقیع بوونی نیە, بەڵکو ئەوەی هەیە لێکدانەوەیەو هیچی تر". لێرەدا ئـەم سـێ بابەتـە پێوەسـتی یـەکترین, بـە ئـاڵوگۆڕیی روون دەبنـەوە. ناتـەواوی کتێبەکەمان, لێرەدا پرسیارەکەتان بە تەواوی دەپێکێت, بریتیە لە پەیوەندیی بە رەخنـەگرتن لـە رەچـەڵەکگەرایی, بـە تایبـەتی لیڤـی شـترۆس, کـە لـە راسـتیدا ئـەو گرنگترینـی ئەوانەیـە کـە لـە فەرەنسـا بەشـدارییان کـردووە لـەوەی سـەرلەنوێ گۆشەنیگای "خۆراوایی" لەمەڕ رەچەڵەکگەرایی دەخەنـەوە بـەر لێکۆڵینـەوە. بەڵام ماوەی ئەم چاوپێداگێڕانەوەیە بە تەنها نەبەستراوە بە نـەمانی ئیمپریالیزمـەوە. بە رای مـن پێوەسـتیشـە, رەنگـە زیـاتریش, بـەدوای جـەنگ و دیـاردە تۆتالیتـاریی[7] و

---

نێودەوڵـەتی لەسـەر قـازانج یـان زیـانی ئـەو دووبارسـتەیە دامـەزرابوو, هـەروەها ئایـدیۆلۆجیای رەسمیـی خۆشـیان لـەدونیادا بـڵاو دەکـردەوە: دیموکراسـییەت و سـەرمایەداریی لەئـەمریکاو, کۆمـۆنیزم و تۆتاڵیتـاریی لـە شـۆڤێت. هاوپـەیمانانی بلـۆکی ئـەمریکا لـەو جەنگـەدا, بـەریتانیا, فەرەنسا, ئەڵمانیای خۆراوا, یابان, لەگەڵ کەنـەدا بوون. هاوپـەیمانانی سۆڤێتیش بریتـی بـوون لـەوڵاتانی ئـەوروپای خـۆرەڵات, لـە بولگاریـا, چیکۆسـلۆڤاکیا, هینگاریـا, پۆڵەنـدە, ئـەڵمانیای خۆرەڵات, لەگەڵ رۆمانیا. لەلایـەکی تریشـەوە کوبـاو چین لەوجەنگـەدا بەشـدار نـەبوون و لەگـەڵ چەند دەوڵەتێکی تری جیهانی سێیەمدا بەرەی بێلایەنەکانیان Nonaligned دروست کردبوو.

[7] تۆتاڵیتـاریزم Totalitarianism بریتیـە لـە زانسـتێکی سیاسـی, سیسـتمێکی حکومـەت و ئایدیۆلۆجیایـەك, کـە تێیـدا هـەموو چالاکییە سیاسـی, ئـابوری, رۆشـنبیریی, کـەلتوریی, لەگـەڵ چالاکییە رۆحییەکاندا, دەکەونە ژێر ئیختیـاری سـەرۆکەکانی وڵاتـەوە. شـەش حـەوت خەسـڵەتی گرنگ تۆتاڵیتاریزم جیادەکەنەوە: چەشنە ئۆتۆکراسییەتێکی تایبەت بە سـەدەی بیستەم, کـە لـە شێوە کۆنەکانی رەهایـەتی و پاشـکۆیەتی و ستەمکارییەوە پوختـە کراوە, لەفۆرمـە دێرینـەکانی ئۆتۆکراسییدا, خەڵکی بۆیان هەبوو بەشێوەیەکی سەربەخۆ بژین و کاربکەن, هەروەها خەسـڵەتە سیاسییەکانی خۆیـان پاراسـتبوو. بـەڵام لـەتۆتاڵیتاریزمی مۆدرێنـدا, ئـەوا خـەڵك بەتـەواوەتی لـە





بێشك نازییزمیش[8] بەشێوەیەكی تایبەتی , ئەوا بیرۆكە سەرەكییەكەی فەلسەفەی رۆشنگەریی لەق دەكات, واتە بیرۆكەی پێشكەوتنی رەهای خۆراوا بەرەو عەقڵ و ئازادیی. ئەگەر بمانەوێت جێگای شەستەكان لە ئاسۆیەكی زیاتر مێژووییدا دیاری بكەین (لێرەدا من باسی مێژوویيەتی بیر دەكەم), ئەوا پێموایە گەڕانەوە بۆ ئیمپریالیزم بەس نیە, بەڵكو دەبێت هەموو نەهامەتییە تۆتالیتارییەكانیش لە رەوتی ئەم چاوپێداگێڕانەوە مەزنەدا بە بەهاكانی مۆدێرنیزمی خۆراواییدا رەچاو بكرێن, بەم بۆنەیەوە, ئەمە دەری دەخات, كە مایسی 68 ساتێكی چەند ئاڵۆزە. بێشك لیڤی شترۆس لەم دیدەدا, پایەیەكی سەرەكیی داگیر كردووە: چونكە ئەو تا رادەیەك باوكی جیهانسێیەمییە ـ گەرچی خۆی دانی بەم باوكایەتییەدا نەناوە ـ گەرچی لە لایەنی سیاسییەوە جیهانیسێیەمی بە ماركسیزم یان گوتارە ناكۆكەكانی تر پاراو بووبێت, لە پاڵ ئەو مەسەلانەدا كە دەشێت مەسەلەی لیڤی شترۆس بن, بەمپێیەش بێگومان دەشێت بپرسرێت بۆچی لیڤی شترۆس بە شێوەیەكی سەیر لە كتێبەكەماندا بزرە. بەر لەوەی پێشوەخت ئەم هۆیە یان ئەوەی ترمان بە بیردا بێت, جێی خۆیەتی تۆزێك بیر لەوە بكەینەوە كە سەرباری هەموو شتێك هێشتا (ئەگەر پێمان خۆش بێت, سەرباری مەیلە دژە مرۆییەكەی لیڤی شترۆس) هێشتا ئەنترۆپۆلۆجیای بونیادگەراو ئەو هەڵوێستە رێژەییە لێك

---

خەون و هیواو پێداویستییەكانیاندا, پشت بەپارتێكی سیاسی و سەركردەكانیان دەبەستن. ئۆتۆكراسیزمی دێرین لەلایەنی پادشایەكەوە, یان هەر ئەدرێسێكی تری ئەریستۆكراسەوە بەرێوە دەبرا, كە بەپێی پرەنسیپی مافی لەوێنەی یەزدانیی , وڵاتی بەرێوە دەبرد, بەڵام لەتۆتاڵیتاریزمی نوێدا وڵات لە لایەنی سەركردەیەكەوە یان بەرێوەبەرێكەوە بەرێوە دەبرێت كە كۆنترۆڵی پارتی سیاسیی دەسەڵاتداری كردووە.

[8] سوسیالیزمی نەتەوەیی , National Socialism بە نازیزم Nazism, ناسراوە. جولانەوەیەكی سیاسیی ئەڵمانییە. لەساڵی 1920دا, لەگەڵ پارتی كرێكارانی نەتەوەیی سوسیالیستی ئەڵمانیدا دەستی پێكردووەو پێشی وتراوە پارتی نازی NSDAP سەرەنجامی جولانەوەكە گەیشتە رایخی سێیەم, كە دەوڵەتێكی تۆتاڵیتاریستی ئەڵمانییەو سەركردەكەی ئەدۆڵف هیتلەر بوو 1933 . 1945.





جیادەکاتەوە کە کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر کەش و هەوای فیکریی شەستەکان هەبوو. لە ماوەی دوای جەنگدا, راستەوخۆ, زۆربەی گفتوگۆ فەلسەفییە فراوانەکان روویاندا ـ من لێرەدا باسی کفتوگۆ زانکۆییەکان ناکەم ـ دەربارەی مەسەلەی مێژوو. ئارۆن و سارتەر وازیان لە ململانێ نەهێنا, چ لە نێوانی خۆیاندا یان لەگەڵ مارکسییەکاندا, مارکسییەکانیش هەروایان لەگەڵدا کردن, لەسەر مەسەلەی سروشتی مێژوویی‌یەتی و رۆڵی پیاوان لە مێژوودا وشێمانەی بابەتێتی مێژوویی, هتد. بە نیسبەتی مارکسیزم و بوونگەرایی‌یەوە, لیڤی شترۆس بیرۆکەیەکی تەواو نوێ دەخاتە ناو رەوتەکەوە, ئەویش بیرۆکەی بونیادە. ئاشکرایە ئەم بیرۆکەیە خۆی لە خۆیدا دانەپاڵی خودانییەتی تێدایە, بەم مانایەش هزری ئەو جیگەیەك بۆ خۆی دەکاتەوە. بەڵام ئێمە, لە هەمان کاتدا, دەبینین کە ئەوەی سەرەکییە لە بونیادگەری‌دا, بریتیە لە چەشنە نکوڵیکردنێك لە مێژووگەرایی. هەرچۆنێك بێت پرەنسیپی رەچەڵەك کە کرۆکی هەڵوێستە تیورییەکانی فۆکۆ یان بۆردیۆیە بۆ نمونە, پێویستی بە شتێك لە پەیوەندیی هەیە کە بە تەواوی لە بیری لیڤی شترۆس بزرە, تەنانەت دژیشی هەڵدەگەڕێتەوە. پێموایە ئەوانەی رەخنەی قسە نەکردن لەسەر لیڤی شترۆسیان لێگرتووین, وریای ئەم خاڵە نەبوون. راستە دەتوانین بە دەستپێك لەو خاڵەوە, ئەو دەقانە بخوێنینەوە یان ئەو کۆمەڵگایانە بخوێنینەوە کە بە تەواوی دژی تاکانییەت و مەیلی مرۆڤدۆستیین[9], بەڵام ناتوانین بە ئاسانی ـ ئەمەش خاڵێکی بنەڕەتییە ـ

---

[9] مرۆڤدۆستی Humanism لە فەلسەفەدا, بریتیە لەو هەڵوێستەی جەخت دەکاتە سەر شکۆو رێزی تاکەکان. پێشەکییەکی سەرەکیی بۆ مرۆڤدۆستی ئەوەیە کە مرۆڤەکان بونەوەری ژیرن و خۆیان لەخۆیاندا توانای راستیی و چاکەیان هەیە. زۆر جار زاراوەی مرۆڤدۆستی بەکاردێت بۆ وەسفکردنی جوڵانەوەیەکی کەلتوریی و ئەدەبیی, کە لە سەدەی چواردەو پازدەدا, ئەوروپای خۆراواوە هاتووە. رێنیسانس لێکۆڵینەوە یۆنانیی و رۆمانییەکانی بوژاندەوە و جەختی کرد لەسەر بەهای کلاسیك لەلێکۆڵینەوەکانی ئێمەدا, زیاتر لەوەی کە بۆ مەسیحییەتی پەیوەندیدا رێپێوەی سودی هەبێت.





**هەوڵ بدەین خوێندنەوەیەکی مێژوویی بکەین (ئەمەش حەشاردانیە)، بەهەرحاڵ زنجیرەی رەچەڵەك پێویستی بە پەیوەندییەك هەیە بە مێژووەوە، چونکە وەکو تێبینی دەکەین، لە لای فۆکۆ، زنجیرەی رەچەڵەك، تەنانەت تێکەڵاوی مێژووگەرایی چەمکەکانیش دەبێت. بەمەش، ئەگەر بگونجێت وا بڵێین، دەبوو "مێژوو"یەك بۆ بونیادگەری هەبێت و سەرلەنوێ بەو مێژووە بپۆشرێتەوە کە لێی ون بووە. ئا لەم خاڵە دیاریکراوەدا، بیری هایدگەر توانیویەتی، بەشێوەیەکی تایبەتی لای فۆکۆ رۆڵێکی گەورەی هەبێت. لە راستیدا، مێژووی کەینونە بەو مانایەی هایدگەر پێشی دەخات، رێك بیتیە لە مێژووی بونیادەکان بەوەی کە سەردەمەکان وەکو سیماکانی کەینونە، تێدەگەین) کە بەهیچ شتێك قەرزاری نە مێژووگەرایی مارکسیزم و نە مێژووگەرایی ئابوری و نە مێژووگەرایی خودێتی ئازاد و کارا، وك لای سارتەر ــ چونکە بونیادگەری لەگەڵ بیری هایدگەرییانە بۆ مێژووگەرایی، ئەگەر بمانەوێت کە ...**

**ئالان فینکلیکرۆت: ئایا لەگەڵ ئەوەشدا لە رۆڵی بونیادگەری کەم ناکەیتەوە؟**

**ئالان رینۆ: بونیادگەری هەرگیز بە تەنها یەکێك لە پێکهێنەرەکانی بیری 68 نەبووە، بەڵکو یەکێك لە ئامرازەکانیشی بووە. مەبەستم لەمە ئەوەیە لە چوارچێوەی کاری پاکتاوکردنی ئەو خودێتییەدا سودی هەبووە کە ئەم بیرە دیاری دەکات، کە لێرەدا شتێکی تر پێویست دەکات، جگە لە بونیادگەری خۆی، واتە بیرێك بۆ مێژوو کە بونیادگەری ناتوانێت پێشکەشی بکات، ، جگە لەوەی پێویستیشی بە چەند بەشدارییەکی تریش هەیە کە بە تەواوی لە دەرەوەی چوارچێوەکەیدان.**

**ئالان فینکلیکرۆت: با وابێت، بەڵام ئەو دانەرانەی ئێوە هەڵتان بژاردوون، بەشێك لە شێواز و چەمکەکانی خۆیان لە ئەنترۆپۆلۆجیای بونیادگەری دەخوازنەوە. بۆ نمونە، بۆردیۆ[10] دەکەن بە حاڵەتێکی نمونەیی لە مارکسیزمی فەرەنسی، ئەمیش**

---

[10] بۆردیۆ، پییر (Bourdieu, Pierre (1940-2002 فەیلەسوفێکی فەرەنسیی هاوچەرخە، سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی تاك و نەهامەتییەکانی ژیانی تەکنەلۆجیایە. دیارترین کتێبی بریتیە لە مرۆڤی ئەکادیمی، تێزی توندو تیژیی رەمزیی یەکێکە لە تێزە نێودارەکانی.





لە بەتەنگەوەهاتنتانەوە بۆ خستنەڕووی بەشدارییەکەی بیری شەستەکان. بەڵام مارکس هەرگیز چەمکە سەرەکییەکەی بۆردیۆی پەسەند نەکردووە, کە بە ناوی بێسەرەوبەرەیی رۆشنبیرییەوە ناسراوە. ئەم چەمکە راستەوخۆ لە ئەتنۆلۆجیاوە وەرگیراوە. ئەمەش یەکێکە لە بەڵگەکان لەسەر ئەو رۆڵە بنەڕەتییەی کە ئەتنۆلۆجیا لە کەش و هەوای شەستەکاندا گێڕاویەتی. جارێکی تریش پێموایە, هەڵپەی ئێوە بۆ کەمکردنەوەی پایەی بیری 68 بوو, کە نەیهێشت جێگای تایبەتی خۆی بدەن بە لیڤی شترۆس لە بەخشینی سروشی جوڵانەوەی دژە مرۆڤدۆستیدا. ئەگەر واقیعێکی مێژوویی هەبێت کاری کردبێتە سەر بیری شەستەکان لە فەرەنسا, ئەوە بریتیە لە بێداربوونەوەی وڵاتانی جیهانی سێیەم, زیاتر لە یاخیبوونەکەی مانگی مایس کاریگەریی لەسەر کارەکانی دواتری فۆکۆ هەرچەندێک بووبێت).

**لۆك ڤیری:** بێشك. بەڵام, ئەگەر بونیادگەری یەکێك بێت لە ئامرازەکانی مەرگی خود, ئەوا دەبێت درك بەوەش بکەین کە ئەگەر ئەم ئامرازە ناتوانێت بگاتە کارایی تەواوی خۆی, ئەگەر بە زنجیرەی رەچەڵەك نەپیتێنرێت, کە گریمانەی پێوەستێك دەکات بە مێژووەوە کە لای لیڤی شترۆس هیچ شوێنەوارێکی نیە. بەمجۆرە دەبینین کە لە فەرەنسا, لە شەستەکاندا, مێژوویەتییەکی بونیادگەرای زۆر تایبەت دەرکەوت, ئەمەش لە دیوی مارکسیزمەوە (لای ئالتۆسێر و بۆردیۆ). هەروەها لە دیوی ئەوانەی وەکو فۆکۆ, بە راشکاویی سەر بە هێڵی نیچە یان هایدگەرن.

**ئالان رینۆ:** بە گوزارشتێکی تر, بونیادگەراییەکەی لیڤی شترۆس, لە تروتفاقی بیری 68 دا, تەنها هەر چەند خواستنەوەو لێوەرگرتنێکە, کە ماناکەی بەشێوەیەکی قووڵتر بە هۆی بونیادە فەلسەفییەکانی پێشوازیلێکردنەوە دیاری دەکرێت, کە ئەو کەسێتییە مێژوویە جیاجیایانەی ئاماژەمان بۆ کردن, رسکاندوویانە, لە مارکسەوە هەتا هایدگەر. ئەگەر حەزبکەن, لێرەدا ئەو خواستانە لە بونیادگەریەوە, وەك ئەوە ئیشیان کردووە کە چۆن ئوتومبیلێك دەخوازین, وەك





هۆکارێك تا پێی بچین بۆ شوێنێك، وەلێ هێشتا پرۆژەکە لە دەروەی ئەو هۆکارە دەمێنێتەوە کە دەیخوازینەوە. لێرەدا، پرۆژەکە لە یەك کاتدا دواخەری هەموو وتەزاکان و وێرانکەری خودێتیشە. بۆیە، خواستنەوەی چەند پێدراوێك لە ئەتنۆلۆجیا یاخود ژمارەیەك لە توخمە چەمکییەکان دەربارەی بونیادگەری بە راستی سودمەند دەبێت، وەلێ بە رێگایەك کە لە لایەنی پرۆژەکە خۆیەوە زیاتر دیاری کرابوو.

**لۆك ڤیری:** ئەگەر بتوانم یەك توخمی تریش بۆ ئەم گفتوگۆیە زیاد بکەم: دەڵێم من بە دڵفراوانی دان بەوەدا دەنێم کە ئەگەر سەرلەنوێ کتێبەکە دابڕێژینەوە، ئەوا پشت بە پێرەوێکی زیاتر مێژوویی دەبەستین ــ گەرچی ئەمە تەنها بۆ ئەوە بێت کە ئەو رەخنانە لەبەرچاو بگرین کە ئاراستەمان کراون. لە توێی ئەم تێڕوانینەوە، جیی خۆیەتی "کاریگەریی لیڤی شترۆس" شی بکەینەوە، بەمەش کاریگەریی بونیادگەری لەسەر دژایەتی مرۆڤدۆستیی هاوچەرخ، لەسەر رەخنەگرتن لە بەها دیموکراسییە ئەوروپییەکان بە ناوی جیهانسێیەمییەوە، هتد. کەواتە، سەبارەت بەم خاڵە، من پێموایە بە تەواوی پێکاوتە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا نابێت، بیرمان بچێت کە لیڤی شترۆس لە سەرەتای شەستەکاندا، بە نیسبەتی ئەوانەوە کە ویستیان بڕن بە تیوریستی مێژوو، نەیارێکی بەرچاو نیە، ئەوەی کە هاوچەرخەکان ـ بە تەنها هەر ئەوان نا ـ بەردەوام رەخنەی "نکوڵیکردن لە مێژوو" ی لێدەگرن. کەواتە من بەرهەڵستی ناکەم لەوەی بڵێم ئالتۆسێر و فۆکۆ و بۆردیۆ و هتد نەوەی بونیادگەریین، وەلێ لە هەمانکاتیشدا، نابێت لە پایەی ئەو شڵەقانە کەم بکەینەوە کە مارکسیزم تووشی هاتووە، بە تایبەتی، بۆ ئەوەی هەرچۆنێك بێت بتوانێت بە هەر جۆرێك بێت، بە شێوەیەکی ئاڵوگۆڕ لەگەڵ بونیادگەریدا، یەك یەکتریی هەرس بکەن. هەروەها ئەو پیتاندنە فەلسەفییەی سەرپەرشتی هێنانی مەیلی پێکهاتنگەرایی و مێژووی بۆ ناو بونیادگەری، کردووە، ئەویش هەرس بکات.

**ئالان فینکلیکرۆت:** لە هەمانکاتیشدا، دانەرانی ئەو بەڵگەنامانەی ئێوە رێکیان





دەخەن لە نێوانی خۆیاندا لە مشتومڕێکی بەردەوامدا بوون. گرنگیی ئەوەی لێکیان جیادەکاتەوە, کەمتر نیە لەوەی لێکیان نزیك دەخاتەوە.

**لۆك ڤیری:** ئەگەر بمانەوێت مێژووی فیکریی فەرەنسیی دوای جەنگ دەخەینە روو, واتە ئەگەر پێشینەی فیکریی بیر 68 مان بوێت بکە لەو کتێبەدا بە هیچ جۆرێك ئامانجی ئێمە نەبووە, ئەوا دەبێت ئەم جۆرە گفتوگۆیانە لەپێشچاو بگرین: یەکەم, ئەو جیابوونەوەیەی بونیادگەری بە نیسبەتی مارکسیزمی کۆنینەوە خوڵقاندی, هەروەها بە نیسبەتی ئارگیومێنتەکانی ئارۆن و سارتەر و مێرلۆپۆنتیشەوە, پاشان دەرکەوتنی تیۆریی نوێ بۆ مێژووی "بونیادەکراو" ئەگەر دەربڕینەکە شیاو بێت, کە لە ئاسۆی مارکسیزمەوە هاتوون و هەروا لە نەریتی نیچەییانە یان هایدگەرییانەشەوە هاتوون. بەڵام بەرای من, ناشێت لە لای لیڤی شترۆس, ئەندێشەی بوونی پێکهاتنگەرایی بکەین. هەر بەم مانایەش فۆکۆ, ئالتۆسیریش , بێگومان, دابڕانێکیان لەگەڵ نەوە فیکرییەکانی پێشوودا کرد.

**ئالان فینکلیکرۆت:** بەڵام لای ئەو ئەندێشەکردنی دژایەتی مەیلی مرۆڤدۆستی شیاوەو تەنانەت بیرلێکراوەشە.

**لۆك ڤیری:** دژایەتی مەیلی مرۆڤدۆستی, بێشك, گەرچی مۆرکی ئامڕازییانەی هەڵوێستی لیڤی شترۆس لەوەشەوە هاتووە کە ئەم هەمیشە راشکاوانە وای داناوە کە وەسفکردنی بە ماتریالیست یان کانتیست شتێکی بێمانایە. ئەوەندەی من بزانم, رۆژێك لە رۆژان لیڤی شترۆس بانگەشەی لێپرسراوێتی هەڵوێستێکی فەلسەفیی دیاریکراوی نەکردووە, بە تایبەتی بۆ مەیلی پێکهاتنگەرایی (بۆ مێژووگەرایی). ئێوە باسی "هەستیارێتی" دەکەن, ئەوا با لەسەر ئەوە رێك بکەوین کە "هەستیارێتی"یەکەی لیڤی شترۆس, وەك من بزانم, زۆر کەم شەست و هەشتییە (واتە لە رووی فیکرییەوە سەر بە جوڵانەوەی مایسی شەست و هەشت نیە).

**کرزیستۆڤ بۆمیان:** ئایا هەڵوێستەکان بەو شێوەیە سادە و ئاشکران کە تۆ دەیاەخەیتە روو؟ من بە تایبەتی بیر لە لیڤی شترۆس دەکەمەوە, کە ئەو





پرۆژەیەکی ڕماندنی بنەماکانی هەموو مێژوویەکی جیهانیی لە تەرزی پاش هیگڵییانە، دارشتووە، بە مارکسیستیشەوە، بگرە ئەوەی لیڤی شترۆس بە شێوەیەکی زۆر بەهێزو تۆکمە کردویەتی، زۆر لە مارکسیزمیشی تێپەڕاندووە. بۆ هۆ نیە کە رەخنەی مارکسیزم زۆر رقی لەکتێبی "رەچەڵەك و مێژوو"ە، کە باشترین دەقە لەم تێڕوانینەوە نوسرابێت، هەڵوێستی لیڤی شترۆس بەرامبەری مێژوو، بەرامبەری ئەوەی ناوی دەنێت رەهەندی پێکهێنەریی، بەلای منەوە کەمتر تێوەگلاوە، وەك ئەوەی لە ئارگیومێنتەکانی ئەوکاتەدا دەوترا، لەوەی تۆ بە مەسەلەیەکی جیگیر دایدەنێیت.

**لۆك ڤیری:** من لە گۆشەی مێژووی فیکرییەوە چوومە ناو ئەم گفتوگۆیەوە، نەك لە گۆشەی فیلۆلۆجیاوە، ئایا خودێندنەوەی مارکسییانە بۆ بیری لیڤی شترۆس دروستە یان نا؟ ئەمە مەسەلەیەکی تەواو جیاوازە. دەمێنێتەوە ئەوەی ئەگەر ئەوە راست بێت یان هەڵە، لیڤی شترۆس زۆرجار لە رەچەڵەکییەتی فیکریی حەفتاکاندا وەکو بیریارێکی "نامێژوویی" دەردەکەوێت، کاتێکیش ناچار دەبوو بیر لە بابەتێکی وەکو مێژووگەرایی بونیادەکان بکاتەوە، پێویستیی بە نمونەیەکی چەمکیانەی غەیری مارکسیزمی کۆنینە هەبوو، وەك نمونە هایدگەرییەکەی "مێژووی بە ـ بوون" واتە رێك ئەو بونیادە بنەڕەتییەی کە هەموو سەردەمێك لە سەردەمەکان جیادەکاتەوە. لە راستیدا لە کتێبەکەماندا ئەسڵی ئایرۆنییەکە سەرنجی راکێشاوین، واتە بەیەکگەیشتنی دوو شەپۆلی ناکۆك لە ئەڵمانیا، لە چەند خاڵێکدا: شەپۆلی هایدگەری و شەپۆلی مارکسیی.

**کرزیزستۆف بۆمیان:** بەڵام، با بگەڕێینەوە بۆ هایدگەر، ئەگەر بەرهەڵستیتان نیە...

**ئالان رینۆ:** لە خوێندنەوەی کتێبەکەتاندا، وامان بە خەیاڵدا دێت کە ئێوە لە تویێ ئەو دانەرە فەرەنسییانەوە کە باسیان دەکەن، مەبەستتان لە دانەرێکی ئەڵمانیی لغاوکراوە لە لایەنی ئەو شوێنکەوتووانەوە کە بەشێوەیەکی گشتی بە خووی بۆژۆکەری زاوزێکردن وەسف دەکرێن. ئەو هزرەی ئێوە هێرش دەکەنە سەری بیری هایدگەرە. لێرەوە، زۆر پرسیار دەکرێت. یەکەم: بە رای ئێوە، بۆچی





هایدگەر ئەو ڕۆڵەی بینیوە کە لە بیری فەرەنسیدا گێڕاویێتی؟ دووەم: لە فەرەنسا هایدگەر, یان دوالیزمی هایدگەر ـ نیچە بە شێوازێکی یەکجار نامۆ بە نیسبەتی نەریتی باوەوە, دەردەکەوێت. بە قەدەر ئەوەی نەریتی هایدگەری نیچەیی, لە سەرهەڵدانییەوە لە سەنگەرێکی راستڕەوانەدایە, لە فەرەنسا ئەوەندە بیریارە چەپڕەوەکان هەڵیان گرتۆتەوە. بە نزیکەیی لە هەموو شوێنێك بەم ئاوازە فرۆشراوەتەوە. پێویستە بڵێین کە لە بواری بازرگانیکردنی بیرەکاندا, ئەوە سەرکەوتنێکی جیهانیی بوو, چونکە ئەم کاڵایە بە شێوەیەکی دڵگیر نێردراوەتە دەرەوە. بە هەرحاڵ ئەم وەرچەرخاندنەی هایدگەریزم ـ نیچەییزم و بە چەپکردنی یان لاتریسکە بەستنی بەرەو چەپ, بە هەموو مانا شیاوەکانی وشەکە, لە کتێبەکەتاندا باس نەکراون. من کە باسی ئەمە دەکەم, بۆ ئەوە نیە لێتان بپرسم هۆی چیە, چونکە مافی خۆتانە ئەمە ئاشکرا نەکەن, بەڵکو بۆ ئەوەیە لێتان بپرسم چۆن دەڕواننە ئەم دیاردەیە, بە شێوەیەك شیکردنەوەکانتان لەم دوو ئاستەدا تەواو بکات. بۆچی هایدگەر؟ هەروەها بۆچی ئەم شتە نامۆیە: هایدگەر وەك بیریارێکی چەپڕەو؟

**لۆك فێری:** پێش وەڵامدانەوەی پرسیارەکەتان, ئەگەر ڕێگەم بدەن, حەزدەکەم وتەیەك دەربارەی جیابوونەوەکانی نێوان نەوە فیکرییەکان بڵێم. پێموایە لەو ساتەوە کە سەرلەنوێ ڕۆشنبیرییەکی خۆراوایی دیاریکراو کە پەیوەندیی بەم مەسەلانەوە هەیە, تاوتوێ دەکرێتەوە, ئایدیۆلۆجیا جیهانسێیەمییەکان لەبەر چەندان هۆ هەرەسدەهێنن, هەر دەشبێت وێنەی ڕۆشنبیریش بگۆڕدرێت: واتە ڕۆشنبیر نابێتەوە بەو کەسەی بە چاکی وەزیفەی ڕەخنەیی بەرامبەری دەسەڵات بەرجەستە دەکات, هەرچییەك بێت. ئەوەی ڕۆشنبیری دەگمەن جیادەکاتەوە ئەوەیە لە دیدی ئەودا دەسەڵات هەمیشە خراپەکارە, لە دوو ڕووەوە: خراپەکارە بەوەی دەسەڵاتە, چونکە دەسەڵات لە هیچ حاڵێك لە حاڵەتەکاندا باش نیە, بەڵکو سەرباری ئەوەش چونکە دەسەڵاتێکی ڕەچەڵکئامێزە, پشت بە چینێکی دیاریکراو دەبەستێت.. هتد. بێشك زیاد لە هەر کەسێکی تر, سارتەر و فۆکۆ دوو





رۆشنبیربوون بەرجەستەی ئەم مانا رەخنەییەان دەکرد, بەو بیرۆکەیەی دەڵێت رۆشنبیر متمانەی نیە لەو کاتەوە نەبێت کە دەبێت بە رەخنەگر, کە ئەمەش هەندێجار رێگەی پێدەدات هەموو شتێك بە زەبرەوە بڵێت بێ ئەوەی بەوە شەرعییەتەکەی زیانی لێبکەوێت, لەبەرئەوەی لە جەوهەردا, وەك گاڵتەجاڕی بێت یان وەك هاوکاریی, کەمترین شێوەی ئاکارێتی لێپرسراوێی رەت دەکاتەوە, ئەو دژی دەسەڵاتی پۆڵۆنییە, کەواتە لەگەڵ "هاوکاریی"[11] دایە, دژی شای ئێرانە, بەوەش لەگەڵ خومەینیدایە[12]. دەستەواژە نێودارەکە "باشتر وایە مرۆڤ لەگەڵ

---

[11] سۆڵیدارێتی ( هاوکاریی) یاخود سۆڵیدارنۆی Solidarity or Solidarnoœ بریتیە لەیەکێتییەکی بازرگانیی فرە لایەنە, لە ئەیلولی 1980دا, لەپۆڵەندە پێکهێنراوە. بەسەرکردایەتی لیچ وەسا, کە پیاوێکی کارەباچی بوو, هەروەها کەنیسەی کاسۆلیکی لەپۆڵەندە, بەتەواوی پشتی دەگرتن. هەرزز سۆڵیدارێتی بوو بەهێزێکی سیاسیی و کەوتە سازکردنی رێپێوان و مانگرتن دژی رژێمی کۆمۆنیستیی پۆڵەندە. لەسەرەتای ساڵی 1981دا, ژمارەی ئەندامانی سۆڵیدارێتی گەیشتە 10ملیۆن کەس و لقە جوتیارییەکانیشی نزیکەی 5ر3ملیۆن و نیو ئەندامیان هەبوو. بەمجۆرە سۆڵیدارێتی بوو بەخاوەنی هێزێکی وەها کە دەیتوانی حکومەت بۆژۆ بکات و پەکی کارەکانی بخات. بۆیە لە13ی دیسەمبەری هەمان ساڵدا سەرۆکی پارتی کۆمۆنیست وەژیچ جارۆزیلسکی یاسای عورفیی لەوڵاتدا راگەیاندو, سۆڵیدارێتی لەکارخست و , نزیکەی هەموو سەرکردەکانیشی زیندانی کرد کەلەناویاندا سەرەك لیچ هەبوو. یەکێتی سۆڤێت پشتیوانی لەو کردەوەیەی پارتی کۆمۆنیست کرد.

[12] خومەینی, ئایەتوڵا رۆحوڵڵا Khomeini, Ayatollah Ruhollah (1900?-1989), ناوی تەواوی سەید رۆحوڵڵا ئەلموسەوی ئەلخومەینییە. سەرکردەیەکی ئاینییە, لەتاراوگەوە سەرۆکایەتی شۆڕشە میللییەکەی خەڵکی ئێرانی کرد دژی موحەمەد رەزا شای پەهلەوی, شای ئێران, لەساڵی 1979دا. خومەینی کوڕی سەید موستەفایە, کە زانایەکی ئاینیی بوو, شەش مانگ دوای لەدایکبوونی خومەینی کۆچی دوایی کردووە.کاتێك دایکی و پوریشی دەمرن, تەمەنی خومەینی 15 ساڵان دەبێت و براگەورەکەی بەخێوی دەکات. قورئان لەبەر دەکات و فێری زانستەکانی شیعەش دەبێت. شایانی باسە, لەشەستەکاندا رەزا شا خومەینی لەئێران دەردەکات و, ئەویش روودەکاتە عیراق و ماوەی دوازدە ساڵ دەمێنێتەوەو پاشان لەسەر داوای رەزا شا لە عیراقیش دەردەکرێت و لەپاریس نیشتەجێ دەبێت تاکاتی گەڕانەوەی وەکو رابەری شۆڕشی گەلانی ئێران.





سارتەردا هەڵە بێت"، هتد، دەستەواژەیەکی تا بڵێیت نمونەییە لەمەڕ ئەم وێنەیەی رۆشنبیر کە هیچ مانایەکی نیە تەنها لە توێی دیدێکی بەهایی دەسەڵات و بە هاکانی مۆدێرنیزمی ئەورووپاییەوە نەبێت.

**ئالان فینکلیکرۆت:** لە چوارچێوەی ئەم بەراوردکردنەی رەخنەگرتن لە ئیمپریالیزم و رەخنەگرتن لە تۆتاڵیتاریزم، پێویستییەك هەیە بۆ سەرلەنوێ خوێندنەوەی دەقە نێودارەکانی فەلسەفەی نوێ، بە راستی، چ ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندیی هەبێت بە "بەربەرییەتی بە رووکەش مرۆیی" یاخود بە "چێشتلێنەرو گۆشتی مرۆڤ خۆر" یاخود بە " ئوستادان و بیریارانەوە". ئەو ئامرازانەی رەخنەی رەچەڵەکگەرایی ئەوروپی هێناونیەتە کایەوە، بەکارهێنراون بۆ ریسواکردنی تۆتاڵیتاریزم، بیری شەستەکان دژی روسیا قاو دراوە. ئەمە پاڵی ناوە بە گلۆکسمانەوە، بۆ نمونە، لە " گۆشتی مرۆڤ خۆردا"، بەردەوام ئەم جەختکردنە دووبارە بکاتەوە: ستەمکارییەکی ئاسیایی لە ئارادا نیە، بەڵکو ئەوپەڕی شێوەکانی ستەمکاریی ئەوەیە کە لە زیندانە روسییەکەدا"گۆلاگ[13]" و تۆتاڵیتاریزمدا بەرجەستە بووە. هەر ئەمەشە کە دەمانبات بەرەو تاوانبارکردنی ئایدیۆلۆجیای سەردەمی رۆشنگەریی لە لایەنی بیرنار هینری لیڤییەوە، ئێمە رەخنە لە تۆتالیتاریزم دەگرین، بەڵام بە مەرجێ ئەوەی بۆ زیاد بکەین کە خۆراوا خۆی لێی بەرپرسیارە، لەبەرئەوەی ئێمە لە پێناوی ئەم رەخنەیەدا،کە لە چەند چەمکی بەگژداچوونەوەی رەچەڵەکگەراییەوە سەریانهەڵداوە، ئێمە لەبەردەمی پێکداکێشانێکی تەواو غەریبداین، پێموایە فەلسەفەی نوێ شایستەی ئەوەیە سەرلەنوێ وەك ماوەیەکی

[13] گۆلاگ Gulag یەکێکە لەلقەکانی پۆلیسی نهێنی یەکێتی سۆڤێتی جاران، لەسالانی سییەکانەوە دامەزرێنراوەو بۆ ئیدارەکردنی کەمپەکان، کرێکارە بەبێگارگیراوەکان، لەگەڵ زیندانەکانی گواستنەوەدا. گۆلاگ دەورێکی بالای بووە لە زیندانییکردنی بەلێشاوی خەڵکدا، لەگەڵ ئەو سەرکوتکارییانەی سیستمی تاکرەوی ستالین بەئەنجامی دەگەیاندن، کە بەماوەی تیرۆر ناسراوە. ئەوەی سەیرە لەکەلتوری ئێمەدا، نەك هەر خەڵکی ئاسایی، بگرە زۆرینەی کۆمۆنیستەکانیش ئەم ناوەیان نەبیستووەو، ئەوانەشی بیستبێتیان، بەنهێنی هێشتوویانەتەوە.





جومگەیی بخوێنرێتەوە.

**لۆك ڤیری:** من بە تەواوی لەگەڵیام.

**ئـــالان رینـــۆ:** شایسـتەی ئەوەیـە سـەرلەنوێ بخوێنرێتـەوە بـەو پێیـەی دوایـین پۆخڵبوونی بیری 68 ە یان ماوەی شیتەڵبوونەوەی خودە.

لۆك ڤیری: مادام پێوەست لـە نێوانی فەیلەسوفە نوێیەكان و فۆكۆدا, بە رای من, بریتیە لە كلافیل كە بە هێمنـی رادەگەیـەنێت " مرۆڤایـەتی سێ یـان چوارسـەدەی دوایـی, تۆتالیتـاریزمێكی شاراوەیەو لـە شێوەیەكی شاراوەی روو لـە كەمییدایە, ئەمـە رایەكـە نـەك بـە تـەنها سـادەكردنەوەیەكی بـە شـێوەیەكی دراماتیكییانـە كزركراوەی نەریتی مەیلی مرۆڤدۆستییانەی گرتۆتە خۆی, بەڵكو دەشبێتە هۆی چـەندان هەڵـەی گـەورە دەربـارەی سروشـتی راسـتەقینەی تۆتالیتـاریزم. بـەلای منــەوە, هەڵویســتی كلــۆد لیفــۆر, بــۆ نمونــە, زۆر دروســتترە, كاتێــك دەگاتــە سـەلماندنی ئـەوەی كـە تۆتالیتـاریزمیش نكـوڵیكردنێكی تـەواوە لـە دیموكراسـی "شكڵیی" و مەیلی مرۆڤدۆستییانەی پەتی.

## هایدگەر لە فەرەنسا

**كرزیستۆڤ بۆمیان:** بەراستی ئێمە بایەخێكی سەرەكیی دەدەین بە چاوگی هایدگەری لە بیری 68 دا, بەڵام پێویستە یەكەمجار بڵێین ئێمە لەبەردەمی چاوگێكداین كە بە هەردەم نكولیی لێكراوە. بۆ نمونە هـەموو هـەوڵی دێریدا ئەوەیـە بیسـەلمێنێت كـە بەراسـتی هایدگـەری نیـە, چـونكە لای هایدگـەر جیـاوازی شـتێكی ئۆنتۆلۆجییـە, بەڵام لای ئەو فرە شێوەیە, جیـاوازی سێكسـی, جیـاوازی ئـەتنی یـان هـەر شـتێكی تـریش. هـەروەها رەخنـەش لـە هایدگـەر دەگرێـت چـونكە هێشـتاكە دیلـی بـیری "تایبەتمەندە", بە تایبەتی "تایبەتمەندێتی مرۆڤ", بۆیە مـەیلی هایدگەر هەر بە مرۆڤدۆستانە دەمێنێتەوە! لای دێریدا ئاوا نكولیی لە چاوگی هایدگەری دەكرێت, وەك چـــۆن لای بۆردیـــۆ نكـــولیی لـــە چـــاوگی ماركســـییانە دەكرێـــت, كـــە بـــە خۆشـحاڵییەوە لافـی ئـەوە لێـدەدات كـە ڤێبەرییـە... پاشـان ئـەو شـتەی سـەرنج رادەكێشێت بریتیە لە سەلماندنی ئەوەی چۆن نكوڵیكردن لـە هایدگـەریزم دەبێتـە





هۆی ئەوەی چەند کەسایەتییەك بۆ خۆمان بخوڵقێنین کە رۆڵی خودی هایدگەر بگێڕن, واتە ڕماندنی میتافیزیا و رەخنەگرتن لە خودێتی ئامادە بکەن, بەڵام لە لایەکەوە کەسایەتی فەرەنسیین و, لە لایەکی تریشەوە لێهاتووتر لەو هایدگەرەی کە وەك دەزانین رابردوویەکی کەمێك بێزارکەری هەیە بئاماژەیە بۆ تۆمەتی بوونی پەیوەندیی هایدگەر بە نازییەکانەوە).

**کرزیزستۆف بۆمیان:** سەبارەت بە فۆکۆ, دەتوانم سەرلەنوێ پرسیارەکەم بکەمەوەو هایدگەر بگۆڕم بە نیچە, کەچی هەر دەگەڕێینەوە سەر هەمان ئەو کەسایەتییانە.

**ئالان رینۆ:** نیچە نازی نەبوو!

**کرزیزستۆف بۆمیان:** بێگۆمان نەخێر, هیچ پەیوەندییەکی سیاسیی نیە, بەڵام بەهۆی دەستەبژێرگەراییە ئەرستۆکراسییەکەی و بە چاوی سووك سەیرکردنی چینە میللییەکان, جیگا سیاسیەکەی راستەڕەوانە بوو. بە هەرحاڵ, فۆکۆ حاڵەتێکی زۆر دەگمەنە لە نیچەییزمی چەپڕەو. بەمجۆرە دەچینەوە سەر بیری 68 و لەگەڵ ئەم راستکردنەوەیەشدا, دیسان دەگەڕێینەوە بۆ مەسەلەی "بە چەپکردن".

**ئالان رینۆ:** بۆ ئەوەی لەم بەکارهێنانەی هایدگەر تێبگەین, وای بۆدەچم پێویستە بیبەستینەوە بەوەی ئێستا وترا دەربارەی وێنەی رۆشنبیری شەستەکانی زێدەڕۆ لە رەخنەگرتندا. چونکە بیری هایدگەر, بێ ماندووبوونێکی زۆر رێگەدەدات بە دروستکردنی هەڵوێستێکی تێکرایی بەرامبەری مۆدێرنیزم, بەرامبەری هەموو بەهاکان, لە هەمانکاتیشدا, بەرامبەری هەموو دام و دەزگاکان کە لەوێدا بەهاکانی مۆدێرنیزم دەردەکەون ــ بە شێوەیەکی دیاریکراو هەڵوێستێکی رەتکەرەوەی بنەڕەتی. ئەمەش بە قەدەر ئەوەی خوێندنەوەی هایدگەرییانە بۆ مێژووی خۆرئاوایی لە دیکارت بەدواوە, بوار دەرەخسێنێت بۆ زانینی ئەوەی چۆن زانستی تەکنەلۆجی هەروەهاش دیاردەی تۆتالیتاری و دەسەڵاتی هۆیەکانی راگەیاندن (بیرلۆسکۆنی!) هەروەها بۆمبی ئەتۆمی ـ بە کورتی چۆن هەموو شتێك بە هەمان ئەو شێوازە شیدەکرێتەوە کە تێیدا پرەنسیپی عەقڵیی بووە بە یاسای واقیع! کەواتە بە دەسپێك لە هەندێك لەو بیرانەوە کە من پێدادەگرم لەسەر ئەوەی زۆر





سادەن، دەتوانین نەک تەنها مێژووی فەلسەفە بڕمێنین، بگرە تەنانەت مێژووی هەموو مۆدێرنیزم، ئەویش لە توێی ئەو دیاردانەیەوە کە بە رووکەش زۆر لە یەکتر دەسڵەمێنەوە، ئینجا هەڵوێستێکی رەتکەرەوانەی بنەڕەتیی وەربگرین کە بە تەواوی لەگەڵ هەڵوێستی رۆشنبیری نامەسئولدا جووت دەبێت، ئەوەی کە لە هەر دەزگایەکەوە هاتۆتەدەرەوەو لە پەراوێزدایە، بەشێوەیەکی دیاریکراوتر، ئەوەی ئێستا هاتینە سەر باسکردنی. لەم گۆشەیەوە، بێشك ئەوە هایدگەر بووە کە بواری رەخساند بە پەرەپێدانی بەهێزترین رەخنە لە مۆدێرنیزم، هەروەها بۆ ئەو سەرکەوتنەی هایدگەر لە فەرەنسادا بەدەستی هێنا، هەروەها لە پاڵ هاوردنی چەند هۆیەکی تریشدا، کە رەنگە زیاتر رووکەشیی بن، بەڵام زۆر فەرەنسیترن. بە رای من ئەمە پەیوەندیی هەیە بە "پەیمانگای باڵای مامۆستایانەوە" و بونیادی وتارەوە. چونکە لە فەرەنسا، گەیشتن بە مومارەسەی فەلسەفی بە توێی ئەو بەرهەمە خۆراوابیانەدا تێدەپەڕێت، کە بریتین لەو وتارانەی بە شێوەیەکی تایبەتی لە پەیمانگای باڵای مامۆستایاندا بەرهەم دێن، کە بە دەسپێك لە زانینی زۆر بەراییەوە، دەست دەکەن بە بەرهەمهێنانی چەشنە سیستمێکی بچووککراوە، کە لەوێ مرۆڤ لە توێی بیست لاپەڕەوە، چاو بە سەراپای ئەو مەسەلەیەدا دەگێڕێت کە پێویستە چارەسەر بکرێت، بگرە چارەسەریشی بکات، ئەمە یەکێکە لە رێساکانی ئەم پێڕەوە! ئیتر ئەوەی زانینێکی تۆکمەی هایدگەر رێگەی پێدەدات، لەم گۆشەیەوە، بە تەواوی ساختەی تێداکراوە، بەوەی هێندە بەسە مرۆڤ فێر ببێت چۆن ڕماندنی هەموو مێژووی فەلسەفە کاردەکات، لە کۆمارەوە هەتا زەردەشت، لە توێی خوێندنەوەی بەشی دووەمی کتێبەکەی نیچە بۆ نمونە، هەتا پێشوەخت یان نزیکە پێشوەخت، بتوانێت ئەو بەراوردکردنە بە سەلیقەو ناوازەیە لە نێوانی ئەو "دانەرانە"دا بکات کە وتارە چاکەکان پێکدەهێنن. کەواتە، پێموایە لانیکەم دوو فاکتەری نافەلسەفیی هەن کە سەرکەوتوویی هایدگەر لە فەرەنسا لێکدەدەنەوە، لەگەڵ ئەو رۆڵە زۆر لاوازترەی کە لە فەلسەفەی ئەڵمانیدا دەیگێڕێت: لە لایەکەوە، دیاردەی نازیزم و چەپاندنەکەی، رۆڵی سەرکوتکەرێکی





ئاشكرای بینی, لە لایەكی تریشەوە, فەرەنسییەكان, نەك ئەڵمانەكان, ئەوانەن كە وتارەكان دەنوسن, لەم گۆشەیەوە, لای قوتابییەكانم ــ بە روونی ئەمە دەناسمەوە!
ــــ كــە بونیــادی گوتــاری هایدگــەری بەشــێوەیەكی دیــار لەگــەڵ زەرورەتــی مومارەسەكردنی هونەری وتار بە شێوەیەكی كاریگەردا دەسازێت, لەگەڵ بوونی نزمترین ئاستی زانینیشدا ــ دەشتوانین لە درێژەو تەفاسیلدا ئەمە بسەلمێنین.
بێگومان من ناڵێم رۆشنبیریی پەیمانگای باڵای مامۆستایان پاساو بۆ بیری 68 دەهێنێتەوە, بەڵكو لە كۆتاییدا شتێكی لەم بابەتە لە مومارەسەی هەندێك لە ناسراوترین بیریارانی ئەم بیرەدا هەیە...

**كرزیزستۆف بۆمیان:** لەبەرئەوەی ئەم دوو فاكتەرە گرنگن, حەزدەكەم تۆزێكی تریش باسی بەیەكگەیشتنە فەرەنسییەكە بكەن, بە تایبەتی لە نێوانی بیری هایدگەر و هەڵوێستە سیاسییە چەپڕەوەكاندا. ئێوە بە راستی دەڵێن هایدگەر رەخنەگرە لە مۆدێرنیزم. بەڵام لە تێڕوانینە فەرەنسییەكەوە ئەمە بەس نیە, چونكە دەشێت بەچەندان شێوەی زۆر جیاواز رەخنە لە مۆدێرنیزم بگیرێت. گرنگ ئەوەیە لە حاڵەتە فەرەنسییەكەدا, رەخنەی هایدیگەرییانەی مۆدێرنیزم لە جێگایەكدا بەستراوە بە رەخنەگرتن لە سەرمایەداریی و هەژمونی بۆرجوازییەت و خۆراوا, خۆراوا بۆرجوازییە, سەرمایەدارە, هتد... واتە لەگەڵ ماركسیزمدا پێوەست دەبێت. رەنگە پێویست بكات كەمێك لەم دیاردەیەدا قووڵ ببینەوە هەتا ببینین كە چۆن و بە چ هۆكارێك ئەم بەیەكگەیشتنە لە نێوانی هایدگەردا روودەدات كە بە ناوی ئالودەبوونی لادێوە رەخنە لە مۆدێرنیزم دەگرێت ــ چونكە ئەمەیە مەبەستەكە لە نێوانی خەڵكانێكدا كە بە ناوی ئایندەیەكی پرشنگدارەوە رەخنە لە سەرمایەداریێتی دەگرن, تەنانەت ئەگەر ئەو ئایندەیە بە تەواوی هاوشێوەی ئایندەی ستالینییانەی پارتی كۆمۆنیستی فەرەنسی نەبێت, لە پەنجاكاندا. حەزدەكەم دەربارەی ئەم خاڵە زیاترتان لێببیستم.

**لۆك ڤیری:** تا رادەیەك, دەشێت زمانی هایدگەری و زمانی ماركسی بە تەواوی لە بابەتی رەخنەگرتن لە عەقڵی ئامرازییدا تێكەڵاو ببن, واتە ئەو عەقڵەی دەشێت





وەکو عەقڵێکی تەکنیکی ـ میتافیزیایی وەسف بکرێت وەك چۆن دەتوانرێت وەکو عەقڵێکی قازانجگەرا ـــ سەرمایەداریی وەسف بکرێت. بێشك دەمێنێتەوە ئەوەی دوورتـــر لـــەم ســـاتە هاوبەشـــە, بـــە شـــێوەیەکی حـــەتمیی مارکســـییەکان و هایدگەرییەکان لێك جیادەبنەوە, بەو حسیبەی کە ناشێت هایدگەرییەکان پرۆژەی کۆمەڵگایەکی بێ چین بە ئامانجێکی پێشبینیکەرانەو ستەمکارانەی میتافیزیایی دەبینن و هیچی تر.

**کرزیزستۆف بۆمیان:** دیکارتیش!

## لە مارکسەوە بۆ فۆکۆ

**لـــۆك فـــیری:** لـە گۆشـەیەکی دیـاریکراوەوە, بـەڵێ بێشـك. کەواتـە لـە کۆتاییـدا جیابوونـەوە ڕوودەدات. دەمێنێتـەوە ئـەوەی سـاتە هاوبەشـەکە, کـە دژی مـەیلی مرۆڤدۆستییانەیە, لەناو ڕەوتـی ڕۆشـنبیریی فەرەنسیی شەستەکان و حەفتاکانـدا زۆر دیـارە, کـە ئـەم ڕێگـە دەدا بـە کتێبێکـی وەك "چـاودێری و سـزا" ی فۆکـۆ, ڕەخنەیـەك بـۆ کۆمەڵگای نوێ پێشکەش بکات کە لە کرۆکدا لـە لایـەنی داڕشتە مارکسییە جیاجیاکانەوە پەسەند بکرێت, ئەوانەی کە هێشتا لـە نـاو چەپرەویی ڕۆشنبیرییدا گوزارشت لە خۆیان دەکەن. کە ئەمەش بە هیچ جۆرێك ڕێگە لە فۆکۆ ناگرێـت مـارکس یەکسـان بکـات بـە هـێگڵ, وەکـو یـەکێك لـە هـەرە گرنگترینـی لێپرسـراوەکان لـەم ڕۆشـنبیرییە دیالەکتیکییـە کـە گوزارشـت لـە لوتکـەی مـەیلی مرۆڤدۆستییانەی نوێ دەکات, بەمـەش گوزارشـت لـە لوتکـەی میتافیزیـای خـودی دەکات.

**ئـــالان فینکلیکـــرۆت:** ئەگـەر ڕاسـت بێـت ئێمـە لـە "چـاودێریی و سـزا" دا چـەند شـیکردنەوەیەك بدۆزینـەوە کـە لانیکـەم بـە ڕووکـەش ئـەم کتێبـە بداتـە پـاڵی مارکســیزم, ئـــەوا پێموایـــە توخمێکیشـــی تێدایـــە, کـــە بـــە تـــەواوی لـــەوەی دووردەخاتــەوە, مەبەسـتمان لـە ڕەشـبینییەکەی فۆکۆیـە. لای مـارکس دیـدێکی گەشـبینانە هەیـە بـۆ ئەوشـیتاڵبوونەوەیەی لـە کۆمـەڵگای بۆرجوازییـدا سـەری





هەڵـداوە, لەکاتێکـدا فۆکـۆ پێـی وایــە مـۆدێرنیزم تەشــەنەکردنە (لــەناو ئــەم شیتاڵبوونەوەیەدا).

**لۆک فێری:** کەمترین شت کە بوترێت ئەوەیە سەرباری هەموو شتێك, لەسەر ئاستی زمان, گەمەیەکی دووسەرە هەیە کە وەستایانە داڕێـژراوە: چونکە وەکو دەزانین, رەخنـەی مارکسیی لـە مـەیلی مرۆڤدۆستی, شـتێك لـە ئـەرێیی دەخاتـە سـەر ئـەم بۆرجوازییەتە, کە وا گریمانە کراوە قۆناغێك بێت بەرەو ئایندەیەکی باشتر, ئیتر خڵتەو خاشاکی هەرچی بێت. لـە کاتێکدا کـە رەشبینییە هایدگەرییەکە ـ ئەگەر بۆمان هەبێت ئەم دەستەواژە زۆر ناسازە بەکاربهێنین ـ لەوەوە دێت کە مـۆدێرنیزم بـە هـیچ جۆرێـك رێخـۆش ناکـات بـۆ ئایندەیـەکی باشـتر, بـە جۆرێـك کـە نمونـەی مارکسیزم بۆ کۆمەڵگایەکی بێ چین لوتکـەی میتافیزیـاو خودێتی گشتێنراوە, بە پێی ئەو گوزارشتەی کە هایدگەر لە "مەسەلەکان" دا بەکاری هێناوە.

**ئــالان رینــۆ:** لـە تـوێی ئـەم جیاوازیانەشـەوە ئـەو هەلـەمان بـۆ دەرەخسـێت کـە هەڵوێسـتی هایدگەرییانــە دەیرەخســێنێت بــۆ داگیرکردنــی جێگایــەکی هێــزی دەگمەن, چونکە رێگا دەدات سەلماندنی ئەوەی رەخنەی مارکسیی لە مۆدێرنیزم, کـە ویسـتویەتی بنـەڕەتی بێـت, بـێ ئـەوەی بـە خـۆی زانیبێـت کەوتۆتـە نـاو مۆدێرنیزمێکـەوە کـە کرۆکـە راستەقینەکەی ناناسـێتەوە: دەشـێت رێگـا پیشـانی رێبەران بدرێت, ئەمەش هەمیشە شتێکی خۆشە!

**کرزیزستۆف بۆمیان:** ئایا رازیـن بـەوەی بڵێین ئـەم رەگوریشـە سـازییە بـۆ رەخنـە, بە نیسـبەتی رەخنــەی کۆمۆنیزمــەوە, دەگاتــە نــەبوونی شــێمانەی بــەردەوامبوونی مۆدێرنیزم لە ئایندەدا, ئەگەرچی وەك گوێزانـەوەش بێت, گەرچی ئـەم مەسـەلەیە لە پرۆژەی مارکسیشدا هەیە, بەوەی پرۆلیتاریا میراتگری بۆرجوازییـەو میراتگری هەموو کردەوە ئەرێیەکانیشێتی, لە کاتێکدا لە تێڕوانینی هایدگەریدا هیچ شتێك نیە بۆ ئەوەی بە میرات بمێنێتەوە, بـەڵکو پێویسـتە هـەموو شێکی ئـەم کۆمەڵگایـە رەت بکرێتەوە, کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئـەو گاڵتـەو قۆشمەییـەی کـە نایانهێنمـەوە بیرتان, هەرچۆنێك بێت ئێوە لە من باشتر دەیزانن.

**ئالان رینۆ:** بە نیسبەتی رەخنەی مارکساوییانەوە, تێڕوانینی هایدگەری بە راستی رێگەدەدات ئەو نالێپرسراوێتییەی هەڵوێستی رۆشنبیری زێدەڕۆ لە رەخنەگرتندا دیاری دەکات, تۆکمەتر بکرێت, چونکە لە راستیدا, شتێکی وا لە ئارادا نیە سودی بۆ دەزگا گوزارشتکەرەکان لە بەهاکانی مۆدێرنیزم هەبێت, بەڵکو ـ بە پێچەوانەی مارکسیزمەوە ـ شتێك نیە پێویست بێت بکرێت: وەك هایدگەر لە دوا دواییەکانی تەمەنیدا, دەیووت "نابێت هیچ شتێك بکرێت, بەڵکو تەنها چاوەڕوانی بکرێت", "چاوەڕوانیی پەرجوویەك لە ئەفرێنەرەوە" یاخود هاتنی خوداوەندێك "کە تەنها ئەو دەتوانێت رزگارمان بکات". ئەگەر لێرەدا بوارێك نەمابێت بۆ ئەوەی لە گۆشەی دەسەڵاتێکی شێمانەییەوە کە دامودەزگاکان بەڕێوە دەبات, بڕوانینە مەسەلەکە و پرسیار بکەین, پێویستە چی بکرێت: بەم جۆرە بنەما فەلسەفییەکانی نا لێپرسراوێتیی رۆشنبیران کۆدەبێتەوە, ئەو کاتەی هێشتا لە تێڕوانینی مارکسیزمدا, بێشك بێ گریمانەی بەسوێ نا, گۆشەنیگایەکی "خەباتگێڕانە" ی بەسەرخۆدا کەنارگیر هەبوو کە بیرۆکەی هەڵگرتنی پەرپرسیارێتی مێژوویی لە خۆیدا هەڵگرتبوو.

## نیچە دژی ئەفلاتون

**ئالان فینکلیکرۆت:** لە کتێبەکەتاندا, رۆڵێك دەدەن بە نیچە کە هاوشانی رۆڵی هایدگەرە, روونی دەکەنەوە لە کوێدا بیری 68 کەتۆتە ژێر کاریگەریی نیچەوە, بە تایبەتی لە تویێی فۆکۆوە, بەهەرحاڵ یەکێك لەو بەرنامانەی نیچە بۆ فەلسەفە دیاری کردوون بریتیە لە ڕماندنی ئەفلاتونیزم. پاشان هەریەکە لە فۆکۆ و دۆلۆز و ژمارەیەك لە سیما دیارەکانی شەستەکان بە راشکاویی ئەم بەرنامەیەیان هەڵگرتەوە. ئەفلاتوون چاکەی لەسەروو هەموو شتێکەوە دادەنا کە بوونی هەیە. وەلێ دژایەتیکردنی مەیلی مرۆڤدۆستی , بە پێچەوانەوە, دەڵێت هیچ شتێك لە سەرووی ئەوانەوە نیە کە هەن, هیچ لە سەرووی مێژووەوە نیە. هیچ لە سەرووی رۆشنبیرییەوە نیە. لەم رووەوە مێژووگەرایی هەندێك و فەرهەنگی هەندێکی تر, دەگەنە هەمان ئەنجام, دەگەنە هەمان رێژەیەتی: مرۆڤ لە ئارادا نیە, بەڵکو چەندان





مرۆڤایەتی جیاجیاو ناتەبا لە گۆڕێن. کەچی هەرگیز باسی ئەم دژایەتییکردنەی مەیلی مرۆڤدۆستی و مەیلی ئەفلاتونی ناکەن, وای بۆ دەچم ئێوە باسیان ناکەن ــ ڕەخنەکەی من لێرەدایە ــ چونکە بە شێوەیەکی شەخسی لە نێوانی کۆنینەکان و نوێگەراکاندا, مومارەسەی دژایەتییەکی زۆر ریشەیی دەکەن کە تووشی مەترسی مێژووگەرایی دێت کە خۆتان زۆر لێی ناڕازین, وادیار بیری ئەفلاتونی لای ئێوە تاوانبارە, چونکە بەشێکە لە جیهانێك کە پێشتر ڕزگارمان بووە لێی, پاشان گەڕانەوەتان بۆ لای نوێگەراکان, بە تایبەتی کانت, ڕێگەی ئەوەتان لێدەگرێت کە هەتا کۆتایی لەسەر لێپرسینەوەکە بەردەوام بن, بە تایبەتی دەرککردن بەم دژایەتییەی مەیلی ئەفلاتونی کە شتێکی بنەڕەتییەکە لە بیری 68 دا.

**لــۆك فــیری:** لە ڕاستیدا دەشێت ئەم پرسیارە بە دەستەواژەی کانتییانەو دەستەواژەی تۆکیفیلییانەش بکرێت. ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە یەکێك لە مەسەلە هەرە گرنگەکانی کۆمەڵگا نوێیەکان, ئەو کۆمەڵگایانەی خودێتی یان تاکێتی تێیاندا بەرکەماڵە, بریتیە لە سەرلەنوێ بیرکردنەوە لە شێوازی سەربەخۆیی و شێمانەی بالابوونی هەندێك پێوانە ــ کە بریتیە لە بالابوونێك بەردەوام بە ناوی مێژووگەرایی و ڕێژەییەوە بە توندی هێرش دەکات. مەسەلەکە تەنها پەیوەندی بە مەسەلەی "ئاکارێتی" یەوە نیە, بەڵکو بەوپەڕی سادەیی شێمانەی خودی پەیوەندیکردن (ئەگەر هەموو شتێك جیاوازیەکی پەتی و خودێتییەکی پەتی بێت, ئەوا چۆن دەتوانین ئەنێشەی گرووپ بکەین؟). ناڕەحەتییە گەورەکە لەوەوە دێت کە لە مۆدێرنیزمدا لە ناوەوەی بازنە خودییەکەوە نەبێت, ناتوانین بیر لە بالایی بکەینەوە یان هەڵی بسەنگێنین (نەك لە گەردونێکی نامرۆییدا, وەك دێرینەکان دەیانکرد). لێرەوە دەشێت گەڕانەوە بۆ کانت یان هۆسرێل بەسود بێت. چونکە بە پێی گوزارشتی هۆسرێل, ئامانجی ئەوان بریتیە لە بیناکردنی "بالایی لە جێگەدا" واتە لەناو جیهانێکدا کە جیهانی هەست و خودێتییە (کە ئەمەش بە هیچ جۆرێك نائاگاداری لە ڕەهەندی نەست بە دوای خۆیدا ناهێنێت, بەڵکو ڕێك بە پێچەوانەوە). وادیارە بە نیسبەتی ئەم





گرفتەوە, گەڕانەوە بۆ ئەفلاتون لە شوێنی خۆیدایەتی. ئەی ئەو بیریاری "هەموو مێژوو" نیە (واتە لە هەموو سەردەمەکاندا بە سەرکەوتوویی ئامادەیە؟ وەڵێ دوای لێوردبوونەوەی لە نزیکەوە, پێموایە بیری ئەفلاتونیانە لەمەڕ باڵایی بیرەکان, لە دەرەوەی چەشنە کۆزمۆلۆجیایەك مانای نیە, کە بەلاشمەوە قورسە بزانم چ سودێکی هەیە ئەگەر بیهێنینەوە بۆناو کاتی ئێستامان. بۆ نمونە, ناتوانین بونیادی ریزبەندی کۆمار, بە پادشا فەیلەسوفەکانیەوە لە لوتکەدا و جەنگاوەرەکانی لە ناوەڕاست و پیشەوەرەکانیش لە بنکەدا, بخەینە ئەستۆی خۆمان ــ ئەمەش ریزبەندییەکە دەزانین چۆن لە گەردونێکی تاکانی بچوککراوە دەچێت کە پێکهاتووە لە عەقڵ و ئازایەتی و ئارەزوو. ئێمە لێرەدا لەبەردەمی سیستمێکی گەردوونیداین کە یەکەم, هەرەسی هێناوە (ئەمەش مەسەلەیەکی تەواو واقیعییانەیە, چیتر سەر بە کەلتورەکەی ئێمە نیە) هەروەها دووەمیش, نازانین چۆن ئیمڕۆ سەرلەنوێ بەشێوەیەکی جدی لێپرسراوێتییەکەی وەئەستۆ بگرین.

**ئالان فینکلیکرۆت:** گومان لەوەدا نیە کە زەحمەتە ئەمڕۆ مرۆۋ بە تەواوی ئەفلاتونی بێت, وەڵێ ناتوانن نکولی لەوە بکەن کە ئەو دوو دانەرەی کردوتانن بە نیشانە, ویستوویانە بە راشکاوی دژی ئەفلاتونیزم بن, ویستوویانە سەرلەنوێ جەنگی سۆفیستاییەکان دژی ئەفلاتون بەرپا بکەنەوە.

**لۆك ڤیری:** بەڵام لەبەر چەند هۆیەکی جیاواز, چونکە ئەوان لە ئەفلاتوندا نمونەی عەقڵانییەت دەبینن.

**کرزیستۆف بۆمیان:** ئەوەشی بۆ زیاد بکە کە ئەوەی لە نەسکی یەکەم و دووەمی کتێبەکەتاندا نوسیوتانە, کاتێك خەسڵەت و نیشانە جیاکەرەوەکانی بیری 68 دەبژێرن, لەوێدا نکوڵیکردنێکی تایبەت لە حەقیقەت هەیە. بە هەرحاڵ ئەگەر فەیلەسوفێك هەبێت, کە لە لای ئەو وشەی حەقیقەت مانایەکی هەبێت, ئەوە رێك ئەفلاتونە. پاشان زۆرینەی ئەو نیشانانەی دیاریتان کردوون, بە شێوەیەك لە شێوەکان دەچنە ناو جۆرێك لە دژایەتیکردنی ئەفلاتونیزمی رەهاو دژایەتیکردنی





عەقڵانییەت.

**ئـــالان رینـــۆ:** هەنـدێجار خۆشمـان نوێنـەرانی بـیری 68 مـان بـە فەلسـەفەلێدەران نـــاوبردووە، وەلێ ئـــەوەی پێویســـتە بیـــزانین، بریتیـــە لـــە هەوڵـــدانیان بـــۆ دوبارەکردنەوەی هەڵوێستە سۆفیستاییەکە دژی ئەفلاتون. لـە راستیدا ئـەوەی لـە نـاو ئەفلاتونیزمـدا، کردویانـە بـە ئامـانجی هێـرش، بریتیـە لـە دەرکـەوتنی ئـەم نمونەیـە، ئـەویش دەرکەوتنێکـە هێشـتا تەژمـە، چـونکە قەشـەنگی ئـەفلاتون و یۆنانییەکان، چ بە نیسبەتی هایدگەرەوە یان فۆکۆ، ئەوەیە، لـە لایەکـەوە، مـزگێنی باڵکێشانی عەقڵ دەدەن، بەڵام لە لایـەکی تریشـەوە، تێگەیشـتنی عـەقڵ و خودیـان نەخسـتۆتە ئەسـتۆی خۆیـان: ئەمـەش ئـەفلاتونێکی بـاش و ئـەفلاتونێکی خراپـی لێدەکەوێتەوە ـ ئەمە لە هایدگەریشدا هەیە، بە تایبـەتی دەقەکـەی لەمـەڕ پێڕەوی حەقیقەتی ئەفلاتونییانـە ــ هـەروەها یۆنانییە باشـەکان و یۆنانییە خراپـەکانیش، وەك لای فۆکـۆ دەیبیـنین، لـە هـەردوو بەشـی دووەم و سـێیەمی "مێـژووی ژیـانی سێکسی" دا. بۆیە ئەو دژایەتیکردنەی ئەفلاتون کە ئێوە باسی دەکەن، لەگەڵ ئـەم ئـــارەزووەی خوێندنـــەوەی ئەفلاتونـــدا رێکدەکـــەوێت، بەوپێیـــەی نـــەك تـــەنها رێخۆشکەرێکی لاوەکی مەسیحییەتە، بەڵکو هی عەقڵانییە نوێگەراکانیشە...

**ئـــالان فینکلیکـــرۆت:** سـەرباری هـەموو شـتێك، ناتـەبایی دێرینـەکان و تازەکـان، بـە توندی لەو بەردەوامیە کەم دەکاتەوە...

**ئالان رینۆ:** بێگومان، بەڵام من دووپـاتی دەکەمـەوە کـە ئـەم دژایەتییـەی ئـەفلاتونیزم لە بیری 68 دا لەسەر بناغەی بۆچوونێکی هایدگەری ـ نیچەیی بینادەکرێت، پێـی وایـە هـەموو میتافیزیایـەك ــ وەك هایدگـەر دەڵێـت ــ بریتیـە لـە ئەفلاتونیزم، نـەك تەنها لەبەرئەوەی گریمانەی بوونی جیهـانێکی تـر دەکات بۆ دیاردەکە، بـەڵکو بـە تایبەتی لەبەرئەوەی ئەفلاتون سـەردەمی عەقڵانییـەتی بـەرپاکردووە. تەنانـەت ئـەو هەڵوەستە گەورەیەی لەگەڵ مۆدێرنیزمدا دەردەکەوێت وەکو سـاتێك راڤـە دەکرێـت کـە رێگـە دەدات بـەوەی بـە شـێوەیەکی زیـاتر ریشـەیی ئـەوە تـەواو بکـات کـە لای ئەفلاتون مـزگێنی پێدراوە، واتـە نرخانـدنی عـەقڵ بـە نیسـبەتی نیچـەوە، هـەروەها





بیری ئامادەیی، بە واتای شێمانەی بینین، کە تێگەیشتنی نوێی واقیع وەکو بابەتێك بۆ خود بەرجەستە دەکات، بە نیسبەتی هایدگەرەوە. بەم مانایەش ئاسانە بۆ ئێمە تێبگەین بۆچی دەبێت رەخنەگرتن لە ئەفلاتون ساتێکی گرنگ بێت لە ستراتیجێکی فەلسەفییانەی لە ناوەڕۆکدا دژ بە مۆدێرنیزم: چونکە رەخنەگرتن یان بە هەرحاڵ گفتوگۆکردنی ئەفلاتون (بۆ نمونە دەتوانین لەو پیادەکردنە لێهاتووانەی دێریدا بکەینەوە لەو تێکستەدا کە بە ناونیشانی "دەرمانخانەکەی ئەفلاتون"ەوە نوسراوە) مانای هێرشکردنە سەر قووڵترین رەگوڕیشەکانی مۆدێرنیزم دەگەیەنێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت تۆ بێیت بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ بیری 68 دا، سەرلەنوێ ئەفلاتون هەڵبگریتەوە بۆ ئەوەی دژی فەلسەفەلێدەرەکان، داکۆکی لە ئەفلاتون بکەیت: چونکە ئیمڕۆ چیتر مەرجەکانی بیری حەقیقەت هەمان ئەوانە نین کە تێرامانی ئەفلاتونییانە لە حەقیقەت لە چوارچێوەیاندا پەرەی سەندووە، ئێمە لە سەردەمێکی فیکریی وادا دەژین کە لە سەرهەڵدانی مۆدێرنیزمەوە، بە دەسپێك لە خودێتییەوە (دیکارت)، هەروەها لەناو خودێتیدا (کانت)، مەسەلەی حەقیقەت خراوەتە روو. بەم مانایەش لەبەریەکهەڵوەشانی سۆفیستی نوێی شەست و هەشتی ناگاتە هیچ ئەفلاتونیزمێکی نوێ: بۆ سەلماندنی ئەمە، پێویستە وەکو هایدگەر درك بەوە بکەین، کە مێژووی فیکر مێژوویەکی هێڵی بووە، جیابوونەوەی دێرینەکان / نوێیەکان لە یەکتری جگە لە ساتێك لە ناو یەك مێژوودا، شتێکی تر نەبووەو لە توێی ئەم جیابوونەوەیەوە ماناکەی کامڵ بووە. ئەگەر ئێمە زیاتر وریای ناتەبایی دێرینەکان و نوێخۆزاەکان بین، ئەوا گفتوگۆی ڕماندنی میتافیزیا[14] بەو رەچاوەی لە هەموو لایەکیەوە ئەفلاتونییانە بێت، بە هیچ جۆرێك نامانباتەوە بۆ سەرەتای

---

[14] میتافیزیا ,Metaphysics لقێکی فەلسەفەیە، بایەخ دەدات پشتەوەی واقیع. دەبێت بەدوو بەشی سەرەکییەوە: ئەنتۆلۆجیا، کە بایەخ دەدات بەوەی چۆن چەشنە جیاجیاکانی هەبوون، لە گەردووندا دەردەکەون. لەگەڵ میتافیزیای بنەڕەتیدا کە بایەخدەدات بە خەسڵەتە گشتییەکانی حەقیقەت.





(ئەفلاتونیزم), ئەوەی ئەم رماندنە رەخنەی لێدەگرێت: لە نێوەڕاستی مۆدێرنیزمی مشـتومالکراودا بـەم جـۆرە خوێندنەوانـە, ئیمـڕۆ پێویسـتی بـە راسـتکردنەوەی شیاوەکان هەیە.

**کرزیستۆف بۆمیـان:** پێموایە یەکێك لە خەسڵەتە مێژووییەکانی فۆکۆ لەوەدا وێنا دەبێت کە بابەتگەلێکی وەکو تاراوگەو زیندان و ژیانی سێکسی بەرز کردۆتەوە بۆ ئاستی بابەتە فەلسەفییەکان. ئیتر هەڵوێستی لە هەریەکێك لەم بابەتانەدا هەرچی بێت, هـەروەها ئـەو بـیرو رایانـەی گوزارشـتی لێکـردوون, هەرچـی بـن, هـەروەها بـەهای مێـژوویی کارەکـەی هەرچـەند بێـت, کـە دەزانـین چـەندان ئـارگیومێنتی وروژاندووە, بە تایبەتی لە مەسەلەی زینداندا, ناتوانین نکولی لەوە بکەین کە ئەو فەیلەسوفێك بووە هەوڵیداوە لـە جیهانی داخراوی تێکستە فەلسەفییەکان بچێتە دەرەوە, هەوڵیداوە لە بابەتێك فەلسەفە دروست بکات کە بەشێوەیەکی تەقلیدی سـەر بـە بابەتـە شـیاوەکانی بیرکردنـەوەی فەلسـەفییانە نیـە, بـە تایبـەتی بیرکردنـەوەی فەلسـەفییانەی فەرەنسـە. بـە هـەر حـاڵ لـە کـاتی خوێندنەوەتانـدا, لێـرەدا تـەنها بیر لـە کتێبەکـەی لەمـەڕ بیری 68 ناکەمەوە, بـەڵکو سـێ بەرگەکـەی فەلسەفەی سیاسـی و وتـارە کۆکراوەکان لـە "سیستم و رەخنـە" دا, مرۆڤ هەست دەکات ئێوە بەردەوام و بەشێوەیەکی تۆکمەو بەپێزییەکی بـەردەوام, دەگەڕێنـەوە بـۆ دەقـە فەلسـەفییەکان خۆیـان. جیهـانی ئێـوە جیهـانی کەلـەپوری فەلسـەفییە. دەتـوانن پرسیارەکەم وەك نـاڕەزایی تێبگـەن یـان نـا, بـە راسـتی ناڕەزاییشـە, وەلێ ئەمـە ئـەو لایەنـە نیـە کـە بەلامـەوە گرنگـە, ئێمـە لێـرە نـین بـۆ ئـەوەی گفتوگـۆی هەڵوێسـتە تایبەتییـەکانمان بکـەین. ئـەوەی دەمـەوێت ئەوەیـە هەڵوێسـتی خۆتـان سەبارەت بەم خاڵە بخەنە روو: ئایا بە راستی پێتـان وایـە ــ ئەگـەر وەڵامتـان ئـەرێ بێت بەڵگەتان چیە ــ کە رێنیسانسی فەلسەفە (کە ئێمە پێویستییەکی زۆرمـان پێیـەتی, پێشـموایە لەسـەر ئەمـە کـۆکین) هـەر دەبێـت لـە گەڕانـەوەی کەلـەپوری فەلسەفی, بۆ بیرێك کـە پێوەستە بـە جیهانی فەلسـەفییانەی تەقلیدی و تێکسـتی فەلسـەفییەوە کـە بریتیـە لـە تاکـە چـاوگ بـە نیسـبەتی ئـەوەوە؟ بـە شـێوەیەکی





گشتیتر، پێمخۆشە روونی بکەنەوە کە چۆن ئەندێشەی پەیوەندییەکانی نێوانی فەلسەفەو نا فەلسەفە دەکەن.

## گەڕانەوە بۆ کانت

**ئالان رینۆ:** حەزدەکەم یەکەمجار بیرتان بهێنمەوە کە ئێمە تەنها بۆ تێکستە فەلسەفییەکان ناگەڕێینەوە. بۆ نمونە، کاتێك باسێك تەرخان دەکەین بۆ مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ (فەلسەفەی سیاسی، بەشی سێیەم)، دیاردەی چالاککردنی نیشانەکردن بۆ مافەکانی مرۆڤ لە گوتاری سیاسی نوێدا، رەچاو دەکەین، بۆیەژمارەیەك لەو بەرهەمە فیکرییانە شیدەکەینەوە کە بێشك ناچنە ناو خانەی تێکستە فەلسەفییە باوەکانەوە. بە هەمانشێوە، کاتێك لەم کتێبەدا خۆمان دەدەین لە مەسەلەی لیبرالێزمی زێدەڕۆی هایکدا، ئەوا ئاشکرایە کە ئێمە دەست نابەین بۆ مەسەلەیەکی بنەڕەتی لە کەلەپوری فەلسەفیدا. لەگەڵ ئەوەشدا، گەڕانەوەی بەردەوام بۆ تێکستە گەورەکانی کەلەپوری فەلسەفی رۆڵێکی زۆر گرنگی هەیە. چونکە لە مێژووی فەلسەفەدا، چەند نمونەیەك پێکهاتوون بۆ راڤەکردنی واقیع، یان ئەگەر پێمان خۆش بێت، چەند نمونەیەکی هەڵوێستگەرا بەرامبەری بابەتێتی. بە هەرحاڵ، بە هۆی ئەم نمونانەوە، کە ژمارەیان سنورداره، بە خستنەگەڕیان بە شێوەیەك لە شێوەکان وەکو نمونەی ئیدیاڵ بۆ ئۆنتۆلۆجییەکان، دەتوانین تۆکمەیی و دروستی گوتارگەلێك تاقیبکەینەوە کە چیتر گوتاری فەلسەفی نین، بەڵکو بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن و بە شێوەیەکی نیمچە تەواو، تۆکمەیی نمونە فەلسەفیەکان دەگوازنەوە کە ئەوانیش دیسان دوای ئەنجامدانی هەموو پێداویستیە زەرورەکان، هەندێك لە نارەحەتیەکانیان دووبارە دەکەنەوە، لە کاتێکدا خەریکی بەکارهێنانی چاوگەکانیانن. نمونەیەکی سادە وەردەگرم: ئیمڕۆ لیبرالیزمی نوێ لە پێناوی رەخنەگرتن لە دەستێوەردەریی دەوڵەتی پارێزەردا، تیوریی "دەستی نهێنی" کۆن دەچەسپێنێت، ئەوەی بوارمان دەدات باوەڕبێنین کە پێشکەوتن خۆبەخۆ، لە تویێی ململانێی ئیرادە تایبەتییەکانەوە لەناو مێژوودا روودەدات، بێ ئەوەی پێویست بکات پێشبینی ئەم پێشکەوتنە لە هیچ پرۆژەیەکەوە بکەین کە بۆ "دروستکردنی





مێـژوو" هاتۆتـە کایـەوە، لـە تـوێی مۆرکردنیـەوە بـەو ئاڕاسـتەیە، بـە شـێوەیەکی ئیرادەوییانە یان بونیادنەرانە. ئەو نمونە مەرجەعییانەیەی فەلسەفە، کە بە باشترین شێوە مەرجەکانی شێمانەی ئەندێشەکردنی ئەم جۆرە هەڵوێستە روون دەکاتەوە، بێشك لە تیوریی "فێڵی عەقڵ" دەچێت. بەڵام، بە ئیحالەکردنی گوتاری لیبراڵی نوێ بـۆ نمونـە فەلسـەفییەکەی (ئـەوەی زۆربـەی جارەکـان بـێ ئـەوەی پێـی بزانێـت، دەیژێنێتـەوە) ئـەو نارەحەتییـەمان بـۆ روون دەبێتـەوە کـە لیبرالیزمـی نـوێ لـە رەخنەگرتنیدا لە دەوڵەتی پارێزەر، رووبەڕووی دەبێتەوە، بە دەسپێك لەم گریمانە ئۆنتۆلۆجییانەوە، لە کاتێکدا پێویستە ئەندێشەی ئەو سیاسەتانە بکرێت، بە پێی خـودی ئـەو گریمانانـەو بـەوەی توانییـان بچنە نـاو مێـژووەوە، وەك ئـەوەی خۆشـی بەشێك بێت لە رەوتی بڵاوبوونـەوەی خودییانـەی عـەقڵی ئیشـپێکراو لە مێـژوودا. نامەوێت مەبەستم لەمە ئەوە بێت کە سیاسەتەکانی دەوڵەتی پارێزەر گرفتی کەمتر دەنێنـەوە لەوانـەی سیاسـەتە ئیحتیمالییـەکانی لیبرالیزمـی نـوێ دەینێنـەوە: تـەنها ئەوەندەم دەوێت جەخت بکەم کە بە ئیحالەکردنی گوتاری لیبرالیزمی نوێ بۆ نمونە ئیدیاڵەکـەی بـۆ بناغـەی فەلسـەفی، بۆمـان روون دەبێتـەوە کـە لـە بنەڕەتـدا چـەند گرفتێك دەنێتەوە کە پەیوەندییان بە تۆکمەییەوە هەیە، بەمجۆرە، ئەگەر سەرلەنوێ دەسـتببەینەوە بـۆ دەقـەکانی کەلـەپوری فەلسـەفی، ئـەوە بـە دەسـپێك نابێـت لـە بایەخدانێکی مێژووییانـەی پشکنەرانەوەو هیچـی تـر، بـەڵکو ئۆمێـدی ئەوەشـە کـە وەکو ئـامێر بـەکاریان بهێنین، بە مانا دروستەکەی وشـەکە، بـەو مانایـەی کـە نمونـە ئیدیاڵەکــە دەبێــت لــە پێــڕەوە ڤێبەرییەکــەدا[15] ، واتــە یــەکێك لــە ئامرازەکــانی لێکۆڵینەوەکە نەك ئامانجەکەی.

**لـۆك فـیری:** پێموایـە گرنگترین شت لای فۆکۆ بریتیـە لـە هەڵبـژاردنی بابەتـەکانی ــ

---

[15] ڤێبـەر، مـاکس (Weber, Max (economist (1864–1920) ئـابوریزان و مێژوونوسـی کۆمەڵایـەتی ئەڵمانییـە، بەهەوڵـەکانی بـۆ خوێندنـەوەی مێـژووی جیهـان و مێـژووی ئـەورووپا ناسراوە. دیارترین نوسراوی کێتێکی گەورەی سێ بەرگییە دەربارەی ئاینەکانی خۆرهەڵات کە لە ساڵی 1920دا بڵاوکراوەتەوە.





تاراوگـە، زینـدان، هتـد ــ هـەروەها وەرچـەرخاندنی ئاڕاسـتەی فەلسـەفە بـەرەو بابەتگەلێك كە پێشتر لە گوتاری زانكۆییدا پسپۆڕیی ئەو نەبووە. دەشێت هەمان شـت دەربـارەی ئـارێنتیش بڵـێین كـە هەوڵیـداوە لـەو بابەتـە ورد ببێتـەوە كـە بـە رووكـەش فەلسـەفی نین بـۆ ئـەوەی دەری بخـات شـیكردنەوە فەلسـەفییەكان بۆ ئـەو بابەتانـەش دەگـونجێن كـە جـاران تایبـەت بـوون بـە مێژوونوسـان یـان زانایـانی كۆمەڵناسـی. كەواتـە، مـن لـەم حاڵـەدا بـە تـەواوی لەگـەڵ بایەخـەكانی بۆمیانـدا یەكدەگرمـەوە. پاشان لای هـەمووان ئاشكرایە، كە ئیمڕۆ چالاكی فەلسـەفی لەسـەر دامەزرانـدنی سیسـتمێكی نـوێ دانەمـەزراوە. گومـان لـەوەدا نیـە كـە هەڵوێسـتە فەلسـەفییەكان، بـە مانـای هەڵوێسـتەكانی بەرامبـەری عەقڵانییـەت، شـتێكی وەكـو بەڵگەنەویستی داخراو پێكدەهێنن. بۆیە، ئەو گۆڕانكارییانـەی دانـەرانی وەكو فۆكۆ (بە پێچەوانەی دێریداوە كە زۆرتر بە تەقلیدی ماوەتەوە) بە نیسبەتی فەلسـەفەی زانكۆییەوە زۆر بە پیتن و مەسـەلەی مانەوەشن. گەرچی ئەمە ئەو هۆیەشە كە وای لێكردووین، مێژوویـەكی فیكری مافەكانی مرۆڤ لە تێڕوانینێكی تـەواو جیاوازەوە بنوسین ــ ئەمـەش بابەتێكـە وەك مـن بـزانم لـە كتێبـەكانی فەلسـەفە یـان پرۆگرامـە پەسەندكراوەكانی زانكۆدا نایدۆزنەوە.

**كرزیستۆف بۆمیان:** لەم حاڵەتەدا، ئەگەر رێكەوتنێكی تەواو هەبێت، ئەوا دەمێنێتەوە ئـەوەی رۆڵـی خـۆم وەكـو هانـدەرێك و وەكـو پـارێزەری شـەیتان ببینـم. بۆیـە، تێكسـتەكەم دەهێنمـە دەرەوەو لـە "سیسـتم و رەخنـە" ئـەو وتـارە دەهێنمـەوە كـە ناونراوە "گەڕانەوە بۆ كانت". من ئەم ناونیشانە وەكو خستنە رووی پرۆگرامێك وەردەگرم كە دراوەتە پاڵی ئێوە، ئێوەش پێم دەڵێن ئەگەر راست بێت یان هەڵە، كە گرفتێك بـۆ مـن دەنێتـەوە. لـە لایـەكی تـرەوە، زۆرجار لای ئێـوە دووبارە دەبێتـەوە، بمبەخشن، چونكە من كەشفێكی ئامارییانەم نەكردووە. بەمجۆرە، باسـی گەڕانەوە بۆ رەخنەگەرایی دەكەن، بەشێوەیەكی تایبەتیش دوو ناو هەن كە بەردەوام دووبارە





دەبنــەوە, ئــەوانیش کانــت و فێختــەن[16] , بــە تایبــەتی فێختــەی لاو. کەواتــە, ئــەو پرسیارەی یەکسەر خۆی قوت دەکاتەوە: بۆچی رەخنەگەرایی؟ بۆچی لە نێوانی هەموو ئەو چاوگە شیاوانەی بەردەستاندا, ئەمە هەڵبژێردراوە؟ کە لەوە دوورتریش دەڕۆین, دەپرسین: ئایا دەتوانین ئەمڕۆ, بێ ئەوەی دوو سەدە لە مێژوو رەش بکەینەوە, بە مێژووی فەلسەفەشەوە, بانگەشەی گەڕانەوەیەك بکەین, هەتا ئەگەر بۆ شتگەلێکی مەزن و قەشەنگی وەك کارەکانی کانت یان فێختەش بێت؟ کەواتە پرسیارەکەم دووسەرەیە. لە لایەکەوە خۆی دەدات لە رەخنەگەرایی, لە لایەکی تری گشتیتریشەوە, ئەوەی دەشێت پاساوی گەڕانەوە بۆ بیرۆکەی دێرینی رەخنەیی بداتەوە کە تەمەنی دوو سەدە دەبێت.

**لۆك ڤیری:** تەنانەت ئەگەر لاشم وابێت کە یەکێك لە دیوە سودمەندەکانی بەرهەمی فۆکۆ بریتی بێت لە گۆڕینی ئاڕاستەی کاری فەلسەفی بەرەو بابەتگەلێکی نوێ, ئەوا دەمێنێتەوە ئەوەی یەکێك لە ئەرکە فەلسەفییە پەتییەکان هەتا ئەمڕۆش هێشتا هەر بریتیە لە بیرکردنەوە لە مێژووی فەلسەفە. چونکە ئەوە شتێکی ساویلکانەیە باوەڕمان وابێت کە مێژووی فەلسەفە بە تەنها هەر ئەو گۆڕەپانە زانستییە بەنرخە نیە کە لە ئامادەیی یان زانکۆدا, لە کاری کەڵەبیریاران نزیکمان دەخاتەوەو بە بیرەکانیانمان دەناسێنێت. مێژووی فەلسەفە لەگەڵ کانتدا خۆی وەك خۆی بوو بە بابەتێکی فەلسەفی, ئەویش لە نەسکی یەکەمی"رەخنە"دا کە خۆی دەدات لە مێژووی عەقڵی پەتی. لەوکاتەوە, مۆرکە فەلسەفییەکەی بەردەوام لە گەشەکردندا بووە, بە شێوەیەکی تایبەتی لای هێگڵ و هایدگەر. بە رای من, هێشتا پێویست

[16] فیختە , یۆهان گۆتلیب Fichte, Johann Gottlieb (1762-1814), فەیلەسوف و رۆشنبیرێکی ئەڵمانییە, لایەنگیری تیۆرییەکی ئیدیالیستانەیە لەمەڕ واقیع و رەفتارە ئاکارییەکان. فیختە رۆژانی یەکشەممە موحازەرەی دەووتەوەو بەشێوەیەکی عەقڵانییانەش باسی ئایینی دەکرد, ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی چەندان کێشەو دوژمنایەتی لەنێوەندە ئاینییەکانەوە بۆ دروست ببێت, هەروەها دەسەڵاتدارانیش زۆر خۆشیان نەدەویست لەبەر ئەو مەیلە شۆڕشگێڕانەیەی هەیبوو. دیارترین کتێبی پێڕەوی ئاکار لەبەر رۆشنایی زانستدا 1798.





دەكات بیر لەو مێژووەی فەلسەفە بكەینەوە و تێیدا بنوسین, كە خۆی فەلسەفییەو لە هەمانكاتیشدا لە هەوڵەكانی گەورە فەیلەسوفانی ئەڵمان مێژووییترە. بەڵام بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە سەر "گەڕانەوە بۆ كانت" ە نێودارەكە, ئەوەی هەندێك زۆر خۆشحاڵانە نارەزایی بەرامبەری دەردەبڕن, دەڵێم, بۆ ئەوەی نەچمە ناو ئارگیومێنتێكی قسەییەوە, لە راستیدا پێویستە دەربارەی "قۆناغە كانتییەكان" بدوێین, بە شێوەیەك كە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە, بیری هاوچەرخ دەكاتە چەند قۆناغێك. گرنگ چەمكی "گەڕانەوە" نیە كە بێشك جگە لە وەهمێك زیاتر شتێكی تر نیە ــ بەڵكو راستر ئەو ماوەیەی كە هەموو جارێك ئەم قۆناغە جیاجیایانە لێك جیادەكاتەوە. بۆ ئەوەی لێرەدا دابەشكردنێكی قۆناغییانە بگشتێنم ـ كە هێشتا هەر هێڵكارییە ـ دەڵێم قۆناغی یەكەم, بێشك ئەو قۆناغەیە كە كانت خۆی بەرپای دەكات (رەنگە فێختەی لاویشی لەگەڵدا بێت). مەسەلەكە پەیوەندی بە قۆناغێكی فەلسەفییەوە هەیە كە بە لای منەوە هێشتا نرخ و بەهای مانا ئیجمالییەكەی بە نیسبەتی هەموو بیری هاوچەرخەوە, نەخەمڵێنراوە. سەرهەڵدانی بیرۆكەی كۆتابوونی مرۆییە كە یەكەمجار ـ لە یەك جوڵەدا ـ هاوشانی پاشەكشەكردنی یەزدان دەبێت: لە كۆتایی "رەخنەگرتن لە عەقڵی پەتی" دا, خودا وەكو بیرۆكەیەك مایەوە, لە رەخنەی دووەمدا, بوو بە بابەتی باوەڕێكی كردەیی. ئەمە سیمایەكە لە سیما كانتییەكان كە پێویستە بۆ خۆی لێی بكۆڵرێتەوە, چونكە یەكێك لە سیما جیاكەرەوەكانی نوێخوازییەكەمان پێكدەهێنێت. بەرێژەییكردنی یەزدان, وەك ئامارژەم پێدا, پێوەستە بە تیوریی كۆتابوونەوە: چونكە لە رەخنەی یەمەكدا, بۆ یەكەمینجار لە مێژووی فەلسەفەی نوێدا, ئەو بیرۆكەیەی دەڵێت بۆچوون و هۆش جێگای بڕوا نین: كانت دەربارەی مەرجەكانی شیانی هۆش پرسیار دەكات ( كە لای دیكارتییەكان و ئەزمونگەراكان هۆشێكی بڕواپێكراوە). وەڵامەكەشی ئەوەیە خود بۆ ئەوەی بۆچوونی هەبێت, پێویستە بونەوەرێكی كۆتا بێت: لەوكاتەوە چیتر كۆتابوون وەكو نیشانەی ناتەواوی بەرامبەری زانینێكی هەمەكییانەی زانست, كە زانینی خودایە, دەرناكەوێت, بەڵكو بە پێچەوانەوە,





مەرجی خودی زانینە. خەسڵەتی سێیەمی ئەم قۆناغە کانتییە لێرەدایە: بەهۆی پاشەکشەکردنی ئەم یەزدانەوە، لەگەڵ وردە پارچەکانی خودێتی کۆتا (مەبەستم لە وردە پارچەکان واقیعی کۆتایەو بەمەش کرانەوەی پێویست بەسەر غەیرییەتدا)، ئەوا رەخنەگەرایی گوزارشت لە سەرهەڵدانی گرفتێتی مێژووگەرایی نوێ دەکات. وتەی ئەوەی خود کۆتایە، بە راستی واتای ئەوەیە کە لە کرۆکدا لەناو کاتێتیی و مێژوویەتێتیدا نغرۆ بووە، ئەم مێژوویەتێتییەش مەرجی هەموو زانینێکە: چ لە بواری زانست یان ئاکار یان سیاسەتدا، ئەوا لە ئێستا بە دواوە ئاینده وەکو ئاسۆی ئەزمونی مرۆیی دەردەکەوێت، لە کاتێکدا کە کامڵکردن وەکو ئەوەی بزوێنەر و ئامانجی هەموو کارێك بێت، ئاوا دەردەکەوێت. لەگەڵ قۆناغی کانتیزمدا هەموو شێوە دێرینەکانی ئەندێشەی مێژوویی بە تەواوی کۆتاییان پێهات: هەموو شتێك بە ئاراستەی ئایندەدا هەڵدەگەڕێتەوەو چیتر رابردوو وەك تۆخمێکی دیاریکەر نامێنێتەوە، بگرە جێگای گریمانەکراوی نمونەیەکی رەفتاریی نابێت کە پێویست بکات بێکۆتا بەرهەم بهێنرێتەوە. بەرای من ئەمانە سێ خاڵن شایستەی ئەوەن لە قۆناغبەندکردنی فەلسەفەی نوێدا حیسابیان بۆ بکرێت و دەشبێت قۆناغە کانتییەکانیش رەچاو بکرێن. (بێگومان چەند قۆناغێکی بنەڕەتی تریش هەیە، وەك تێڕامانی خودی، کە لێرەدا پێم ناکرێت ناویان بێنم). دوای ئەم قۆناغەی یەکەم ــ بە شوێنکەوتنی هێڵکاریی ئەم قۆناغبەندییە ــ دەبینین، لە ئایدیالیزمی ئەڵمانیدا، لەگەڵ عەقڵانییەتی شلینگی[17] لاو و پاشان هێگڵ، هەروەها لەگەڵ بوژانەوەی

---

[17] شلینگ Friedrich Wilhelm Joseph von (1775-1854 ,Schelling) فەیلەسوفێکی ئەڵمانییە، یەکێکە لە رابەرە دیارەکانی ئیدیالیزم و سەردەمی رۆمانسیزم لە فەلسەفەی ئەڵمانییدا. لە 27 ی کانونی دووەمدا لە لیۆنبێرگی هەرێمی فۆرتیمبێرگ لە دایك بووەو لە زانکۆی تۆبینگین خوێندوویەتی و دواتر لە زۆربەی زانکۆکانی ئەڵمانیادا وانەی وتۆتەوە، لە ساڵی 1841 دا لە لایەنی پادشای پروسیاوە فرەدریك ولیەمی چوارەم بانگهێشت کراوە بۆ بەرلین و لە 20 ی ئابدا لە باد راگاز، سویسە دەمرێت. فەلسەفەکەی شلینگ لە پەرەسەندنی





ئەزمونگـەرایی هیـۆمی[18] نوێـدا لای نوسـەرانی وەکـو جـەیکۆبی و مـایمۆن شـۆڵز، گەڕانەوەیـەکی راسـتەقینەی میتافیزیـا دەبیـنین کـە لـە هەنـدێك رووەوە وەك "پـێش کانتیزم" دەردەکەوێت. هێگڵ بە روونی لەگەڵ ئۆدیسیزمی لایبنیتـزدا پێك دەگـەن، ناشـتوانین ئەندێشـەی مێژوویـەتی قوتابخانـەی مێـژوویی بکـەین، مەگـەر پێوەسـت بێت بە هەڵکشانی دووەمی هیۆمەوە لە رەوتێکی ناعەقڵانییانە و رۆمانسییانەدا کە دەگەڕێتــەوە بــۆ "دەیڤیــد هیــۆم" ی نێــودار کــە دانەرەکــەی جەیکۆبییــە. لەگــەڵ ئەوەشدا. ئەم جۆرە خوێندنەوەیەی مێژووی بیرەکان ساویلکانەیە: تەنانەت ئەگەر بـە تـەواوییش هەڵـە نـەبێت، چـونکە ئـەو جیـاوازیە گـەورەو چەشـنییە پشـتگوێ دەخـات کـە ئـەم شـێوانەی عەقڵانییـەت و گومانگـەرایی پـێش کانتیزمـە و نمونـە ئەسـڵییەکانی (لایبنیتـز و هیـۆم) لێك جیادەکاتـەوە. ئـەم جیـاوازیە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەوەی پێویست بـوو لەسـەریان لـە دوای کانتـەوە مێژووگـەرایی بهێننـە نـاوەوە (یـان وەك جەیکۆبی وتی "لە ژین رابمێنن"): ئەگـەر ئۆدیسیۆسـەکەی لایبنیتـز بـە عـەقڵی هێگڵیزم فریوی خواردبێت، ئەوە رێك بـۆ ئەوەیـە وەڵامـی ئـەم پێداویسـتییە بداتـەوە. دەمێنێتـەوە ئـەوەی گەڕانـەوەی ئـەم میتافیزیایـە، ئەگـەر بـە مێـژووش کرابێـت، پێویستی بە قۆناغێکی کانتییانـەی دووەم هەیە: بێشك نێودارترینی ئەم قۆناغانە

---

بەردەوامدا بووە. زۆر لە ژێر کاریگەریی کانت و فێختەی ئەڵمانی و سپینۆزای هۆڵەندیدا بووە. نوسینی زۆرە لەوانە: فەلسەفەی هونەر ـ 1807، ئازادیی مرۆڤ ـ 1809.

[18] هیۆم ، دەیڤید Hume, David (1711-1776), Hume, David (1711-1776), مێژوونوس و فەیلەسوفێکی سکۆتلەندییە، کاریگەریی هەبووە لەسەر پەرەسەندنی هەردوو پێڕەوی کۆمان و ئەزمونیی. هیۆم نەچۆتە قوتابخانەوە لە ماڵەوە خوێندوویەتی و لـە تەمـەنی دوازدەساڵیدا چۆتە زانکـۆی ئێـدینبۆرگ، هـەروەها تەندروستییشـی بـاش نـەبووە. دیـارترین نوسـراوی بریتیـە لـە نامەیـەك دەربـارەی سروشـتی مرۆڤ، A Treatise of Human Nature لەسێ بەرگدا لە ماوەی نێوان ساڵانی 1739 ـ 1740دا نوسیویەتی . پاشان لەساڵی لەساڵ 1741 ـ 1742دا دووبەرگی ئاکاری سیاسیی بڵاوکردەوە.





پێوەستە بە قوتابخانەی ماربۆرگ و کۆهین[19] و ناتۆرپ[20] و کاسیرەرەوە, لە رەوتێکدا کە خەسڵەتی گەڕانەوە بۆ یەهودیەتی هەیە. بۆ ئەمەی لەم گەڕانەوە دووسەرەیە بۆ کانتیزم و یەهودیەت تێبگەین, پێویستە ئەوە بیربخەینەوە کە چۆن کانتیزم و یەهودیەت لە ناو هێگڵیزمدا هەمان رەوشیان هەیە: هەردوکیان دوو وێنەی ویژدانی نەگبەت و تیۆریی کۆتابون و یاسان. کەواتە لەگەل ئەم قوتابخانەیەدا کە لە بنەڕەتدا هێرش دەکاتە سەر هێگڵیزم, قۆناغێکی کانتییانەی

---

[19] کۆهین, هێرمان 1918-1842 (Cohen, Hermann) فەیلەسوفێکی جولەکەی ئەڵمانییە, یەکێکە لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی کانتیزمی نوێ لە ماربۆرگ. لە کۆسویگ لە دایك بووە, لە زانکۆکانی بریسلاڤ و بەرلین خوێندوویەتی و لە ساڵی 1865 دا لە زانکۆی هاڵ دەرچووە. لە ماوەی نێوان ساڵانی 1876–1912 لە زانکۆی ماربۆرگ وانەی وتۆتەوە. بە کۆمێنتەکانی دەربارەی کانت ناسراوە. لە ساڵی 1971 دا کتێبی تیوری زانینی ئەزمونیی کانتی نوسیوە, لە کارەکانی تری: لۆجیکی زانینی پەتی –1902 , سیستمێکی فەلسەفی 1902 – 1906 , چەمکی ئایین لە فەلسەفەی سیستماتیکدا –1915. تێڕوانینەکانی کۆهین هەم مایەی سەرسامیی و هەم مایەی گومانیش بوون, پێی وابوو کە ئایدیالیزمە ئێتیکییەکەی کانت و تیۆلۆجیای جولەکە لە بنەڕەتدا لێکدەچن, بەڵام باوەڕە ئاینییە تایبەتییەکان دەکەونە دەرەوەی قەڵەمڕەویی فەلسەفەوە.

[20] ناتۆرپ, پۆڵ 1924-1854 (Natorp, Paul) فەیلەسوف و پەروەردەکاری ئەڵمانییە, لە 24 ی کانونی دووەمدا لە دۆسیلدۆڤ لە دایك بووەو لە 17 ی ئابدا لە ماربۆرگ مردووە. لە ساڵی 1881 دا بووە بە مامۆستای تایبەتی لە زانکۆی ماربۆرگ, ساڵی دواتر بووە بە ئوستادی رەسمی و هەتا کۆتایی ژیانی لەو زانکۆیە ماوەتەوە. ناتۆرب و کۆهین پێکەوە نوێنەری سەرەکیی قوتابخانەی ماربۆرگ بوون کە قوتابخانەیەکی کانتریزمی نوێ بوو. ناتۆرپ پەرەی داوە بە رەخنەگەرایییەکەی کانت و بەرەو ئایدیالیزمێکی لۆجیکییانەی باڵای دژ بە پۆزەتیڤیزمی بردووە. ئایدیالیزمەکەی پێکهاتەیەکی دامەزراندووە کە قۆناغەکانی ئەمانەی خوارەوەن: یەکەم پشکنینی ئایینەکان لە چوارچێوەی پەیوەندییەکی مرۆییدا, ئەم پشکنینەی لە کتێبی ئایین لەناو سنورەکانی مرۆڤایەتیدا –1894 خستۆتە روو. دووەم, دتمەزراندنی پرەنسیپە کۆمەڵایەتییەکان, ئەمانیشی لە زانستی پەروەردەی کۆمەلایەتی –1899 دا کۆکردۆتەوە. پاشان دامەزراندنی پرەنسیپەکانی ئاکارێتی ئەفلاتونییانە لە پێڕەوی ئیدیالەکان لای ئەفلاتون – 1903. سیەمیش پشکنینی ئەو پرەنسیپانەی لە زانستە وردەکاندا پیادە کراون –1910.





**دووەمین هەیە، بێگومان بوژانەوەکانی ئەزمونگەرایی گومانگەراش لە شێوەی دەرونگەراییدا. ئەم قۆناغەی دووەم، کە دەبێن خودی هۆسرێل زۆر لێوەی نزیکە، لە فەرەنسادا باش نەناسراوە (هیچ کتێبێکی کۆهین وەرنەگێڕدراوە). وەلێ هەموو کەسێك پێی وایە کە بواری پێدراوە بە قێز و بێزەوە رایەکەی هایدگەر دووبارە بکاتەوە کە دەڵێت: کانتیزمە نوێیەکان[21] پۆزەتیڤی وەهان کە قابیلی چارەسەرکردن نین (من دڵنیام ئەوانەی ئەم جۆرە رایانە دەردەبڕن، زۆربەی جارەکان، بۆ ئەوەی نەڵێم هەموو جارێك، تەنانەت ناونیشانی کتێبە تایبەتییەکانی ناتۆرب یان کۆهین نازانن). هەرچۆنێك بێت، ئەم لێکدانەوە هایدگەرییەی کانت و ئارگیومێنتەکەی داڤۆس لە نێوانی کاسیرەر و هایدگەردا، کۆتایین بەم قۆناغەی دووەم هێنا. ئێمڕۆش، پێمواییە ئێمە لە فەرەنسا، وەك چۆن لە ئەڵمانیا (لەگەڵ ئابێڵ و هابرمازدا[22]) قۆناغێکی سێیەمی کانتیزم دەبینین، کە خۆی دەدات لە دوو بەرە: لە رووی فەلسەفییەوە ناتەبایی نێوانی دڵنیایی و گومانگەرایی کرد بە گرفتێکی تەواو نوێ، لەگەڵ سەرهەڵدانی روخاندنی ئەو عەقڵەی کە چیتر هیچ قەرزێکی**

---

[21] **کانتیزمی نوێ Neo-Kantianism زاراوەیەکە بەسەر ئەو بیریارانەدا پیادە دەبێت کە هەوڵیانداوە پێڕەوەکەی ئەمانوێل کانتی فەیلەسوفی گەورەی ئەڵمان، نوێ بکەنەوەو، بگرە تارادەیەکیش گۆڕانکاری تێدا بکەن. زیاتر بیرو بۆچوونەکانی ئەوبیریارانە دەگرێتەوە کەسەر بە قوتابخانەی کانتیزمی نوێن لە ماربۆرگی ئەڵمانیا کە هێرمان کۆهن و پۆڵ ناتۆرپ و ئێرنست کاسیرەریش دەگرێتەوە.**

[22] **هابرمان، یۆرگین** Habermas, Jürgen (1929- ), **فەیلەسوفێکی ئەڵمانییە، تیوریستێکی کۆمەڵایەتییشە، یەکێکە لە رابەرەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت** Frankfurt School . **ئەو قوتابخانەیە تایبەت بووە بە پەرەپێدانی بیرو پەیمانگایەك بووە بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی، لە شاری فرانکفۆرتی ئەڵمانیا لەساڵی** 1923**دا دامەزرێنراوەو شێوازێکی لێکۆڵینەوەی پێشکەشکردووە کە بە تیوریی رەخنەیی ناسراوە. هابرماز ماوەیەکی کورت وەکو یاریدەدەری تیۆدۆر ئادۆرنۆ کاری کردووە، لەپەیمانگای لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان. بەڵام لەساڵی** 1983 **-** 1994 **لەزانکۆی فرانکفۆرتدا دەرسی وتۆتەوە تا خانەنشین کراوە. نوسینە سەرەکییەکانی بریتین لە: تیوریی و پراکسیس ـ** 1963، **زانین و سودی مرۆڤ ـ** 1971، **گوتاری فەلسەفیی مۆدرێنیزم ـ** 1985.





ئەزمونگەرایی لەسەر نەماوە. لە لایەکی تریشەوە, لەگەڵ پەرەسەندنی یەکجار زۆری زانستە مرۆییەکاندا, چەندان شێوەی نوێی مێژووگەرایی دەرکەوتن کە بە دەستەواژەی نوێ مەسەلەی بابەتێتی و مەسەلەی شوێنی خودێتی لە مێژوودا دەخەنە روو. زۆر بە کورتی, لە دایکبوونی زانستە مرۆییەکان پێوەستە بە تاکگەرایی نوێوە, مەبەستم لە دەرکەوتنی چەند بۆچوونێکە لەمەڕ کۆمەڵگا بە واتای "دەستی نهێنی" یان "فێڵی عەقڵ". ئەمەش چونکە سۆسیۆلۆجیا لە بنەڕەتدا هەوڵێکە بۆ ئەوەی وا لەو شاراوەیە بکات قابیلی تێگەیشتن بێت, وەلێ بە هۆی بێتوانایی ئێمەوە وەکو کەسانی تاك (کرۆکی تاکەکان) لە کۆنترۆڵکردنی مێژووەکەماندا یان تێگەیشتنی تەواوەتی لێی (شاراوە بووە). لێرەدا دوو شێوازی جیا هەن بۆ تێڕامانی ئەم شاراوەیە: دەتوانین وەکو بۆردیۆ[23] دەیکات, بۆ نمونە, پشکی شاراوەیی شیبکەینەوە کە خۆی بە نزیکەیی سەرچاوەی بڕیارەکانی تاکە (واتە تەرزی بەرهەمهێنانی هەستییانەی بیرەکانی, ئیختیارەکانی..هتد). هەروەها دەتوانین بە پێچەوانەشەوە ئەو پشکەی شاراوەیی شیبکەینەوە کە بریتیە لەو پنتەی بڕیارە تاکانییەکانمان دەرژێنە ناویەوە, کە بە شێوەیەکی گشتی بە دەستەواژەی "ئەنجامە پێچەوانەکان" ئاماژەی بۆ دەکرێت, یاخود, هەرچۆنێك بێت پێشبینی نەکراوە. ئەم ناکۆکییە نوێیە کە دەشێت هەر یەکێك چۆنی بوێت ئاوا ناوی لێبنێت, بە شێوەیەکی بەدیهێنانە پێویستیی بە بیرکردنەوەیەکی رەخنەییانە هەیە لە حاڵەتی تاك. پێموایە لەم دیدگایەوە سەرلەنوێ, دوای چەند دەهەیەك لە شاراوەیی, سۆسیۆلۆجیاکەی ماکس ڤێبەر دەدۆزینەوە (بەوەی کە گەورەترین خەسڵەت, بە نیسبەتی مارکسییەکانی پێشووەوە, ئەوەیە ئیمڕۆ وا بناسرێن کە سەر بە پێشەنگیڤێبەرییەکانن!). پێمباشە بەم مانایە باسی نەك "گەڕانەوە بۆکانت" بکەم, کە دوپاتی دەکەمەوە شتێکی وەهمییە, بەڵکو دەربارەی "قۆناغە

---

[23] بۆردیۆ, پییر (1940-2002) Bourdieu, Pierre فەیلەسوفێکی فەرەنسیی هاوچەرخە, سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی تاك و نەهامەتییەکانی ژیانی تەکنەلۆجیایە. دیارترین کتێبی بریتیە لە مرۆڤی ئەکادیمی, تێزی توندو تیژیی رەمزیی یەکێکە لە تێزە نێودارەکانی.





کانتییەکان" بدوێم.

**ئـالان رینـۆ:** خاڵێکی تریشی بۆ زیاد دەکەم. دەربارەی ئەم ڕەتکردنەوەیەی تێزە سادەکارەکەی لەمەڕ "گەڕانەوە بۆ کانت"، بۆ ئەوەی پێ دابگرم لەسەر ئەوەی ئەم قۆناغە کانتییانە لێك جوێ دەکاتەوەو دەری بخەم کە ئێمە هەرگیز مەبەستمان نکوڵیکردن لە بیرەکانی دووسەدەی مێژووی فەلسەفە نیە، بە مەبەستی گەڕانەوە بۆ ساڵی 1781، واتە بۆ "ڕەخنەگرتن لە عەقڵی پەتی". ئەگەر ئاستی فەلسەفیی پەتی وەربگرین، ئەوا "ڕەخنەگرتن لە عەقڵی پەتی" ڕەخنەگەرایی وەکو چارەسەرێك بۆ ئەو ناکۆکییە پێڕەوییە دامەزراندوە کە، بە پێی کانت، دوو وێنەی دیاری میتافیزیای ڕووبەڕووی یەك دەکردەوە، ئەوانیش ناعەقڵانێتییەکەی لایبنیتز و ئەزمونگەراییە گوماناوییەکەی هیوّمن. لە بەرامبەریشدا، دەشێت ئیمڕۆ ڕۆڵی گەڕانەوە بۆ ڕەخنەگەرایی چی بێت، لە گۆشەنیگایەکی فەلسەفییەوە نەك لە چوارێوەی ئەپستمۆلۆجیای زانستە مرۆییەکانەوە؟ ئاشکرایە ئەگەر هێشتا ئەم گەڕانەوەیە ڕۆڵێکی هەبێت بیگێڕێت، ئەوە لە چوارچێوەی ئارگیومێنتی نێوانی عەقلانییەتی دڵنیاو ئەزمونگەرایی گوماناویدا نیە، واتە لە نێوانی دوو وێنەدا کە بڵند دەبنەوە بۆ مێژووی میتافیزیا ـ بەڵکو پێویستە ئیمڕۆ سەرلەنوێ جێگەی ئەو گەڕانەوەیە بۆ ڕەخنەگەرایی بە نیسبەتی ناکۆکییەکی پێڕەوییەوە دیاری بکەین کە ئەمجارەیان خودی میتافیزیا، وەك چۆن لە بڵندبوونەوەی هیگڵییانەی خودی ڕەهادا کامڵ دەبێت، ڕووبەڕووی گوتاری دژ بە میتافیزیای شێواز هایدگەری، هەروەها پێ لەسەر ئەسڵی بیرکردنەوە دادەگرێت "دژی خودێتی". بەمجۆرە هانابردن بۆ ڕەخنەگەرایی دەستوەردەداتە ناو بیرکردنەوە لە پارێزگاریکردنی شیاو (دژی پاکتاوکردنەکانی خود دژ بە میتافیزیا) بۆ گەڕانەوە بەرەو خودێتی، دوای ڕەخنەگرتن لە وەهمەکانی میتافیزیا، ئەوانەی دەربارەی خودن. کەواتە گوزارشتەکە گەورەیە، ناشێت مەبەست لێی بە شێوەیەکی دیاریکراو بریتی بێت لە "گەڕانەوە بۆ کانت".

**لۆك ڤیری:** بەم مانایە، کاتێك هۆسرێل سەرلەنوێ مەسەلەی "بالایی لە ئیدیالیییدا"





دەخاتەوە روو، واتە کاتێك هەوڵدەدات بیر لە شتێك بکاتەوەکە سنوری رێژەییێتی تاکانیی پوخت ببەزێنێت، لەگەڵ مانەوەشدا لە ناو چوارچێوەی خودی ئاساییدا، ئەوا چەند پرسیارێك دەخاتە روو کە هێشتاکە پێوەستن لە نەریتە کلاسیکییە عەقڵانیی و ئەزمونییەکانەوە. قۆناغی سێهەمی کانتیزم، کە ئێستا تێیدا دەژین و بەشێوەیەکی تایبەتی لە ئەڵمانیادا دیارە، دواجار گوێ ناداتە ئەم مەسەلە کلاسیکییانە. لە کاتێکدا لە فەرەنسا هەندێك بە لەزەتەوە، خۆیان دەدەنە دەستی گۆڕانکارییە تەواو نەزۆکەکان و پێشبینیکراوەکان دەربارەی بابەتی جیاوازی، رەخنەگەرایی هاوچەرخ پرسیار دەکات دەربارەی "پاش رەخنە" ی میتافیزیا. ئەمەش خاڵێکە تێیدا بیری دانەرانی وەکو لیڤیناس پێکدەگەن: چیتر مەبەستەکە تەنها رەخنەگرتن لە هیگڵییزم و ژیانەوەکانی نەبوو، بەڵکو رەخنەگرتن لەو میتافیزیایەی کە ئیمڕۆ هەموان لەسەری کۆکن (بەم مانایەش، شتێکی پڕووپووچە بە نیسبەتی رەخنەگەراییەوە، هەروەها بە نیسبەتی نەریتی جولەکانەوە، بووە بە بیرکردنەوە لە غەیرییەت وەکو لە نێوخودێتییدا "ئەویتریش غەیرەیە". بێشك ئەم جۆرە ئەرکە پێویستی بە ڕماندنی بەڵگەنەویستەکانی تاکانییەتی رێژەیی هاوچەرخ هەیە (ئیتر بە دڵنیایی دسیما دیموکراسییەکانی بگاتە هەر ئاستێك).

## مرۆگەرایی / تاکگەرایی

**ئالان فینکلیکرۆت:** لایەنێك لە کتێبەکەتاندا هەیە بەلای منەوە زۆر بەهێزە، ئەویش ئەو بەرامبەرکردنەیە کە لە نێوانی مەیلی مرۆڤدۆستی و مەیلی تاکگەراییدا دەیکەن. ئێوە دەری دەخەن کە نەك هەرگیز ئەم دوو چەمکە پێکناگەن، بەڵکو دژایەتیکردنی مەیلی مرۆڤدۆستی خۆی دەگاتە چەشنە تاکگەراییەکی بەگشتیکراوی بەرەڵا. بۆیە، حەزدەکەم لەسەر ئەم خاڵە بوەستین. ئەگەر کاتی پێویستتان بۆ قووڵبوونەوە لەم بەرامبەرگرتنەدا، هەبێت. ئێوە دەڵێن: ئەو بیریارانەو فەیلەسوفانەی "بیری 68" بوونە هۆی ئەم گشتاندنەی مەیلی تاکگەرایی، یاخود بوونە هۆی خێراکردنی. بە هەرحاڵ ئەوان حیسابێکی ئەوتۆ بۆ تاك ناکەن، ئیتر ئەو رێگایەی لێوەی ئەندێشەی دەکەین، هەرچییەك بێت. لیڤی





شـترۆس ئـەم دەسـتەواژەیەی هـەبوو, کـە دەشـێت بیرۆکـەی ئاڕاسـتەکەری بـیری شەسـتەکان بێـت:"مـن نـەك تـەنها هـەر دژێـوەو هیچـی تـر, بـەڵکو لـە نێـوانی ئێمـەو هیچدا جێگای نابێتەوە". کەواتـە چۆن رووددەدات بیریارانێك, پێشـەنگەکانی مـەیلی تاکگەرایی هاوچەرخ, هیچ حیسابێك بۆ تاك نەکەن ؟

**ئالان رینۆ:** بۆ ئـەوەی وەڵامـەکانمان روون بن, یەکـەمجار ئـەو چـەمکانە دیـاری دەکـەم کە مەبەسـتمانن ـ مـەیلی مرۆڤدۆسـتی و تاکگـەرایی ـ بـۆ ئـەوەی بتـوانین دەربـارەی زاراوەکـانی مەسـەلەکە پێـك بـێین. مـەیلی مرۆڤدۆسـتی, وەکـو لەگـەڵ لـە دایکبـوونی مۆدێرنیزمــدا دەردەکــەوێت, بریتیــە لــە قەناعــەتکردن بــەوەی مرۆڤایــەتی بــە دەسـتەواژەکانی سـەروەری دیـاری دەبێـت, واتـە, بـۆ نمونـە, بـە جەختکردن لەسـەر ئـەوەی نابێـت وا لـە یاسـا یـان پێوانـە بکـەین کـە لـە کەینونەیـەکی دەرەوەی کەسـی مرۆڤـەوە یـان خودێتییـەوە هـاتووە, بـەڵکو بـە شـێوەیەکی خـودی سـەری هەڵـداوە. کەواتــە بــەهای مــەیلی مرۆڤدۆســتی و پاشــانیش مــۆدێرنیزم ســەروەرییە. لــە بەرامبەریشـدا, سـەربەخۆیی بووەتـە بـەهای مـەیلی مرۆڤدۆسـتییانە, ئەمـە ئەگـەر بمانەوێت لە لادانی تاکانە تێبگەین و مەسەلەی لۆجیکەکەی بوروژێنین. لـە زەمـەنی تاکگەراییدا, چیتر ئەو پێوانەیە نیە کە سروشی کارێك, بابەتێکی خـودی لـە دەرەوە وەرنـەگیراو دەبەخشـێت, بـەهای ئـەو کـارە, بگـرە راسـتر سـەربەخۆیی لـە هـەموو پێوانەییەك, خۆی بەهاکەیـەتی و لـە کرۆکیدا بە شتێکی سـەرکوتکەرانە دادەنرێت. لەکاتێکدا کە سەروەری پێوانەکان قبووڵ دەکات بە مـەرجی ئـەوەی بتوانرێـت وا لـە قەڵـەم بـدرێن کـە خۆبـەخۆ سـەپێنراون, ئەمـە شـتێکە سـەربەخۆیی بـە شـێوەیەکی پرەنسـیپی نکـولیی لێـدەکات ـــ بـە جۆرێـك بەهاکـە رێـك دەبێـت بـە جـەختکردنی تاکگەرایی, واتە رزگاربوون لە هەموو پێوانەیەك, هەروەها رەسـەنایەتیش, بـە واتـای تێکۆشان بۆ ئەوەی مرۆڤ خۆی بێت نەك کەسێکی تـر. ئـەو کاتـەش مەسـەلەکە روون دەبێتەوە, ئەویش ئەوەیە بزانین چۆن رەخنـەگرتن لـە مـەیلی مرۆڤدۆسـتی, کـە بیری 68 پەرەی پێداوە, بە چەندان شێوە بەشدارییکردووە لە گەشانەوەی تاکگەراییـدا, تەنانەت بە بێ ئەوەی هێرشبەران بۆسـەر مـەیلی مرۆڤدۆسـتیی ئەوانـەی زۆرجـار و





بە تایبەتی لەسەر ئاستی سیاسی, هێرشیان کردۆتە سەر هەندێك لە بەهاکانی تاکگەرایی, بەوەی بۆ نمونە نکولییان لە لیبرالیزم کردووە, زەفەری پێببەن. ئەمە لە راستیدا تا رادەیەك کارێکی سانایە, چونکە دژایەتی مەیلی مرۆڤدۆستی پێش هەموو شتێك تەرکیزی کردۆتە سەر گفتوگۆکردنی بیرۆکەی سەروەری, یان وەکو وەهمێك کە ئایدیۆلۆجیای بۆرجوازی و بۆرجوازی بچووك پاراویان کردووە, یاخود وەکو وەهمێکی نمونەیە بۆ میتافیزیای خودێتی. لەمەشەوە, رەخنەگرتن لە مەیلی مرۆڤدۆستیی شێوەی رەخنەگرتن لە هەموو پێوانەییەکی وەرگرت, ئەگەرچی ئەوەشیان بێت کە لە لایەنی تاك خۆیەوە بێت و خۆی بە وەهمدابردبێت و لەسەر مەسەلەی سەروەرییەکەی خۆی, تووشی واهیمە بوو بێت. بە هەرحاڵ ئەگەر ئێمە خودی بیرۆکەی پێوانەیی بخەینە بەر گفتوگۆ, بە بیرۆکەی پێوانە بابەتییە خودییەکانیشەوە, ئیتر چی دەمێنێتەوەو وەکو بەهایەکی تاقانە, ئەگەر بەهای سەربەخۆیی و "بە تەنگەوەهاتنی خود", و جەختکردنی تاکگەرایی, کە دیاریکەری مەیلی تاکگەراییە؟ بەم مانایە, پێموایە پاڵنەری سەرەکیی لەرێگەلادانی تاکانیی کە خەسڵەتی جیاکەرەوەی مەیلی مرۆڤدۆستییە, رێك لەوەدا خۆی حەشارداوە کە رەخنەگرتن لە هەندێك لە شکڵەکانی پێوانەیی, بەوپێیەی لە کرۆکدا سەرکوتکەرانەیە, لەگەڵ رەخنەگرتن لە پێوانەیی بە شێوەیەکی گشتی, تێکەڵاو کردووە, بەو پێوانەییەشەوە کە تێیدا لە گۆشەنیگای سەروەرییەوە تێرامانی تێدا دەکرێت.

**لۆك ڤیری:** بەم مانایە, دابڕانێك لە ئارادا نەبوو, بەڵکو راستر بەردەوامیەك هەیە لە نێوانی شەستەکان و هەشتاکاندا. چونکە خۆ گرمۆڵەکردن لە ناو ئەو بازنە تایبەتییەدا کە ئیمرۆ بەرچاومان دەکەوێت, لە کۆتاییدا ئەنجامێکی تا رادەیەك لۆجیکییانەیە بۆ رەخنەگرتن لە پێوانەکان لە هەموو روویەکەوە, ئەویش بەناوی ئازادیی دەربڕین لای تاکەکانەوە. هەرگیز مەبەست ئەوە نیە بڵێین ئەم رەخنەیە مەشروع نیە, بەڵکو تەنها بۆ سەلماندنی ئەوەی دوای هەرەسهێنانی هەموو پێوانەیەك دەمێنێتەوە, بریتیە لە "بە تەنگەوەهاتنی خود" واتە رۆشنبیرییەکی

نارسیۆسییانە (لیبۆفیتسکی) کە تێیدا هەموو تاکێك هەوڵ دەدات ژیان و جەستەی خۆی بکات بە توحفەیەکی هونەری. ئەو شیکردنەوەیەی لیبۆفیتسکی ئەنجامی دەدات بۆ شێوەکانی ئێستا نارسیسۆسیی، بە تەواوی دەری دەخات ــ ئەگەرچی ئەوە لە دیدی جەنگاوەرە دێرینەکانیشەوە، تا رادەیەك پۆخڵکەری پیرۆزییەکان بێت ــ گرمۆڵەبوون لە ناو بازنەی تایبەتدا، لە وەرزشی راکردنەوە تا دەگاتە بڵاوبوونەوەی مۆدەوە، بە تێپەڕین بە تەشەنەکردنی هەموو شێوەکانی چارەسەری دەروونییدا، لە جۆری شەپۆلی ئەو تاکگەرایییە بنکەییەیە، ئەوەی کە جوڵانەوەی ئایاری 68 لە چەند روویەکەوە پیشاندەری بووە.

**ئالان فینکلیکرۆت:** کەواتە ئایا بەردەوامی و پێکگەیشتنێکی تەواو دەبینن لە نێوانی رەخنەیەکی فەلسەفیدا کە داوای هەڵپەساردنی بەهاکان دەکات بە ناوی بەهاکانی هاوتایی و تاکگەرایییەکەی ئێستاوە، کە دەگاتە هاوتایی رەهای راوبۆچوونەکان؟

**لۆك ڤیری:** پێموایە لە واقیعدا، ئەمە مانای جەوهەرییانەی ئەوەیە کە فەیلەسوفەکانمان لە کۆتایی شەستەکاندا، دروشمەکەی نیچەیان دووبارە دەکردەوە کە دەیوت:" واقیعێك لە ئارادا نیە، بەڵکو تەنها لێکدانەوە هەیەو هیچی تر". دەشێت ئەمەش مانای گۆرانییەکە بێت:"هەموو کەسێك ئەوە دەکات کە پێی خۆشە"، واتە هەموو کەسێك دادوەرە، دادوەری خۆیەتی، حوکم دەدات بەسەر شێوازی ژیان و بیرکردنەوەی خۆیدا، لەبەرئەوەی هیچ پێوانەیەکی بڵند لەگۆڕێ نەماوە، تەنانەت ئەگەر خودییانەش دانرابێت. کەواتە چیتر داواکراوەکە لەوەدا نەماوە کە ئەوەی دەیکەین یان بیری لێدەکەینەوە، بە پێی پێوانەیەك بیخەملێنین، بەڵکو ئەوەیە خودی خۆمان بین. بێشك من مەبەستم لەوە نیە کە ئەم جوڵانەوەی تاکگەرایییە لایەنی نەرێی نیە، لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی تایبەتی وەکو یەکێك لە لایەنە ئەرێکانی هەرەسهێنانی رێکخراوە سیاسییە ستەمکارەکانی بەدوادا دێت. بە پێچەوانەی ئەوەوە، ئەوپەڕی مەبەستی من ئەوەیە یەکجار زۆر جێگای گومانە.

**ئالان فینکلیکرۆت:** تێپەڕاندنی خودیانەی دەسکرد بە چی جیاوازە لە پێوانەیەك لە رێگای سازانی گشتییەوە بەدەستهێنرابێت؟





**لۆك ڤیری:** لێرەدا دەبێت خۆمان بدەین لە تەواوی مەسەلەی وێنەیی: ئایا دەتوانین ئەندێشەی پێوانەگەلێك بکەین کە ناشێت بگەڕێنرێنەوە بۆ سایکۆلۆجیا, ئەگەرچی لە لایەنی تاکیشەوە دانرابن؟ ئایا دەشێت پێوانەکان بەشێوەیەکی گشتی شتێکی تر بن جگە لە سازانە ئایدیۆلۆجییەکان کە دەشێت زانستە مرۆییەکانی شییان بکەنەوە؟ بە رای من, لە لایەنی فەلسەفەیەکی وێنەیی یان (باڵا) ەوە نەبێت, ناشێت بەدوای وەڵامدا بگەڕێین, بۆچی؟ چونکە مەبەست لەوەیە لەناو ویژدانی خۆماندا (ئەمەش خۆی بریتیە لە ئیدیاڵ) جیاوازی بکەین لە نێوانی ئەو ئەندێشانەدا کە دەشێت بە مولکی خۆمان لە قەڵەمیان بدەین (هەست بە سەرما دەکەم حەزم لە شیری خەستە .. هتد) لەگەڵ ئەندێشەی تردا کە راستەوخۆ بیرۆکەی ئەوەیان لەگەڵدایە کە لە خودێتییمان تێدەپەڕێنن یان دەکەونە ژوروویەوە, وەك ئەوەی لەگەڵ ئەو وتراوە زانستییانەدا دەیانکەین کە ئۆمێدی بە گشتیبوونیان هەیە. لێرەدا پێوانەکان چین؟ با سەرەتا بڵێین جیاوازن, بە بێ هیچ جۆرە گومانێك, بە پێی جێگای ئەو وتراوانەی کە ئۆمێدی گشتیبوونیان هەیە, بکەونە ناو کایەی زانست یان ئاکار یاخود جوانناسییەوە. بەڵام, بۆ ئەوەی راستەوخۆ بگەینە کرۆکی مەسەلەکە ــ کە بێشك لەسەر رۆیشتنی زۆریان دەوێت ــ دەڵێم چاوگی کۆتایی بریتیە لە شێمانەی گفتوگۆکردن. بێتواناییمان لە گفتوگۆکردنی هەندێك مەسەلەدا, بی ئەوەی سوود لە چاوبڕینە گشتیبوون وەربگرین, خۆی لە ئەسڵا نیشانەی باڵابوون یان تێپەڕاندنە. ئەمەش بە رای من شتێکی بنەڕەتییە: گفتوگۆکە بە تەنها هەر گەمەیەکی قسەیی نیە کە جیاوازییەکان دەردەخات (ئەمەش شتێکی بۆژۆکەرە) بگرە بریتیشە لە گەڕان بە دوای باڵاییدا (ئەگەر لانیکەم بڕوامان هێنا بەوەی گفتوگۆ مانای دەمەتەقی ناگەیەنێت), چونکە لێرەدا شێمانەی خودنێوەندیی دەکەوێتە مەترسییەوە. ئەگەر هەموو شتێك خودی بێت و هیچی تر, ئەوا خودنێوەندی مەحاڵ دەبێ. ئەگەر بمانەوێت مەسەلەی مێژووی وێنەیی بخەینە روو, ئەوا بە رای من دەبێت لە جوانناسیەوە دەستپێبکەین (لە بری میتافیزیا, وەك ئەوەی تا ئێستا زۆرجار وامان کردووە). چونکە هەر ئەوەندەی لەگەڵ دەرکەوتنی جوانناسی نوێدا,

بیرکردنەوە لە جوانیی, لەسەر بنەمای زەوق ئەنجامدراو بەمەش لەسەر بنەمای خودێتی, ئیتر رەخنەگرتن لە تاکگەرایی زۆر نارەحەتە. کایەی جوانناسی بریتیە لەو کایەیەی تێیدا پێوانە لەناو خودی نارەحەت ئەندێشەکراودایە, چونکە زەوق شتێکی شەخسییە. هەروەها لەبەر هەمان هۆ, ئەو کایەیەشە کە تێیدا ئەوانەی کە زیاتر لە سەدەیەك لە نیچە دواکەوتوون و هێشتا باوەڕیان وایە ــ جەختکردن لە "جیاوازی" ش چەشنێکی ترە لە بواری فەلسەفەدا ــ دەگاتە ئاستێکی زۆر بێتام: ئەوانە وادەزانن کاتێك دەگەنە ئەوەی لەبەرامبەری نەزانددا بە زمانێکی ساکێنەر گوزارشت لەو حەقیقەتە دەکەن کە مەحاڵە تاقی بکرێتەوەو واتای ئەوەی هەیە کە هەموو کەسێك لە کاتژمێرەکەی خۆیەوە درك بە کات دەکات, ئەوە دەرکیان بە ناخی قوڵایی کردووە.

**ئـالان فینکلیکـــرۆت:** ئێمە گفتوگۆی زەوق و رەنگەکان ناکەین. بەڵام, ئایا ئەگەر گفتوگۆی زەوق و رەنگ نەکەین, ئیتر ئیستاتیکا (جوانناسی) نامێنێت؟

**لۆك فێری:** مێژووی جوانناسی لە رووی مەسەلەی پەیوەندییەکانی نێوان تاکگەرایی و مەیلی مرۆڤدۆستی ( ئیدیاڵی/ باڵایی, سەربەخۆیی/ سەروەری, ئەگەر بمانەوێت) زۆر سەرنجڕاکێشە. چونکە لە دایکبوونی جوانکاریی پێوەستە بە دەرکەوتنی خودێتی نوێوە. وتەکە خۆی یەکەمجار لەناو نوسراوێکدا دەربارەی جوانناسی هەتا ساڵی 1780دەرنەکەوتووە, مەبەست لە کتێبی "ئیستاتیکا" ی بۆمگارتنە. ئەو کاتە ئارگیومێنتەکان دەربارەی "پێوانەی زەوق" (هیوم) خۆی دا لە مەسەلەی زانینی چۆنێتی ئەندێشەکردنی بڵندیی پێوانە جوانناسییەکان, واتە شێمانەی خودنێوەندیی, هەورەها گفتوگۆی لەمەڕ بەهاکان کە وادیارە, بە نزیکەییەکی سنوردار, کارێکی پوختی تاکگەرایی بن, چونکە لە توێی فایلی زەوقدا ئەندێشە دەکرێت.

**ئـالان فینکلیکـرۆت:** چۆن ئەندێشەی بەرهەمنەهێنانی جوانناسی دەکەن لە لایەنی رەخنەی ئەدەبییەوە, لە فەرەنسا؟ چونکە لە بیری شەستەکاندا, مەسەلەی بەها خراواتە نێوانی دوو کەوانەوە, ئەگەر نارەزاییش بەرامبەری دەرنەبڕابێت. یان





ئەوەتا بە وتەی ئەوەی ئەرکی زانست نیە بایەخ بدات بە بەهاکان خۆی لیٚ گێل کراوە, یاخود دەوترا: لە راستیدا, بەها بڕیارێکی پێشگریمانەیە و بۆتان دەسەلمێنین کە رۆمانێکی پۆلیسی هاوتای ئەدەبییەتی رۆمانەکانی فلۆبێرە. کەواتە, بەها جگە لە جۆرێك وەبەرهێنانی ئایدیۆلۆجییانەی زیادەی رۆشنبیرییەك لەسەر حیسابی رۆشنبیرییەکی تر, شتێکی تر نیە.

**لۆك ڤیری:** دەبێت وەڵامی گشتگیری ئەمە, ئەگەر وامان دانا کە شیاوە, زۆر درێژ بێت. بۆئەوەی قسەکانمان لەسەر یەك لایەنی مەسەلەکە بوەستێنین, دەڵێم پیلانگێڕانێکی سەیر لە نێوانی پۆزەتیڤیزم و فینۆمینۆلۆجیای هایدگەرییانەدا روویداوە کە هەردوکیان شکڵگەرای ریشەیین, چ لەسەر ئاستی جوانناسی یان لەسەر ئاستی یاسایی. یەکەمجار باسی ئاستی دووەم دەکەم کە ئاسانتر دێت بە دەستەوە: بە نیسبەتی پۆزەتیڤییە یاساییەکانەوە, لە نمونەی کێڵسن یاسا بریتیە لە شکڵێکی پوختەی دیارینەکراو, شێوازێك و بەس, پێویستیشە لەسەر زانستی یاسا بە بیٚ قەیدو شەرت هەموو ئەو مەسەلانە دووربخاتەوە کە پەیوەندییان بە ناوەڕۆکەوە هەیە, بەوپێیەی نازانستیی بن (ئەو مەسەلانەی کە هێشتا بەلای یاسای سروشتییەوە گرنگن), کەواتە هەرگیز مەبەست ئەوە نیە بزانین یەکێك لە پێوانە یاساییەکان دروستە یان نا, بەڵکو ئەوەیە ئایا بە شێوەیەکی راست دانراوە یان نا. بە گوزارشتێکی تر: لای خاوەن مەیلی پۆزەتیڤییانە, شەرعییەت لە یاساییبووندا قەتیس دەبێت. ئەمەش ئایرۆنییەکە, زۆرجار گوتارە خاوەن رەوتە فینۆمینۆلۆجییەکان, لەبەر چەند هۆیەکی تر, دەگەنە هەمان ئەنجام, وەك بۆ نمونە وتارەکەی لیوتار ئاماژەی بۆ دەکات کە لە "رۆژنامەکەی تر"دا بلاو کراوەتەوە, ژمارەی کانونی یەکەمی 1985. بە رای لیوتار داکۆکیکردن لە ناواخنێکی یاسایی (لەم حاڵەتەدا مرۆیی) بەڵگەیە بۆ گەڕانەوەی میتافیزیا بۆ (یاسای سروشتی) بە پێی گوزارشتەکەی کێڵسن. بۆ ئەوەی باش بیخەملێنین, بیشك ئەوەشی بۆ زیاد دەکەین کە گەڕانەوە بۆ ناوەڕۆکی جیهانی شتێکی ستالینییانەیە, کاری "پۆلیسی هزر" ..هتد, وەك باوە شتێکی پووچ پشتیوانیی لەم بیانووە دەکات: بۆ خۆبواردن

لە هەموو تۆقاندنێك, هەروەها بۆ كرانەوە بەسەر "جیاوازی" دا, پێویستە یاسا بە سنورنەكراویی بمێنێتەوە. كارەسات ئەوەیە ئەم تێزە, كە بێگومان پڕێتی لە هەستی جوان بە سادەیی تێزێكی سنورداره: نازانێت كە قبوڵكردنی پرەنسیپە یاساییە نوێیەكان هی پرەنسیپی شەرعییەتێك كە لەسەر ئیرادەی خەڵكی بیناكراوە, هەندێك ناوەڕۆكی سنوردار دەگرێتە خۆی, كە لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز تۆقێنەر نین. ئەگەر من مەیلی مرۆڤدۆستییانەی یاساییم پیێ پەسەند بێت (بۆ نمونە وەك بانگەشەكەی ساڵی 1789) ئەوە من هەندێك لە ناوەڕۆكەكانیشی پەسەند دەكەم, بۆ نمونە ناتوانم لە یەك كاتدا هەم لەسەر ئاستی یاسایی مەیلی مرۆڤدۆستانەم هەبێت پێوەستیش بم بە باوەڕێكی رەگەزپەرستییانەشەوە. بە هەرحاڵ من پێموانیە لە ناوەڕۆكی مافەكانی مرۆڤدا چ شتێك دەشێت ستەمكارانە بێت, بۆ نمونە! ئایا لەبەر ئەوەیە كە تەماحی گشتگیرییانەی هەیە؟ ئایا ئەگەر داوای گشتگیری ئازادی بیروڕا یان هاتوچۆم كرد, یان داوای مافی دەنگدانم بۆ ئافرەتان كرد, هتد.. ئیتر ستەمكارم ؟ ئەگەر وا نیم, ئیتر بۆچی بەردەوام نارونی زیاتر دەكرێتەوە, لەجیاتی ئەوەی هەوڵ بدرێت بۆ ئەوەی بیر لەوە بكرێتەوە كە تۆزێك گرانترە ... بێشك ـ واتە لە حاڵەتی ناوەڕۆكە دیاریكراوەكاندا؟

**ئالان فینكلیكرۆت:** ئایا هەمان شیكردنەوە بۆ مەسەلە جوانناسییەكانیش دەكەن؟

**ئالان رینۆ:** بە تەواوی. پێموایە دەتوانین روونی بكەینەوە چۆن لەم بارەیەوە یاساو جوانناسی چەند مەسەلەیەكی هاوشێوە دەوروژێنن (بۆیە پێرەوی یاسا لە سیستمەكەی فێختەشدا پارێزگاری لەو شوێنە دەكات كە لای كانت جوانناسی داگیری كردبوو): لە هەردوو حاڵەتەكەدا, مەسەلەكە پەیوەندیی بە كەمكردنەوەی تاكگەراییەوە هەیە بەمەبەستی ئەوەی وا لە خودنێوەندی بكرێت شیاو بێت. چونكە یاسای نویێ یاسای كۆتكردنی خودییانەیە بە پێی مەرجی ئازادی ئەویتر (بێگومان لە پرەنسیپەكەیدا). ئێمە لە كایەی جوانناسیدا دەكەوین بەسەر ئەم بونیادەدا, كە لەوێدا مەبەستەكە ئەوەیە بزانین چۆن لە تویێ ئەم خودنێوەندییە تایبەتی و پەرۆشەدا, كۆتكردنی پێوانەی جوانناسییانە شیاوە.





**کرزیستۆف بۆمیان:** بەپێی قۆناغ و حاڵەتی بیری فەرەنسی بە رای ئێوە ئەو ئاڕاستانە چین کە پێویستە لە پێشەوە کەشف بکرێن؟

**ئالان رینۆ:** بە ڕای من ئەوەی پێویستە لە قۆناغی ئێستادا کەشفی بکەین, لەدەوری ئەم مەسەلە یەکلاییکەرەوەیە دەسوڕێتەوە. زانینی ئەوەی چۆن سەرلەنوێ لەناو ئاسۆی خودنێوەندیدا بیر دەکەینەوە, کە خودێتیمان و ئینتیمامان بۆ مۆدێرنیزم لە ناو بازنەکانی سەروو تاکگەراییدا دەهێڵێتەوە, هەروەها بیرکردنەوە لەو بەهایانەی لانیکەم قابیلی ئەوەن وا بیریان لێبکرێتەوە کە بۆ "هەموان باشن", هەروەها لە پێکهاتنی تەوەرەکانی خودنێوەندی. لەم گۆشەیەوە ئەو دوو مەیدانەی پێویستە بە راستی کەشف بکرێن بریتین لە جوانناسی و یاسا, کە هەردوکیان ــ ئەمەش رێکەوت نیە ــ لە لایەن بیری 68 ەوە بە شێوەیەکی مەنهەجییانە نکولیی لە تایبەتمەندێتییان کراوە, یان لەبەر ئەوەی چەند دیاردەیەکی ئایدیۆلۆجییانەی ئاساییان تێدا دۆزراوەتەوە (زەوقەکان وەکو ستراتیجی جیاکار, یاساش وەکو بونیادێکی سەروو), یاخود لەبەرئەوەی وەکو دوبواری هەڵسەنگاندن, بەستراونەتەوە بە میتافیزیای خودییەوە (ئەو مانایەی هایدگەر مەبەستی بوو کاتێک " لە نامەیەك دەربارەی مەیلی مرۆڤدۆستییانە" دا وتی کە "هەموو هەڵسەنگاندنێك بە کەسکردنە", دەبێت سەرلەنوێ مەسەلەی هەڵسەنگاندنی جوانناسییانە و هەڵسەنگاندنی یاساییانە وەکو کۆتکردنی تاکگەرایی و رەخساندنی بوار بۆ خودنێوەندیی, ئەمەش مەسەلەیەکە بە قووڵی نیشانەی رابوونی گفتوگۆی فیکرییە.

**لۆك ڤیری:** لێرەدا باسی چەند پرۆژەیەك دەکەن, وەلێ دەتوانین لە گۆشەیەکەوە باسی واقیع بکەین کە مۆرکی مێژوویی بەسەریدا زاڵە. دوو گۆڕانکاری هەیە کە ئیمرۆ بە لای منەوە گرنگن. یەکەمیان وەك دەڵێن, رەوشی بیریار دەگرێتەوە: کاتێك پێشوەخت لە بەهای مۆدێرنیزم دانەبەزێنرابێت, بیریار ناتوانێت رۆڵی بەرجەستەکەری هۆشی رەخنەیی ببینێت. گۆڕانکاری دووەمیشیان پێوەستە بەوەی یەکەمەوە: حاڵەتی ئەو خودێتییە دەگرێتەوە کە رەنگە ئیمرۆ چیتر پێویست





نەکات بە هەر نرخێك بێت ریشەکێش بکرێت. لە گۆشەنیگای مێژووی فەلسەفەوە کە وای لێهاتووە زۆرجار لەیەك کاتدا لەچاو مێژووی زانکۆییدا, زیاتر مێژوو و زیاتر فەلسەفەش بێت پێویستی بەوەیە بە وردی مێژووی ئەم خودێتییە نوێیە بگێڕینەوە. گومان لەوەدا نیە کە پێویستە وریای ئەو نەهامەتییانە بین کە مۆدێرنیزمیان جیاکردۆتەوە, بەڵام نابێت ئەوە وامان لێبکات بایەخ نەدەین بەو دیاردە ناوازەیەی دەرکەوتنی پرەنسیپی شەرعییەتی دیموکراسی خاوەن ئۆمێدی گشتگیری لە خۆراوا پێکی هێناوە (ئەوەی پێی دەوترێت مەیلی مرۆڤدۆستی سیاسیی). بێشك ئەم چاوبڕینە گشتگیرە شتێکی گوماناوییە ــ بە تایبەتی بەرامبەری چەند رۆشنبیریەك کە گومانیان هەیە لە نەریتی دیموکراسییانەی نوێ. ئەمەش هەرگیز رێگە نادات بە دیموکراسی وەسف بکرێن. لەم حاڵەتەدا, ئەوەی سەیرە, ئەوەیە بە رووکەش هەندێك زرنگیی پێدەوێت بۆ تێگەیشتنی ئەو بەڵگەنەویستەی ئەوە دەگەیەنێت کە دەشێت و پێویستە ئەمرۆ لە دەرەوەی ئەندێشەی ئیمپریالیزمی وجیهانسێیەمی بیر بکەینەوە.

**کرزیستۆف بۆمیان:** کەواتە تەحەداکەی ئێستا تەحەدایەکی گشتگیرە. بەوەی دان بە هەموو چەشنەکانی جیاوازیدا نراوە, ئایا داواکراو ئەوەیە شکڵە جیاجیاکانی گشتگیری بە شەرعی بکرێنەوە؟

**لۆك ڤیری:** بەڵێ سەرلەنوێ بیرکردنەوە لە بالایی, وەڵێ وەك سروشت / گەردون نا, وەکو یەزدانیش نا, چونکە "گەڕانەوە بۆ دێرینەکان" نیشانەی سەختییە, نا, خۆشبەختانە نیشانەی چارەسەرە.

**وەرگێڕانی: جۆرج ئەبی ساڵح.**

**سەرچاوە: گۆڤاری "الفکر العربی المعاصر"**





***ئێوە لە ساڵی 1906دا لە لیتوانیا[1] هاتوونەتە دونیاوە، سەبارەت بە منداڵیتان لە لیتوانیا چیتان بیرماوە؟**

من لە خێزانێکی جوولەکەدا هاتمە دونیاوە، کە فەلسەفە و زانستیان بەرز دەنرخاند. باوکم لە کۆڤنۆ (Kovno) کتێبخانەی هەبوو، هەربۆیە منیش هەمیشە لەگەڵ کتێبدا ژیاوم. گەرچی لە لیتوانیادا دەژیاین، بەڵام من لە ژینگەیەکی کەلتووریی ڕووسیدا گەورە بووم. لەبەرئەوەی ئەو سەردەمە زمانی ڕۆشنبیران" زمانی ڕووسی بوو، لیتوانیایی زمانی خەڵکەکە بوو. جوولەکەکان بە ڕووسی لەگەڵ منداڵەکانیاندا قسەیان دەکرد. یەکەمین بیرەوەری گرنگی من جەژنی سێسەدەمین ساڵی بنەماڵەی ڕۆمانۆڤ[2] بوو لە ساڵی 1913دا، ئەوکاتە من تەمەنم شەش ساڵان بوو، ئێستاش بیرم دێ شەقامەکانی شارەکەمان بە ئاڵای پادشایی پڕکرابۆوە. دووەمین بیرەوەریی گرنگم سەبارەت بەو ڕۆژگارە، دەستپێکردنی یەکەم جەنگی جیهانی بوو لە ساڵی 1914دا. ئەوکات ئێمە لیتوانیامان جێهێشتبوو تا بچین لە خارکۆڤ- لە ئۆکرانیا[3]- بژین. شەش

---

[1] **لیتوانیا** Lithuania, کۆمارێکە لەباکوری ئەوروپا, لەباکورەوە لاتیڤیا دراوسێیەتی, لەباشورو خۆرهەڵاتەوە بیلارۆس, لەباشورەوە پۆڵەندە, لەخۆراواشەوە دەریای باڵتیك. لیتوانیا یەکێکە لەناوچەکانی باڵتیك لەگەڵ لاتیڤیاو ئەستۆنیا. لیتوانیا یەکێك بووە لەکۆمارەکانی سۆڤێتی پێشوو.

[2] ڕۆمانۆڤ Romanov بەرەبابێکن کە بۆ ماوەی سێ سەدە فەرمانڕەوایی ڕوسیایان کردووە, لە ساڵی 1613 وە هەتا شۆڕشی ڕووسی لە ساڵی 1917 دا. ئەم خێزانە دەگەڕێنەوە بۆ خێزانێکی ئەریستۆکراتی مۆسکۆ, کە ئەناستاسیای کچیان شووی کردووە بە ئیڤانی چوارەمی تزاری ڕوسیا, کە بە ئیڤانی تۆقێنەر ناسراوە. منداڵەکانی نیکیتای برای ئەناستاسیا, لەسەر شەرەفی باپیرەیان ناوی ڕۆمانۆڤیان هەڵگرتووە. میشائل کوڕەزای نیکیتا بوو بەیەکەمین ڕۆمانۆڤ کە ببێت بە تزاری ڕوسیا.

[3] **ئۆکرانیا** Ukraine دەکەوێتە خۆرهەڵاتی ئەوروپاوە, دوای ڕوسیا گەورەترین وڵاتی ئەوروپایە, لەخۆراواوە پۆڵەندە, سلۆڤاکیاو هەنگاریا دەوریان داوەو لەباشوریشەوە ڕۆمانیاو





**مانگی خایاند تا گەیشتینە خارکۆڤ، لەبەرئەوەی لە سەفەرەکەماندا لە چەند شارێکی تریش لامان دا. لە خارکۆڤ چوومە قوتابخانەیەکی ڕووسی. لەوێ بوو کە بۆ یەکەمجار هەستم بە مەزنی ئەدەب و فیکری ڕووسی کرد.**

***لەو ماوەیەدا کام نووسەری ڕووسی پتر کاریگەریی لەسەرتان هەبوو؟**

**ئادەمیزاد لە تەمەنی دە ساڵیدا هەم دەکەوێتە ژێر کاریگەریی فۆلکلۆر و، هەم ئەدەبی ڕەسمی و، هەم کتێبە مێژووییەکانیشەوە. من گەرچی جوولەکە بووم، وەلێ لەنێو چیرۆکە ڕووسیەکاندا گەورە بووم. بەڵام ستایشی نووسەرانێکی ڕووسی گەورەی وەکو پووشکین[4] و تۆڵستۆی[5] و تۆرگنێڤیشم[6] دەکرد. بەمجۆرە. من وەکو منداڵێکی ڕووسیی ئاسایی گەورە بووم.**

***پاش چەند ساڵێك، شۆڕشی بۆلشەفیك[7] ڕووی دا و ئێوەش سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ لیتوانیا؟**

---

مۆلداڤیا, باکورو خۆرهەڵاتیشی بە روسیا گیراوە. لەباکوریشەوە بیلارۆس دراوسێیەتی. یەکێك بووە لە کۆمارەکانی سۆڤێتی رابردوو.

[4] **پوشکین**, ئەلێکساندەر سێرگیفیچ Pushkin, Aleksandr Sergeyevich (1799-1837) شاعیرو نوسەرێکی روسییە, یەکێکە لەرابەرانی شیعری لیریکی لەئەدەبی روسیدا, هەروەها چیرۆك و رۆمان و شانۆنامەشی نوسیوە.

[5] **تۆڵستۆی** لیۆ نیکۆلایڤیچ Tolstoy, Leo Nikolayevich (1828-1910), نوسەرێکی روسییە, فەیلەسوفێکی ئاکارییشە. یەکێکە لە رۆماننوسە نێودارەکانی جیهان. رۆمانەکانی کاریگەریی گەورەیان هەبووە لەسەر ئەدەبی سەدەی بیستەم. هەروەها تێڕوانینە ئاکارییەکانیشی یاریدەی دروستبوونی چەند شێوازێکی گرنگی بیرکردنەوەی ئاکاریی و سیاسییان داوە. تۆلیستۆی بیریارێکی ریفۆرمیست بووەو, دیارترین رۆمانی جەنگ و ئاشتی 1865 . 1869 .

[6] **تۆرگینیڤ**, ئیڤان سێرگیڤیچ Turgenev, Ivan Sergeyevich (1818-1883) نوسەرێکی رووسییە, بەخاوەنی سەرەکیترین شێوازی نوسینی ئەدەبی رووسیی لەقەڵەم دەدرێت, رۆمان و شیعرو شانۆنامەکانی, روون و رەوان و بەبڕشتن, هەروەها هاوەنی تێڕوانینێکی لیبراڵانەی هاوسەنگیش بووە.

[7] **بۆلشەفیزم** Bolshevism, پێڕەوێکی مارکسیستە, لەسەر تیورییەکانی کارل مارکس دامەزراوە, بەڵام بەو شێوەیەی لینین دایڕشتووە, ئەو تیورییانە لە گۆنگرەی دووەمی پارتی سۆسیال دیموکراتی روسییدا لە ساڵی 1903دا, لە لەندەن باسیان لێوەکراوە. بوونی جیاوازی لە بیرو بۆچوونی ئەو وەفدانەدا کە ئامادەی کۆنگرەکە ببون, هەموویان لە دوو





وەختێ شۆڕش ڕووی دا، ئێمە ناچار بووین ئۆکرانیا جێبهێڵین و بگەڕێینەوە بۆ شوێنی لەدایکبوونم کە لیتوانیایە. لەوێ خوێندنی ناوەندیم لە خوێندنگایەکی یەهودیی ڕووسی زماندا تەواوکرد. لەو ڕۆژگارەدا لە لیتوانیا قوتابخانەی یەهودی هەبوون کە تیایاندا خوێندن بە زمانی ڕووسی بوو. بەم جۆرە، دوا تاقیکردنەوەم هاوتای دیپلۆمی فەرەنسا بوو و لەلایەن دەوڵەتەوە بە ڕەسمی دانپیانراو بوو. ئەوەشم بەبیر دێ کە ئەودەمە بە ئامادەبوونی نوێنەری حکوومەتی لیتوانیا تاقیکردنەوەکانمان ئەنجام دا.

***گەرچی ئەوسا منداڵیش بوویت" بەڵام ئایا بەربڵاویی شۆڕشی بۆلشەفیك کاریگەریی لەسەرتان هەبوو؟**

کە شۆڕشی ڕوسیا[8] لە شوباتی 1917دا دەستی پێکرد من زۆر لاو بووم، ساڵی دوای ئەوە چوومە قۆناغی ئامادەیی. باوکم و دایکم کە لە جوولەکە بۆرژواکان بوون، لە شۆڕشەکە زۆر دەترسان.

بەلای ئەوانەوە ڕابەرە بۆلشەفیکەکان شێت بوون و گەرچی زۆربەی ئەو ڕابەرانەش جوولەکە بوون" بەڵام ئەوە هیچی لەو بۆچوونەی ئەوان نەدەگۆڕی. بەڵام من شەیدای شۆڕش بووم. وەکو لاوێك نەمدەتوانی بەرامبەر بەهەوڵەکانی شۆڕش بێ دەربەست بم. هەستم دەکرد لە ساتێکی گەورەی مێژووی مرۆڤایەتیدا دەژیم. لەگەڵ ئەوەشدا بە شێوەیەکی کردەیی وەکو شۆڕشگێڕێك بەشداریم لەو شۆڕشەدا نەکرد، بەڵام ئەوەی لە دەورو پشتمدا ڕووی دەدا زۆر سەرنجڕاکێش و هەژێنەر بوو. تا ئەو ڕۆژەی کە لە حوزەیرانی 1920دا باوکم

---

بەرەدا کریستاڵە بوون, بەشی هەرە زۆری دەستەی رادیکاڵەکان لەگەڵ لینیندا بوون , لەمەشەوە ناویان لێنرا بۆلشەڤیکەکان, واتە زۆرینە. ئەمان بوون بە کرۆکی دروستبوونی پارتی کۆمۆنیستی رۆسیا.

[8] شۆڕشی روسیا Russian Revolution of 1917, زنجیرەیەك رووداوە لە روسیای قەیسەرییدا لە ساڵی 1917دا روویانداو سەرەنجامیان گەیشتە دامەزراندنی سیستمێکی کۆمۆنیستی بە ناوی یەکێتی کۆمارە سوسیالیستەکانی سۆڤێتەوە. ئەم شۆڕشەو شۆڕشی ساڵی 1905 بە یەکەوە پێیان دەوترێت شۆڕشی بۆڵشەڤییەکان.





و دایکم بڕیاریان دا بگەڕێینەوە بۆ لیتوانیا. من ئەوەم پێ خۆش نەبوو، هەستم دەکرد پشت دەکەمە هەراوزەنای مێژوو. بەڵام وەکو منداڵێکی جوولەکەش پێم قبووڵ نەبوو خیانەت لە خێزان و پەروەردەی خۆم بکەم. بۆیە لە ساڵی 1920 تا 1923 لەگەڵ باوکم و دایکمدا لە لیتوانیادا ژیام.

***بگەڕێینەوە سەر فێربوونتان. ئایا "کتێبی پیرۆز[9]" لە پەروەردەکردنی ئێوەدا وەك جوولەکەیەك ڕۆڵێکی گەورەی دیوە؟**

لە منداڵیمدا "کتێبی پیرۆز" بوونی هەبوو. بەردەوام "کتێبی پیرۆز" بەشێك بووە لە خوێندنەوەی من. لە شەش ساڵیمدا باوکم و دایکم منیان بۆ وانەی عیبریی تەوراتی دەنارد. هەربۆیە، لەو کاتەوەی چوومە ئامادەیی، عیبریم دەخوێندەوەو دەمتوانی دەقە یەهودییەکان تەرجەمە بکەم. بەڵام ئەو ڕۆژگارە لێکدانەوەکانی "کتێبی پیرۆز"یان فێر نەدەکردین. دواتر من پەیم بە گرنگیی ئەو لێکدانەوانە لە تێگەیشتنی "کتێبی پیرۆز"دا کرد.

***ئایا لەو ڕۆژانەدا کتێبی فەیلەسووفە یەهودییەکانیشت دەخوێندەوە؟**

لە قۆناغی ئامادەییدا وانەی فەلسەفە نەبوو، بەڵام من وردە وردە خۆم خولیام بەرامبەر بە فەلسەفە لا پەیدا بوو. لەوانەیە بەلاتەوە سەیر بێت، بەڵام من لە کاری نووسەرانێکی ڕووسی وەکو –دۆستۆیڤسکی و تۆڵستۆی و تورگنێڤ– ەوە فێری بیرکردنەوەی فەلسەفیانە بووم. ڕۆمانی ڕووسی پڕە لە پرسیاری فەلسەفی سەبارەت بە مانای ژیان و دڕدۆنگی میتافیزیکی.

***دوای ئەوەی دیپلۆمتان وەرگرت، لە ساڵی 1923دا هاتنە فەرەنسا و چوونە زانکۆی ستراسبۆرگەوە. بۆچی ستراسبۆرگتان هەڵبژارد؟**

---

[9] **کتێبی پیرۆز** ,Bible بریتیە لە کتێبی ئاینیی جولەکە( تەورات) و مەسیح ( ئینجیل ). تەورات و ئینجیل لەیەکتریی جیاوازن. تەورات سی و نۆ کتێبە و هەموویان لەئەسڵدا بەزمانی عیبریی نوسراون, جگە لەچەند بەشێکی کەمی کە بەزمانی ئارامیی نوسراوە . ئینجیل دوو بەشە, پەیمانی دێرین و پەیمانی نوێ کە بیست و حەوت کتێبە. پەیمانی دێرین لەلایەنی دوو قوتابیی مەسیحەوە نوسراوەتەوە, کە ئەمیان بەتۆزێك لێ زیادکردنەوەوە, لەگەڵ حەوت کتێبی تردا, تەورات پێکدەهێنن.





**باوکم و دایکم ئەویان بۆ هەڵبژاردم. دەزانیت ئەو ڕۆژگارە ستراسبۆرگ شارێکی پلە دوو بوو. نە زۆر گەورە بوو، نە زۆریش بچووک. پاشان ئەودەمە لە ستراسبۆرگدا کەلتووری ئەڵمانی پایەیەکی بەرزی هەبوو، لەبەرئەوەی خەڵکەکە بە ئەڵمانی دەدوان. باوکم و دایکم ستراسبۆرگیان هەڵبژارد، چونکە لە لیتوانیاوە نزیکترین شار بوو.**

***کاتێ چوویت بۆ ستراسبۆرگ" زمانی فەرەنسیت دەزانی؟**

**نەو، ئەوەندەم نەدەزانی. بەڵام بەرلەوەی فەلسەفە بخوێنم زمانی فەرەنسییم خوێند. هەروەها کەمێك لاتینیش.**

***لە زانکۆی ستراسبۆرگ بە پرۆفیسۆر مۆریس پرادین (**Pradines**) و بلۆندێل (**Blondel**) ئاشنا بوویت؟**

**–بلۆندێل[10] مامۆستایەکی دیار و تا بڵێی سنگفراوان بوو. بیر و بۆچوونەکانی لە تیۆرەکەی دۆرکهایمەوە[11] زۆر نزیك بوو. زۆر هۆگری کەلتووری ڕووسی بوو، هەرچۆن هۆگری هەموو کەلتوورەکانی تریش بوو. گەرچی بلۆندێل جوولەکەش نەبوو، بەڵام زۆر بایەخی بە لێکدانەوەکانی "کتێبی پیرۆز" دەدا. هەڵبەت مۆریس پرادینیش مامۆستای گەورەی**

---

[10] بلۆندێل, مۆریس (1861-1949) Blondel, Maurice فەیلەسوفێکی مەسیحیی فەرەنسایە, لە دیجۆن لە دایك بووە, لە پەیمانگای باڵای مامۆستایان خوێندوویەتی و لە زانکۆکانی مۆنتاوبان, لیل, مارسێل وانەی وتۆتەوە, لێکۆڵینەوەکانی گەیاندیانە فۆرمولەکردنی تیۆرییەك دەربارەی چارەنوس و کردەوەی مرۆڤ, لە تیۆرییەکەیدا بیرو واقیعی ئەزمونی بەتەواوی لێك جیاکراونەتەوە. پێی وابوو تەنها لە ڕێگای فیکرەوە ناتوانین ڕاستی بدۆزینەوە, بەڵکو دەبێت ملکەچی ئیرادەی یەزدانیش بین. لە نوسینەکانی: کردەوە ـ 1893, بیر ـ 1943, بوون و بوونەوەران ـ 1935, فەلسەفەو ڕۆحی مەسیحی ـ دووبەرگ 1944–1946, پێویستیی فەلسەفییانەی مەسیحییەت ـ 1950 بڵاو کراوەتەوە.

[11] **دۆرکهاییم , ئەمیل** (1858-1917), **Emile Durkheim,** تیوریستێکی سۆسیۆلۆجیای فەرەنسییە, یەکێکە لەوانەی بەشدارییان کردووە لەپەرەپێدانی سۆسیۆلۆجیای مۆدێرندا. بەبڕوای دۆرکهاییم ئەرکی کۆمەڵناسیی لێکۆڵینەوەی تاك نیە, بەڵکو بریتیە لە لێکۆڵینەوەی حەقیقەتە کۆمەڵایەتییەکان. دیارترین نوسراوی کتێبەکەیەتی دەربارەی خۆکوشتن.





فەلسەفەی گشتی بوو. زۆر باش ئاگای لە دەروونناسی و فەلسەفەی نوێ بوو. پـرادین تیۆرەکـەی لیڤـی- بـرول[12]ی لـە ڕوانگەیـەکی ئەقڵانیانـەوە شـی دەکردەوە.

*ئەو ڕۆژانە چ کەشوهەوایەك بەسەر زانکۆی ستراسبۆرگدا زاڵ بوو؟

کەشوهەوایەکی پڕ لە ئارامی و ڕەوابینی. دەتوانم پێتان بڵێم کە من وەکو جوولەکەیەك، هیچ مامۆستایەك یان قوتابیەك هەراسانی نەکردم. تەنانەت مامۆستایەکم هەبوو کە ڕاستڕەوێکی مەسیحی چالاك بوو" ناوی کارترۆن بوو. لەو ڕۆژگارەدا و بە حوکمی ئەو دۆخە سیاسییەی کە بەسەر ئەورووپادا زاڵ بوو" خوێندکارەکان زۆر سیاسیتر بوون لەمڕۆ. زۆربەی هاوپۆلەکانم مەیلیان بەلای چەپدا هەبوو. ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکارەکانیش هەواداری چەپی مەسیحی بوون.

*لە زانکۆی ستراسبۆرگ زیاتر نووسینەکانی کێت دەخوێندەوە؟

لەو ڕۆژگارەدا، فەلسەفەی تازە فەلسەفەکەی بێرگسۆن[13] بوو. هەموو باسی بێرگسۆن و چەمکی "زەمانە" (DUREE)یان لای بێرگسۆن دەکرد. منیش

---

[12] **لیڤی . برۆل, لوسییان** Lévy-Bruhl, Lucien (1857-1939), فەیلەسوف و ئەنترۆپۆلۆجیستێێکی فەرەنسییە, کە پەرەی داوە بە لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی بیرکردنەوەی دێرین, پێی وایە بیرکردنەوەی مرۆڤە دێرینەکان بیرکردنەوەی پێش لۆجیکەو, لە بنەڕەتدا جیاوازە لە بیرکردنەوەی مۆدرێن. لیڤی برۆل لەساڵی 1889 . 1927 ئوستادی فەلسەفە بووە لە زانکۆی سۆربۆن, دیارترین کتێبەکانی فەلسەفەی ئۆگست کۆمت . 1900, بیرکردنەوەی بەرایی 1922.

[13] **بێرگسۆن, هینری** Henri Bergson (1859 .1941) فەیلەسوفێکی فەرەنسییە, یەکێك بووە لە هەرە دیارترینی بیریارەکانی سەردەمەکەی خۆی, لە ساڵانی1900 . 1921 لە کۆلیج دوفرانس دەرسی وتوەتەوە, دوژمنێکی سەرسەختی پۆزەتیڤەکان بووە. ئەوەندە هاوسۆزی جولەکەکان بووە, هەتا دەسبەرداری پێڕەوە کاسۆلیکییەکەی بووە. نوسراوە بنەڕەتییەکانی بریتن لە: لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی دراوە راستەوخۆکانی هۆش ـ 1889, مادەو یادەوەریی ـ 1896, پەرەسەندنی ئەفرێنەرانە ــ 1907, وزەی رۆحانیی ــ 1919, کات و هاوکاتیی ــ 1922, هەردوو چاوگەکەی ئاکار و ئایین ــ 1932, بیر و جووڵە ــ 1934. فەلسەفەکەی بێرگسۆن لە سەردەمێکدا هات کە پۆستیڤیزم و کانتیزمی نوێ کایەی فەلسەفییان داگیر





کەوتبوومـە ژێـر کاریگـەریی فەلسـەفەکەی بێرگسـۆن و بۆچـوونی بـۆ چـەمکی "زەمەن". تەنانەت ئێستاش ناوبەناو بێرگسۆن دەخوێنمەوەو هێشتا هـەر لـەو بڕوایەدام کە فەلسەفەی هاوچەرخ بە بێ فەلسەفەکەی بێرگسۆن هیچ مانایەکی نییە.

***دوای ئەوەی لیسانسی فەلسەفەتان وەرگرت، دەستتان بە پایاننامـەی دکتـۆرا کـرد و، ئەوکاتە بوو کە ئەدمۆند هۆسێرلتان[14] کەشف کرد.**

خانمێکی لاو کە ناوی گابریل فایفەر بوو، لە "دەزگای لێکۆڵینەوەی فەلسەفی ستراسـبۆرگ" کـاری دەکـرد، ڕایسـپاردم کـە بـۆ کـارکردنم لەسـەر تیـۆرەی "ئیدراك"، کتێبی "توێژینەوە مەنتیقیەکان"ی هۆسێرل بخوێنمەوە. ئەم کتێبە زۆر قورس بوو، بەڵام دەرگایەکی تازەی لە ئاست بیرکردنـەوەی فەلسـەفیدا بە ڕووی منـدا کـردەوە. بیرۆکـەی ئـەوەی کـە ئـەو نیگایـەی لەسـەر شـتێك دەگیرسـێتەوە، هـەمان ئـەو نیگایەیـە کـە ئـەو شـتە دەپۆشـێت و، هـەروەها بیرۆکەی پەڕینەوە لە شتەوە بۆ "مەبەست" و لە "مەبەست"ەوە بۆ هەر شتێك کە ئەو مەبەستە وەکو ئاسۆیەکی تێفکرین لەخۆ دەگرێت، هـزری ڕاستەقینەی دیاردەناسیە[15]، ئەمانە کۆمەڵێك ئیمکاناتی زۆریان تێدابوو. لەبەرئەمە بوو کە پەیوەنـدیم لەگـەڵ هۆسـێرلدا بەسـت و لـە سـاڵی 1929دا بـۆ بینینـی و بـۆ

---

کردبوو, گاڵتـەیان بـە میتافیزیا دەهات و لـە شان و شـەوکەتیان کـەم دەکـردەوە, بێرگسۆن ڕووبەڕووی هەردوو شەپۆلەکە وەستایەوە.

[14] **هۆسـێرل, ئەدمۆنـد** Husserl, Edmund (1859-1938), فەیلەسـوفێکی ئەڵمانییـە, دامەزرێنـەری پێـڕەوی فینۆمینۆلۆجیایـە. یەکێکـە لـە کاریگـەرترین فەیلەسـوفەکانی سـەدەی بیسـتەم..ئوسـتادی زانکـۆی فرایبـورگ بـووە, دوای خـۆی کورسـییەکەی بـۆ هایدگـەر جێهێشـتووە, بـەڵام کـە هایدگـەر دەبێـت بەسـەرۆکی زانکـۆی فرایبـورگ, لـە ژێـر فشـاری نازییەکاندا, ناوی هۆسێرل لە لیستەی ئوستادانی زانکۆ دەسڕێتەوە. دیارترین کتێبی بریتیە لە تێڕامانە دیکارتییەکان 1931.

[15] دیاردەناسـی, **فینۆمینۆلۆجیا** Phenomenology جوڵانەوەیـەکی فەلسـەفییە لـە سـەدەی بیستەمدا, کە بایەخی داوە بەوەسفکردنی, ئەزموونەکان وەك چۆن خۆیان لە هۆشماندا دەخەنە ڕوو, بەبێ پەنابردنە بەر تیۆرییەك یان بەرنجامێك یاخود هەڵگرتنەوەی هیچ دیسپلینێك, وەك ئەوانەی لەزانستە سروشتییەکاندا هەیە.





ئامادەبوون لە وانەکانیدا چووم بۆ فرایبۆرگ[16] . مانەوەم لە فرایبۆرگ هەلی پەیوەندیکردنی ڕاستەوخۆی لەگەڵ هۆسێرلدا بۆ ڕەخساندم.

***هۆسێرل چۆن بنیادەمێك بوو؟ تایبەتمەندیەکانی چی بوون؟ سەبارەت بە کەشوهەوای وانەکانی چیت لە یادە؟**

هۆسێرل لە ڕووی وانە وتنەوەوە لە زانکۆ بنیادەمێکی زۆر تەقلیدی بوو، بەڵام بابەتی زۆر تازەی دەورووژاند. هۆسێرل وا دەهاتە بەرچاو کە ئەرکی فەلسەفی خۆی بە ئەنجام گەیاندوە، هەرچەندە وای پیشان دەدا کە هێشتا لە سەرەتای توێژینەوەکانی دیاردەناسیدایین و، هێشتا کار و لێکۆڵینەوەی فەلسەفی دیکە ماوە تا ئەو ئەرکە بگاتە هەموو شتێکدا کرایەوە.ئاکام. هەربۆیە گفتوگۆکردن لەگەڵیدا دژوار بوو. لەبەرئەوەی ئەگەر پرسیارێکت لێ بکردایە" ئەو بە درێژی لە ڕوانگەی سیستمی فیکریی خۆیەوە وەڵامی دەدایەوە. هیچ شتێکی چاوەڕوان نەکراو لە ئارادا نەبوو، وات هەست دەکرد کە بەرلەوەی ئەو قسە بکات تۆ دەزانیت وەڵامەکە چییە، لەبەرئەوەی وەڵامەکە دەچوە نێو ڕەوتی پەرەسەندن و خستنەڕووی فیکری هۆسێرلەوە.

***با بێینە سەر هایدگەر. تۆ لەبەر هۆسێرل هاتیت بۆ فرایبۆرگ، بەڵام هایدگەرت کەشف کرد.**

من لەگەڵ هەموو ئەو ڕێزە زۆرەمدا کە بۆ هۆسێرلم هەبوو، زوو دەسبەرداری بووم و کەوتمە شوێن هایدگەر. بەڵام من تاقە کەس نیم ئەمەم کردبێت. هایدگەر لە هەمان ئەو زانکۆیەدا وانەی دەوتەوە کە هۆسێرلیشی لێبوو، بەڵام قوتابیەکانی هایدگەر لە قوتابیەکانی هۆسێرل زیاتربوون. هەموو شاڵاویان دەبرد بۆ ئەو هۆڵە گەورەیەی کە هایدگەر وانەی تیا دەوتەوە. ئەمەش بۆ

---

[16] **فرایبورگ Fribourg** شارێکە لە خۆراوای سویسرە, مەرکەزی کانتۆنی فرایبورگە, لەنزیکی بەرلین, دەکەوێتە نیمچە دورگەیەکی بەردەڵانی ڕەقەڵەوە. مێژووی ئەم شارە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست, ڕێك بۆ ساڵی 1157ی زایینی. ئەم شارە بەدروستکردنی شیرینی و شیرەمەنی بەناوبانگە.





هۆسـێرل زۆر نـاخۆش بـوو. ئـەم دۆخـەش تـا ڕادەیـەك پەیوەنـدیی نێـوان شوپێنهاوەر[17] و هێگڵم وەبیر دێنێتەوە، کاتێ لە زانکۆی بەرلین بوون. زۆربەی قوتابیـەکان دەچـوونە وانـەکانی هیگڵـەوە و شـۆپنهاوەر بـە تـەنها دەمایـەوە، لەگەڵ چەند قوتابیەکدا کە لـە دەرەوەی زانکـۆوە دەهاتن. دیسانەوە دێتـەوە یـادم کـە بـۆ ئامادەبوون لـە وانـەکانی هایدگـەردا" دەبوایـە لـە بەیانیـەوە جێـت بگرتایـە بـۆ وانـەی پـاش نیـوەڕۆی. وانـەکانی هایدگـەر زۆر درەوشـاوە بـوون. هــزری ورد و زۆر تۆکمــە بــوو. بــە شــێوەیەکی بلیمەتانــە و مامۆســتایانە شــیکردنەوە فینۆمینۆلۆژییەکـەی هۆسـێرلی بـەکاردەهێنا. بـەم جـۆرە، لەهـەر وانەیەکیــدا شــتێکی تــازەی بــۆ ئێمــە پــێ بــوو. نــاتوانم پێــت بڵــێم کــە شــیکردنەوەکانی هایدگــەر بـۆ (بـوون) و (بوونـەوەر) و جیـاوازی ئۆنتۆلۆژیـا بەناوبانگەکـەی ئـەو لـە کتێبەکەیـدا (بـوون و زەمـەن)" تـا چ ڕادەیـەك منیـان سەرسام دەکرد.

***ئەی سەبارەت بە هایدگەر[18] چیتان لەیادماوە؟ بە شەخسی دەتاناسی؟**

قــەت بــە شەخســی ئــەوم نەناســیوە. هــەرگیز لــە دەرەوەی ســیمینارەکانی پەیوەندیی دۆستانەم لەگەڵیدا نەبوە. تۆ خۆت دەزانیت کە هایدگەر کەسێکی

---

[17] **شـۆپنهاوەر، ئارسـەر**, Schopenhauer, Arthur (1788-1860), فەیلەسـوفێکی ئەڵمانییە، بە فەیلەسوفی ڕەشبینی ناسراوە. دیارترین نوسرراوی تەمەنی بریتیە لەکتێبی جیهان وەکو ئیرادەو وەکو تەسەور . 1818, تێیدا باس لـەوە دەکات کە جیهان وەهمێکی گەورەیەو ئیرادەیەکی کوێرو پووچ دروستی کردووە. بەڵام دەرك کردن بە جیهان, وەك ئـەوەی لە تەسەوری ئێمەدا بێت, تاقە ڕێگای ڕزگارکردنی مرۆڤایەتییە لـەم تەنتـەڵ. کابووسە, بەمە دەتوانین ئیرادەی ژیـان لـەناو ببـەین و , ئارامیی نـاو پرەنسیپی نێرڤانادا ببەینـەوە. شایانی باسە ئەم فەیلەسوفە ژنی نەهێناوە.

[18] هایدگـەر, مـارتین ( Martin Heidegger ) ( 1889 - 1978 ) یەکێکـە لـە مـەزنترین فەیلەسـوفەکانی سـەدەی بیسـتەم , هایدگـەر بیریـاری بوونـە , گـەورەترین پرسـیار لـە فەلسەفەکەی ئەودا بریتیە لە پرسیاری : بوون چییە ؟ وەڵێ لە دوایین هەوڵیدا بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەنتۆلۆژییە دەگاتە ئەوەی کـە نیگـەرانی بریتییە لـە ماهییـەتی بوون , ئەمـەش دۆڕاندنی ململانێکەیە لە بەرژەوەندیی هەبوودا , نەك لە بەرژەوەندیی بووندا.





پلەوپایەخواز بوو، لەبەرئەوەی دژە (سامی)یش بوو[19]" زۆر جێی متمانە نەبوو، بەڵام پەیوەندییەکی گەلێ باشی لەگەڵ مامۆستا و قوتابیەکاندا هەبوو. هەڵکەوتوویەکەی شتێکی دیاربوو. بۆ منیش سەرچاوەیەکی بەپیت بوو.

***بەڵام هایدگەر کاریگەرییەکی زۆری لەسەر ئێوە جێهێشتوە.**

بەڵێ، زۆر. (بوون و زەمەن) کاریگەرییەکی زۆری لەسەر من جێهێشت. هەستم دەکرد لە ڕێی هایدگەرەوە دەرگایەك بۆ من بە ڕووی هەموو شتێکدا کرایەوە. هایدگەر خاوەنی هێزێکی وا پرشنگدار بوو کە هەموومانی دەخستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. دەبێ ئەوەت پێ بڵێم کە ئێمە هەمووماں شەیدای هایدگەر ببووین و پێی سەرسام بووین. ئەو بە جۆرێك قسەی دەکرد کە کەسی تر بەر لەو وەها قسەی نەکردبوو.

***ئەمڕۆش هێشتا ئێوە هەر بە هەمان ئەندازە شەیدای هایدگەرن؟**

بە ڕاستی پێت بڵێم، سەختە لام بڵێم شەیدای ناسیونال سۆسیالیستێکم. بەڵام بلیمەتیی فیکری و فەلسەفی هایدگەر حاشاهەڵنەگرە. من هەستم بەمە کردوە و بەردەوامیش هەستی پێ دەکەم. ئەمەش بەهێزترین کاریگەریی بوە لە ژیانمدا کە پێم قبووڵ بوە. وابزانم ئەو کاتانەی من هایدگەرم تیا ناسی (واتە سالانی 1920–1930) ئەو نازی بوو، بەڵام ئەوەندە باسی ئەوەی نەدەکرد. ئەبێ ئەوەشمان بیرنەچێت کە لە هەلومەرجە مێژوییەکانی نازیزمدا، هایدگەر بڕوای وابوو کە نیشتمانەکەی باری چارەنووسی (بوون)ی بەکۆڵەوەیە. لە ڕاستیدا هایدگەر ماوەیەك باوەڕی بە هیتلەر هەبوو. لەوانەیە

[19] **دژە سامییەت** Anti-Semitism بریتییە لە جولانەوەیەکی سیاسیی, کۆمەلایەتی, هەروەها ئابوریش دژی جولەکە. ئێستا ئەم زاراوەیە بەکاردەهێنێت بۆ ئاماژەکردن بۆ ئەو ئاخاوتن و ڕەفتارەی کە مەبەستی کەمکردنەوەو نزمکردنەوەی شەوکەتی ئەو خەڵکانەیە کە ڕەچەڵەکێکی جولەکانەیان هەیە, چ ئەگەر بەمەبەستێکی ئاینیی بێت یان نا, لەنمونەی ئەمە کاتی خۆی لەم شارەی ئێمەدا هەندێك موسوڵمانی توندڕەو, ئاگریان دەنا بەریشی ئەو جولەکانەوە کە لە شارەکەدا دەژیان. ئەم وشەیە لە ناوی سامی کوڕەگەورەی نوحەوە داتاشراوە, کە بڕوا وایە بابە گەورەی جولەکەو عەرەب و نیشتەجێ دێرینەکانی باشوری ئاسیایە. وشەکە لەدەوروبەری سالی 1879دا داتاشراوەو بەتەنها دژی جولەکەکان بووە.





لە هیتلەردا ئۆمێدی بەجیهانێکی تازە هەبووبێت. بەهەرحاڵ بەلامەوە سەختە ئەم شتانەم بیرچێتەوە.

***بە بڕوای ئێوە هەنووکەییبوونی هایدگەر لە چیدایە؟**

وتنی دژوارە. وای دەبینم ئەوەی لە هایدگەر دەمێنێتەوە دیاریکردنی ئەو پرنسیپەیە کە جۆری مرۆڤ پێگەی سەرهەڵدان و دروستبوونی ڕووداوی فەلسەفیە. بە بڕوای هایدگەر، ڕووداوی فەلسەفی پەیوەستە بە بونیادی "بوون"ەوە. لە دوای هایدگەرەوە تەواوی فەلسەفە لەسەر بناغەی ئەم بونیادی "بوون"ە گەشەی سەندوە. بە بۆچوونی ئەو مەسەلەی ئەسڵ و سەرەتا لە مرۆڤدا وەکو بوونەوەرێك دەبینینەوە. بەڵام بوونی مرۆڤ وەکو بوونەوەرێك، بریتیە لە تێگەیشتنی "بوون". بێ هیچ دوودڵییەك" فەلسەفەی هایدگەر بەرەنجامی تازەی هزری یۆنانی و ڕادیکالیزەکردنی سەرلەنوێی پرسیاری فەلسەفیە.

***ئایا ئێوە خۆتان بە فەیلەسووفێکی هایدگەری دەزانن؟**

هایدگەری نا. بەڵام دواجار هایدگەر کۆمەڵێك مەسەلە دەخاتەڕوو کە منیش پێم قبووڵن. ئەو مانایەی کە چەمکی "بوون" لە فەلسەفەی هایدگەردا هەیەتی" بە بڕوای من زۆر گرنگە. جگە لەوە، هایدگەر بەشێکە لە ژیانی فەلسەفی من. کاریگەرییەکی زۆری لەسەر من هەبوە و ناتوانم نکووڵی لەو کاریگەرییە بکەم. ئێستاش هەر جارێك کتێبی "بوون و زەمەن" دەخوێنمەوە، هەست دەکەم دەکەومە ژێر سیحری ئەوەوە.

***ئێوە لە شوێنێکدا نووسیوتانە کە هایدگەر فێری کردم بوون وەکو زرنگانەوەیەکی زمانی دەرك پێ بکەم.**

ئا.. ئێوە ئەم ڕستەیەتان لەبەرکردوە، زۆر ڕاستە، دەزانیت کە "بوون" بەر لە هەر شتێك کردارێکە. لەگەڵ ئەوەشدا لەم بونیادە ڕێزمانییەدا چەمکی بنەڕەتیتر کە مرۆڤە دێتە پێشەوە.





لە ڕەوتگەی چەمکی "بوون"ەوە، چیدی مرۆڤ دەرکەوتەیەکی پەتیی دەروونناسیانەی گیانەوەرانە نییە. لەبەرئەوەی ئەگەر مرۆڤ نەبوایە" چەمکی "بوون"یش نەدەبوو.

***با بگەڕێینەوە سەر یادەوەرییەکانتان. دەتوانیت باسی ڕووبەڕووبوونەوەکەی نێوان ئەرنست کاسیرەر[20] و مارتین هایدگەرمان لە داڤۆس بۆ بکەیت کە لە ساڵی 1929دا ڕووی دا؟ ئێوە ئاگاتان لەم ڕووبەڕووبوونەوەیە بوو.**

جۆرە کۆڕێك بوو سەبارەت بە کانت و دیاردەناسی (فینۆمینۆلۆجیا). جگە لە هایدگەر و کاسیرەر، فەیلەسووفی فەرەنسی جان کاڤایسیش لەوێ بوو کە دواتر نازیستەکان بە تاوانی ئەوەی ئەندامی بزووتنەوەی بەرەنگارییە، گوللەبارانیان کرد. من بۆ بەشداریکردن لەم کۆبوونەوەیەدا" بە ڕاسپاردەی هایدگەر کۆرسێکم لە ستراسبۆرگ وەرگرت. من ئێستاش هەندێ شتی گرنگم سەبارەت بەوە لەیاد ماوە، بە تایبەتیش ڕووبەڕووبوونەوەکەی هایدگەر و کاسیرەر. کاسیرەر باسی شیکردنەوە هایدگەرییەکەی کانتی دەکرد و هایدگەریش بۆچوونەکانی خۆی سەبارەت بە کانت دەخستەڕوو. تا ڕادەیەك کاسیرەر نوێنەری نەریتی کلاسیك و ئەریستۆکراتی ژینگەی زانکۆیی ئەڵمانیا بوو. هەمیشە لە دواوە بوو و بێدەنگ بوو. لە کاتێکدا هایدگەر نوێنەری یەکبوونی فەیلەسووف و نیشتمان بوو. ئێستاش هایدگەرم دێتەوە یاد، کاتێ جلوبەرگی سکی (هەڵخلیسکان لەسەر بەفر)ی لەبەردەکرد لەگەڵ کڵاوی

---

[20] کاسیرەر, ئێرنست ,(1945-1874) Cassirer, Ernst فەیلەسوف و ڕۆشنبیرێکی ئەڵمانییە, لە زوربەی زانکۆکانی ئەڵمانیادا دەرسی وتوەتەوە. لە ساڵی 1919دا دەبێتە پرۆفیسۆری زانکۆی هامبۆرگ و هەتا ساڵی 1933. کارەکانی ئەو بەزۆریی تەرخانن بۆ تیوریی زانین, مێژووی ئەپستمۆلۆجیا, لەگەڵ فەلسەفەی زانستدا. دیارترین کتێبی بریتیە لە گرفتەکانی زانین, سێ بەرگە, 1906 ـ 1920 , هەروەها فەلسەفەی شێوە سیمبۆلییەکان, ئەمیش هەر سێ بەرگە 1923 ـ 1929 .





ئەوانـــەی بەســـەر شـــاخدا ســـەردەکەون و هـــەموو ڕۆژێـــك بـــە مەبەســـتی پیادەڕۆیشتن، دەچوو بۆ کۆسارەکان.

هایدگــەر زۆر وەرزشــەوان بــوو، لــە کاتێکــا کاســیرەر زۆر ئــارام بــوو و حاڵــەتێکی ئەریستۆکراســیانەی هــەبوو. یادەوەریــەکی تــرم بریتیــە لــە شـــانۆنامەیەك کـــە لەگـــەڵ قوتابیـــان و مامۆســـتاکاندا ســـەبارەت بـــە ڕووبەڕووبوونەوەکەی هایدگەر و کاسیرەر پێشکەشمان کرد. پرۆفیسۆر بۆلنۆ دەوری هایدگەری دەبینی و منیش دەوری کاسیرەر. بۆیە منیان بۆ ئەو دەورە هەڵبژاردبوو، چونکە قژم لە قژی کاسیرەر دەچوو. هەموو سەروقژمیان کردبوو بە پۆدرەی سپی.

*ئێستا با بێینە سەر بەردەوامبوونتان لەسەر ڕێی خۆتان و ڕۆژگاری دووەم جەنگی جیهانی.

پاش تەواوکردنی دکتۆراکەم، چووم و لە پاریس نیشتەجێ بووم. منیان کرد بـە بەڕێوەبـەری "ئـەکادیمیای یـەهودیی خۆرهـەڵات". کـە مامۆسـتای بـۆ قوتابخانە خۆرهەڵاتیەکان ئامادە و پەروەردە دەکرد. دەستم بە نووسینیش کرد. یەکێك لە نووسینە فەلسەفیەکانی ئەو ڕۆژگارەم ناوی هەڵاتن بوو. بابەتی ئەم کارەم پێشبینی کردنی ئایدیۆلۆجیای هیتلەری[21] بوو کە وردە وردە هەموو شوێنێکی گرتەوە. کاتێ ئێستا دەچمەوە سەر ئەو دەقە و دووبارە دەیخوێنمەوە، هەموو قورسایی ئەو نائومێدییە هەست پێ دەکەم کە ئەو ڕۆژانە لە ئاست ئەو ڕووداوە مێژووییانەدا هەستم پێ دەکرد کە لە

---

[21] **هیتلەر, ئەدۆڵف** Hitler, Adolf (1889-1945), سەرکردەیەکی سیاسی و سەربازی ئەڵمانیایە, یەکێك بوو لەهەرە بەهێزترین دیکتاتۆرەکانی سەدەی بیستەم. ئەڵمانیای گۆڕی بە وڵاتێکی تەواو سەربازی و سەرەنجام لەساڵی 1939دا جەنگی جیهانیی دووەمی هەڵگیرساند. ڕەوتی دژە سامییەتی کرد بە تایتڵی پروپاگەندەکانی, پارتی نازیزی ئەڵمانیای دامەزراند. خەونی بەداگیرکردنی جیهانەوە دەبینی و توانی بۆ ماوەیەك بەشی زۆری ئەوروپاو ئەفریقیا بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە, دواجار دوای دۆڕانی لەجەنگدا خۆی لەناو دەبات. کتێبێکی نوسیوەو باسی ئەزمونی خۆی دەکات بە ناونیشانی "خەباتی من".





ئەڵمانیادا ڕوویان دەدا. چوار ساڵ دوای ئەو نووسینەم و لە ساڵی 1939دا خۆم لەناوجەرگەی ئەو ڕووداوانەدا بینیەوە. بووم بە وەرگێڕی ڕووسی و ئەڵمانی لە سوپای فەرەنسادا. پاش شکستی فەرەنسا لە 1939دا لە شاری ڕین زیندانی کرام و گواسترامەوە بۆ ئەڵمانیا.

***تۆ وەکو زیندانییەکی جوولەکە هیچت لەسەر نەبوو؟**

من بارێکی زۆر تایبەتیم هەبوو. لەبەرئەوەی ئەڵمانیەکان دەیانزانی من جوولەکەم، بەڵام جلوبەرگی سەربازیی فەرەنسایی منی لە مردن لە گرتووخانەی دیلەکان ڕزگار کرد.

سەربازە جولەکەکانیان لە سەربازە فەرەنسیەکان جیادەکردەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئێمە لە بڕیارەکانی ڕێکەوتنامەی جنێڤ بەهرەمەند بووین.

***ماوەی دیلێتیت چۆن بەسەربرد؟**

من لە ئۆردوگایەکدا بووم لە هانۆڤەر. ئەوانە ئازاری ئێمەیان نەدەدا لەسەر جوولەکە بوونمان، بەڵام لە بەیانیەوە تا ئێوارە ناچار دەکراین لە دارستاندا کاربکەین.

***کاتتان بۆ خوێندنەوە هەبوو؟**

وەکو زیندانیەکانی دی بە تەنها مافی ئەوەمان هەبوو بەستەو نامەمان بۆ بێت. کتێبیشمان پێ دەگەیشت، هەڵبەت نازانم لە کوێوە و لە کێوە. تەنانەت لەو ڕۆژانی دیلێتیەشمدا دەرفەتی سەرلەنوێ خوێندنەوەی هایدگەرم هەبوو. هێگڵ و پروست[22] و ڕۆسۆشم[23] دەخوێندەوە. دۆخێکی نموونەیی نەبوو،

---

[22] پرۆست, مارسیل 1871-1922 Marcel Proust یەکێکە لە رۆماننوسە ناسراوەکانی فەڕەنسا , سەراپای ژیانی بریتییە لە چیرۆکی گەڕان بە دوای حەقیقەتدا , دیارترین کاری بریتییە لە گەڕان بە دوای زەمەنی ونبوودا.

[23] رۆسۆ, جان جاك (1712-1778) Rousseau, Jean Jacques فەیلەسوف و تیوریستی سیاسیی نێوداری فەرەنسایە, نوسینەکانی بە یەکێك لە هۆیەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسە دادەنرێن. لە 28 ی حوزەیراندا لە جنێڤ لە دایك بووەو لە 2 ی تەموزدا لە





بەڵام توانای بەرگەگرتنیم هەبوو. هەرچۆنێك بوو وەختی خۆم بەفیڕۆ نەدەدا. دەزانیت، جەنگ و زیندان هەڵوێستگەلێکن کە تیایاندا مەسەلە ئۆنتۆلۆجیەکان وەکو پێداویستیەکی ئاکاری خۆیان دەسەپێنن.

***ئێستا کە هاتینە سەرباسی ئاکار (ئەخلاق)، هەستتان چی بوو بەرامبەر ئەو کوشتارەی نازیستەکان لە ئۆردوگاکانی دیلەکاندا ئەنجامیان دا؟**

لە زیندان، هیچ شتێکمان لەمانە نەدەزانی، دواتر تێگەیشتین. قابیلی تەسەور نەبوو، تەنانەت بۆ دیلەکانی جەنگیش. جیاوازیی نێوان ئێمەی سەربازانی جوولەکەی زیندانی لە زیندانی ئەڵمانیەکاندا و ئەو جوولەکانەی کە بۆ کوورەکانی سووتاندنی مرۆڤ لە ئاشڤایتس دەنێردران" ئەوە بوو کە هەرچەند لەگەڵ ئێمەدا مامەڵەیان خراپ بوو، بەڵام وەکو سەرباز، یاسا نێودەوڵەتیەکان بەرگریان لە ئێمە دەکرد. لە کاتێکا ئەوانیان بە چاوی حەیوانەوە تەماشا دەکرد و کەس نەبوو بەرگرییان لێ بکات. لەگەڵ ئەمانەشدا. ئاشڤایتس بۆ هەتا هەتایە پەڵەیەکە بە ویژدانی مرۆڤایەتیەوە.

***یەکەمین کتێبێك کە تیایدا بیروبۆچوونی خۆتان ڕوون دەکەنەوە کتێبێکی بچکۆلەیە بە ناوی "لە بوونەوە تا بوونەوەر" کە لە کاتی جەنگدا و لە زینداندا نووسیوتانە.**

بەڵێ وایە. کاتێ کە زیندانی بووم لە ئۆردوگایەکدا" دەستم بە نووسینی ئەم کتێبە کرد و پاشتر لە پاریس بڵاوم کردەوە. وای بۆ دەچم ئەوەی گرنگە لەم کتێبەدا وەسفکردنی مەسەلەی بوونە لە بێناویدا. ئەو مەسەلەیەی کە لەم

---

ئێرمۆنڤێلی فەرەنسا مردووە. باوکی سەعاتچی بووە, باپیری ڕەوکردوویەکی فەرەنسایی پرۆتستانت بووە, ناوی ئیسحاق بووەو کچێکی خەڵکی جنێڤی هێناوە کە ناوی سۆزان بیرنار بووەو بەسەر ڕۆسۆوە ڕۆیشتووە. ڕۆسۆ نوێنەری باڵی چەپی لایەنگیرانی ڕۆشنگەریی فەرەنسییە, وەکو فەیلەسوف و زانای سۆسیۆلۆجیاو زانای ئیستاتیکاو ڕۆماننوس ناسراوە. یەکێکیشە لە گرنگترین تیوریستانی بواری پەروەردە. بانگەشەی کردووە بۆ باوەڕبوون بە یەزدان و نکوڵیکردن لە سرووش. نویسینە سەرەکییەکانی برینتین لە : وتارێك دەربارەی نایەکسانێتی لە نێوانی مرۆڤەکاندا ـ 1755, پەیمانی کۆمەڵایەتی ـ 1762, ئەمیل یان دەربارەی پەروەردە ـ 1762.





کتێبەدا دەخرێتەڕوو شتێکە کە من ناوم لێناوە "هەیە" (یان بوونی هەیە). کاتێ لە "هەیە" دەدوێم، مەبەستی لایەنی ناشەخسی بوونە. دەبێ وریابین کە بێناوی و بێدەربەستی چەمکی "هەیە" لەگەڵ بەخشندەیی چەمکی "es gibt"ی هایدگەردا تێکەڵ نەکەین. لەبەرئەوەی لە "es gibt"دا فرمانی ئەڵمانی "geben" هەیە کە بە مانی "پێدان" دێت. بە بۆچوونی هایدگەر "es gibt" ڕەحمەتێکەو دراوە. لە کاتێکا چەمکی "هەیە" لە جۆرێك بێ مانایی (non- sense)ی بێناو و ناشەخسیەوە سەرچاوە دەگرێت. دەبێ بە جۆرێك لە "هەیە" بگەین، وەکو ئەوەی دەڵێین "ڕۆژە". لەم ڕستەیەدا چەمکی بەخشندەیی نییە. ئەم ئەزموونە ترسناکە، بە ناشەخسی کردنە، ترسێکی تەواوە بەرامبەر بە بوون.

*** وێڕای ئەمەش، لەودیو ئەم دڵەڕاوکێی بێناوی و ترسەوە لە بوونێکی بێناوەوە، ئێوە بۆ یەکەم جار لە کارەکانتاندا باسی مەسەلەی "ئەوی دیکەیی" دەکەن.**

ڕاستە. دەرچوونی ڕاستەقینە لە چەمکی "هەیە" لە "بوون لە پێناوی ئەوی دیکەدا" خۆی حەشارداوە. بێمانایی بوون بە تەنها لە ئاستی قبووڵکردنی بەرپرسیاری بۆ ئەوی دیکەدا نامێنێت. تەنها کاتێك "من" لە کۆتی "هەیە" ڕزگاری دەبێت کە پەیوەندییەکی بێ مەبەستانە لەگەڵ ئەوی دیکەدا دروستبکات. ئەوی دیکە، واتە چوونە دەرەوە لە خود. هەموو ئەو شتانەی دواتر نووسیمن" ڕیشەیان دەچێتەوە سەر ئەم بیرۆکەی "بوون لە پێناوی ئەوی دیکەدا"، کە لەم کتێبەدا لێی دواوم.

***بابەتی "ئەوی دیکە" لە کتێبێکی تری ئێوەشدا دەبینین کە ناوی "زەمەن و ئەوی دیکە"یەو بریتیە لە چوار وتارتان کە لە "قوتابخانەی فەلسەفە"ی جان ڤاڵدا وتوتانەتەوە. دەتوانیت باسی ئەم کتێبەتمان بۆ بکەیت؟**

لەگەڵ جان ڤاڵدا زۆر هاوڕێ بووین و لەو بڕوایەدا بووم کە فەیلەسووفێکی گەورەیە. جان ڤاڵ[24] ئەم قوتابخانەیەی لە نزیك سۆربۆنەوە[25] دروستکردبوو تا

---

[24] ڤاڵ, جان Jean Wahl ( 1888 . 1974 ) فەیلەسوفێکی فەڕەنسییە , زۆربەی تەمەنی خۆی لە زانکۆکانی فەڕەنسادا بەسەر بردووەو سەرقاڵی پێگەیاندنی چەندان نەوە بووە لە





دەرفەت بۆ فەیلەسووفە نائەکادیمیەکان برەخسێنێت قسەی خۆیانی تیا بکەن. ئەوەبوو داوای لە من کرد چەند وتارێك لەسەر بابەتەکانی کار و هزری فەلسەفیم بخوێنمەوە. منیش بابەتی "زەمەن"م وەکو دەرگایەك بەسەر "ئەوی دیکە"دا هەڵبژارد و هەوڵم دا ئەوە بخەمە ڕوو کە زەمەن بەرەنجامی کرداری یەك "من"ی تەنها و گۆشەگیر نییە، بەڵکو بەرەنجامی پەیوەندیی تاکە کەسە بە ئەوی دیکەوە. ئەم کتێبە دەیەوێت زەمەن لە چوارچێوەی ئەزموونی پەتی درێژبوونەوەدا نەبینێت" بەڵکو لە پەیوەندیدا بە "ئەوی دیکەوە".

***کەواتە بە بڕوای ئێوە کۆمەڵایەتیبوون (Socialite) دەرچوونە لە خود بۆ بینینی ئەوی دیکە. ئایا لێرەدا چەمکی "بەرپرسیاری" دێتە پێشەوە؟**

بەرپرسیاربوون واتە بێدەربەست نەبوون لە ئاست ئەوی دیکەدا.

بەر لەوە هۆسێرل بەرپرسیارێتی لە ئاست حەقیقەتدا خستەڕوو, . بە بۆچوونی من بەرپرسیارێتی لە ئاست حەقیقەتدا، بەبێ بەرپرسیارێتی لە ئاست ئەوی دیکەدا" بوونی نییە. پەیوەندیی نێوخودێتی (intersubjectivite) تەنها لە ئاکاردا بە مانای بەرپرسیارێتی هەیە. بە واتایەکی دی، مەسەلەی تاکەکەسی تەنها لە شێوەی پەیوەندیی نێوخودێتیدا هەیە. خودێتی (Subjectivite) بریتی نییە لە بوون لە پێناوی خۆدا" بەڵکو بریتییە لە بوون لە پێناوی ئەوی دیکەدا.

***ئەی بەرپرسیارێتی ئەوی دیکە بەرامبەر بە من چییە؟**

بەرپرسیارێتی ئەوی دیکە بەرامبەر بە من بەخۆیەوە بەندە. پەیوەندیی بەرابەر نییە. ئەوی دیکە بەر لە من. من هەم لەبەرئەوەی بۆ ئەوی دیکە هەم.

---

ڕۆشنبیرەکانی فەڕەنسا , جگە لە فەلسەفە شارەزایی لە وێنەکێشان و مۆسیقاو شیعریشدا هەبووە , دیارترین کتێبی بریتییە لە (( دەوری سات لە فەلسەفەی دیکارتدا)).

[25] **سۆربۆن** ,Sorbonne ناوی یەکێك لەبیناکانی زانکۆی پاریسە, بەشێوەیەکی میللی بەکارهێنراوە بۆئەوەی گوزارشت لە تەواوی زانکۆکە بکات. ناوەکە لەناوی کۆلێجێکی ئاینییەوە خواستراوەتەوەکە لەدەوروبەری ساڵی 1257دا, لەلایەنی ڕۆبەرت سۆربۆنەوە, دامەزرێنراوە.





هەمیشە بەرپرسیارێتی من زیاترە لە بەرپرسیارێتی هەموو ئەوانی دیکە. هەروەکو ئەوەی دۆستۆیڤسکی لە (برایانی کارامازۆڤ)دا دەڵێت: "ئێمە هەموومان بەرامبەر بە هەموو بەرپرسیارین لە هەموو شتێك و هەموو کەسێك و من لە هەموو ئەوانی دیکەش زیاتر بەرپرسیارم".

***بە ڕای ئێوە پەیوەندی لە نێوان چەمکی "بەرپرسیارێتی" و بابەتی "ڕوخسار"دا هەیە. چۆن دەتوانین پەیبردن بە ڕوخسار بە پێداویستیەکی ئاکاری لەقەڵەم بدەین؟**

ئەوی دیکە ڕوخسارە، ڕوخساریش مانای تایبەتی ئەوە. هەر بۆیەشە باشترین ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەوی دیکەدا لە ڕێی ڕوخسارییەوە دەبێت. ڕووبەڕوو سەیرکردنی ئەوی دیکە، تەماشاکردنی ڕوخساری، بەشیاوکردنی کۆتایی پێنەهێنانی پەیوەندیی ئاکاریە. ڕوخسار ئەو شتەیە کە یەکێك لە ماناکانی ئەوەیە کە "تۆ هەرگیز ناکوژیت" و تەواوی پەیوەندیی ئاکاریش دەچێتە ژێر ڕکێفی ئەم نەشیاوبوونەی کوشتنەوە. لە یەکەمین جیلوەی ڕوخساری ئەوی دیکەدا، ئەم فەرمانەی تەورات هەیە کە "تۆ هەرگیز ناکوژیت"، ڕوخسار فەرمانێکیشە بۆ لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی ئەوی دیکە و بە تەنها جێنەهێشتنی.

***بە ڕای ئێوە ڕوخسار خاوەنی تایبەتمەندیی "پاکژی"یشە. ئەم چەمکی "پاکژی"ە چۆن هاتۆتە ناو فەلسەفەی "ئەوی دیکە"ی ئێوەوە؟**

من لەو بڕوایەدام کە پەیوەندیی نێوان ئادەمیزادەکان بە تەنها لە پاکژیی بووندا بۆ یەکدی هەن. لە ڕوخساردا جۆرە پاکژیەك هەیە، بەڵام بە تایبەتی لە ڕەفتارێکیشدا هەیە کە بە مەبەستێکی ئاکاری لەگەڵ ڕوخسارێکی تردا دەبێت. لە پەیبردن بە ڕوخساردا بێگومان پەیبردن بە بیرۆکەی پاکژیش هەیە. بەرپرسیارێتی تاکەکەس بەرامبەر بەوی دیکە دەستەبەری پاکژیی باری سەرشانی ئەوە لە ڕووبەڕووبوونەوەیدا لەگەڵ ڕوخسارێکی ڕووت و نامۆی کەسێکی دیکەدا.

***ڤیتگنشتاین دەڵێت: "ڕوخسار ڕۆحی جەستەیە" ئێوە لەم بارەیەوە چی دەڵێن؟**





بە بڕوای من ئەم دەستەواژەیەی ڤیتگنشتاین خاڵیە لە ئاکار. ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ڕوخسار پەنجەرەیەکە بە ڕووی ئەوی دیکەدا، ئادەمیزاد واتە ئیمکانی پاکژبوون. لە بوونی "زیاتر بایەخدان بە ئەوی دیکە وەك لە خەمی خۆت"دا پاکژییەکی شاراوە هەیە. مەبەستی من لە ڕوخساری ئەوی دیکە بەرپرسیارێتی من بەرامبەر بەو و هەر ئەمەش کرۆکی باسی عەدالەتە.

***مەبەستتان لە عەدالەت چییە؟**

مەبەستی من لە عەدالەت" چاوەڕێ کردنی داوەرییەکە کە ئەوی دیکە بە تاقانە و دانسقە دەزانێت. عادیلبوون واتە دۆزینەوەی بەرزی و جوانی لە ئەوی دیکەدا بەبێ گرنگیدان بە بەرژەوەندیی تایبەتی. واتە بە گوێرەی حەقیقەت داوەریکردن و بە عیشقەوە ڕەفتارکردن لەگەڵ ئەو کەسەدا کە دەچێتە ژێر داوەرییەکەوە. بە واتایەکی دی عادیلبوون واتە کەمکردنەوەی ئەو مەودایەی کە عەدالەت لە چاکە جیادەکاتەوە.

***تۆ لەو بڕوایەدایت کە کۆمەڵگا خۆرئاواییەکان، کۆمەڵگای عادیلن؟**

ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە کۆمەڵگا خۆرئاواییەکان کۆمەڵگای لیبرالن، بەڵام پێویستیان بە کۆمەڵگای کراوەتر هەیە. لەبەرئەوەی بوونی عەدالەت لە کۆمەڵگای لیبرالدا خۆی لە خۆیدا بوونێکی بنجبڕانە نییە. پێویستە بەردەوام لە ناوجەرگەی ئەم کۆمەڵگایانەدا بزووتنەوەی وا دروست ببن کە ببنە مایەی هەستکردن بەوەی کە هێشتا عەدالەت عادیلانە نییە. لەوانەیە هەر ئەمەش خەسڵەتی جیاکەرەوەی دیموکراسی بێت، لەبەرئەوەی ڕیشەکانی دیموکراسی لە جۆرێك ئازاری ویژدانیدایە بەرامبەر بەو عەدالەتەی لە ئارادایە. دیموکراسی دەزانێت کە تەواو عادیل نییە و لەبەر ئەمەشە پەنا دەبرێتە بەر چاکەخوازی و گەر ئەوە فەرامۆش بکات کە دەتوانێ عادیلتر بێت، ئەوکات مەترسیی ئەوەی لێ دەکرێ بگۆڕێ بۆ سیستمێکی تۆتالیتار و لەم حاڵەتەشدا ئەوی دیکە وەکو بوونەوەرێکی دانسقە و تاقانە و تاکێکی زیندوو لەناودەبات و خۆی لە دونیایەکی ڕێکخراو و بەڕێوەبراودا نوقم دەکات.





***لە شوێنێکدا بەرچاوم کەوتوە کە لە کتێبەکەی "ڤاسیلی گرۆسمان"ەوە، -واتە کتێبی (ژیان و چارەنووس)- هەندێ شتت لەم بارەیەوە وەرگرتوە.**

من گرۆسمان بە نووسەرێکی زۆر باش دەزانم. ئەو ڕۆماننووسێکی گەورەیە کە بە وردی سەیری قەیرانە سەرەکیەکانی ئەم سەدەیەمان (واتە سەدەی بیستەم) دەکات. گرۆسمان گەورەترین قەیرانی مانەوی لە ئەورووپای مۆدێرندا دەبینێتەوە. گرۆسمان پێمان دەڵێت کە چۆن هزرێکی دڵفراوانی وەکو سۆسیالیزم– کە دان نانە بە ئەوی دیکەدا و سیستمێکە لەسەر چاکە بنیات نراوە– هەر ئەوەندە بگۆڕێت بۆ ڕێبازێکی سیاسی و ڕێکخراوێک و سیستمێکی زەینی، دەبێت بە سیستمێکی ترسناکی ستالینی. ئەوەی کە گرۆسمان پیشانمانی دەدات نائومێدییەکی تەواوە کە بەرەنجامی سیستمی ترسناکی ستالینیزمە. لەگەڵ ئەمەشدا بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە شتێکی پۆزەتیڤمان دەستگیر دەبێت، کە ئەویش هێزێکی کەمی چاکەخوازیە، ئەو چاکەخوازیيانەی کە لە شێوەی کاری بچووک و تەنهادا دەردەکەون، لە نێوان دوو کەسدا ڕوودەدەن و ناچنە چوارچێوەی سیستمێکەوە. وەکو دیمەنی کۆتایی کتێبێك کە تیایدا کۆمەڵێك کەس دژی سەربازێکی ئەڵمانی هەڵساون و بەڵام لەولاوە ژنێك دوا پارچە نانی خۆی دەدا بە سەربازە ئەڵمانیەکە. ئیدی ئەمەش جۆرە پیاچوونەوەیەکە بە ئاکاردا، بەبێ خۆهەڵواسین بە سیستمێکی ئاکارییەوە.

***ئەمە هەمان ئەو بیرۆکەیەیە کە ئێوە لە کتێبی "هەمەکێتی و بێکۆتایی"دا دووبارە دەچنەوە سەری.**

من بەرلەوەی کتێبی "ژیان و چارەنووس"ی گرۆسمان بخوێنمەوە" ئەو کتێبەم نووسی. بەڵام هزری "چاکەخوازی" بەو شێوەیەی کە گرۆسمان لەو کتێبەیدا باسی کردوە، لە کتێبەکەی منیشدا هەیە. ئەوەی ویستوومە لەو کتێبەدا بیخەمەڕوو ئەوەیە کە ناتوانین مێژووی فەلسەفە بۆ جۆرە هەمەکێتیەك کورت بکەینەوە کە تیایدا هۆشیاری بە خود هەمان هۆشیاریە بە گشت. من دژی ئەو





بیرۆکەیەم کە پێی وایە دواجار ئەکرێ تەواوی ئەزموونەکان لە یەك مەعریفەو لە یەك هـێزی ڕەهـادا کۆبکەینـەوە و هەمەکێتییـەکی پـێ ببەخشـین. مـن هەوڵمداوە ڕێگایەکی دی بۆ گەیشتن بە مانای بێ کۆتایی بکەمەوە.

***ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە تۆ پێی دەڵێیت (non- sythetisable) (واتە ئەو شـتەی قبـوڵ ناکات لەگەڵ شتێکی تردا ئاوێتە بێت و لەگەڵیدا ببێت بە یەك —و—).**

ڕێك وایـە. ئـەوەی مـن پێـی دەڵـێم (non- synthetisable) پەیوەنـدیی ئـەخلاقیی نێـوان مرۆڤەکانـە، ڕووبەڕووبوونـەوەی نێـوان دوو کـەس کـە بـە ئاوێتـەبوون کۆتایی نەیەت. خودێتی ڕاستەقینەی مرۆڤ ئاوێتەبوون (بە مانای لەدەستدانی تـاکێتی —و—) قبـووڵ ناکـات. لایبنیـز[26] ئەمـە ناودەنێـت قبووڵنەکـەری دیاریکردن، واتە تاکە کەسەکان دەتوانن کۆببنەوە بەبێ ئەوەی بە تـەواوی بە یەکەوە گرێدراوبن.

***بەم جۆرە تۆ لە فەلسەفەکانی هەمەکێتی جیادەبیتەوە.**

لـەم کتێبـەدا هەوڵـدەدەم ئـەوە پیشـان بـدەم کـە ئـەرکی ئاکـاری بـە زەرورەت پێویسـتی بـە ئۆنتۆلۆجیـا نییـە. دەبـێ لـەوە بگـەین کـە ئاکـار جۆرێکـە لـە فەلسـەفەی یەکـەم، لەبەرئـەوەی ماهیـەتێکی پێشـینەی هەیـە. ئاکار لـە سـەروو بیرکردنەوەیـەکی ئەبسـتراکتەوە نییـە. لـە ئاکـاردا وەکـو بەرپرسـیارێتیەك" سەرچاوەی خودێتی مرۆڤە.

---

[26] **لایبنیز**, گۆتفرید ویلهێلم Leibniz, Gottfried Wilhelm ( 1646 – 1716 ) مـەزنترین فەیلەسـوفی ئەڵمانییـە لـەپێش سـەردەمی کانتـدا, هـەروەها زانـای ماتماتیـك و کیمیاگـەرو دیپلۆمـات و مێـژوونوس و ئەندازیاریشـە. لەتەمـەنی حەڤـدە ساڵییدا نامەیـەکی پێشکەش کرد بەناونیشانی " نامەیـەك دەربارەی پرەنسیپی بەرجەستە بوون" و بڕوانامـەی بەکالۆریۆسـی لەهونـەردا وەرگـرت. هـەروەها لـەماوەی نێـوان سـالآنی (1661 ـ 1666) دا یاسای خوێنـدووە, بـەلآم دواتـر خووی داوەتـە ماتماتیـك و میتافیزیـك. نوسراوەکانی زۆرن, پیاوێکی ئینسایکلۆپیدیایی زۆر چالاك بووە. دیـارترین و دواکتێبـی بریتیـە لـەمۆنادۆلۆجیا ـ 1710, کە تێیدا لە مەسەلەی عەدالەتی یەزدانیی دەکۆڵێتەوەو هەموو شتێك دەباتەوە بۆسەر زانین و ئارەزوو.





***ئێمە لە ڕووبەڕووبوونەوەماندا لەگەڵ ڕوخسارێکی تردا، ڕووبەڕووی "بێ کۆتایی" دەبینەوە. ڕوخسار نیشانەیەکە بۆ بێکۆتایی. کاتێ بەرپرسیاری بەرامبەر بە ڕوخسارێك دەنوێنین کە دەمانەوێ بیناسین" بێکۆتایی سەرهەڵدەدات. بە واتایەکی دی، کاتێ کەسێك بەرامبەر بە کەسێکی دی دەڵێت "من هەم" شایەتی بۆ بێکۆتایی دەدات. لە دروستی و ڕاستگۆیی ئەم شایەتیەدایە کە ئەو بێکۆتاییەی لە دەرەوەدایە، دەگۆڕێ بۆ بێکۆتاییەکی ناوەوەیی. بەڵام ئایا بەدەستهێنانی بێکۆتایی بۆ هەموو کەسێك وەکو یەکە؟ ئایا هەموو کەسێك دەتوانێت لە ڕەوتی کاری ئەخلاقیدا بێکۆتایی بەدەستبهێنێت؟**

ئاکار (ئەخلاق) حەقیقەتێکی هاوبەشی نێوان هەموو مرۆڤەکانە. هەموو کەسێك دەتوانێ ئەم ئەرکە ئاکاریە بە تەنها لەناو خودی خۆیدا بدۆزێتەوە. ئەم ئەرکە ئاکارییە قابیلی ئاڵوگۆڕە و بەر لە هەر شتێکیش بیرکردنەوەیە لە بوون لە پێناوی ئەوی دیکەدا لە ڕووداوێکی شیاوی پاکژیدا.

***بەڵام ئایا ئەم بەرپرسیارێتیە لە ڕوخساری هەموو کەسێکدا دەخوێنینەوە، تەنانەت لە ڕوخساری جەللادێکیشدا؟**

نابێ وشەی "ڕوخسار" بە مانایەکی سنووردار لێکبدەینەوە. دەبێ لەم ڕووەوە ورد بین. مەبەستی من لە "ڕوخسار" دەم و لووت و ڕەنگی چاو نییە. ڕوخسار دەلالەتی بێ تان و پۆیە. ڕوخسار مانایە لە دەرەوەی کەسێتی کەسێکدا. ڕوخسار ئیمکانێکە بۆ ئادەمیزاد تا لەو تەنهایی خۆیدا مانا بدۆزێتەوە. هەر ئەوێکی دیکە تەنها و تاقانەیە و لە تەنهاییەکەیدا جیاوازە لە جۆری ئادەمیزاد و فرەیی مرۆیی. هەرکاتێکیش من سەیری ئەو ڕوخسارەی ئەوی دیکە دەکەم، لێی بەرپرسیارم. ئەمەش هەمان ئەو سیستمی پاکژییەی بوون لە پێناوی ئەوی دیکەدایە. ئەگەر من جەخت لەسەر کەسێتی فلان یان فیسار کەس بکەم، هەموو شتێك لەم سیستەمەدا بەرەو باشی دەگۆڕێت.

پاکژی مومکینێك نییە، گەر بوونی خۆی بە هۆکار و ڕیشەی بوونی خۆی بزانێت. ئەمە ڕستەیەکی پاسکالم بیردێنێتەوە کە هەمیشە دەیڵێمەوە و کردوومە بەسەر لەوحەی کتێبی "بە جۆرێکی تری بوون یان لەودیو





ماهیەتـەوە"، ئـەویش ئەمەیـە: "جێـی مـن لەبەرهـەتاودا ئەوەیـە کـە سـەرەتاو وێنەی زەوتکردنی هەموو گۆی زەوی بم".

***بۆ کۆتایی هێنان بەم گفتوگۆیە، حەزدەکـەم دوا پرسـیارتان لیٚ بکـەم. کـاتێکی زۆرمان نەبوو تا سەبارەت بە خولیای ئێوە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر جولەکە قسەبکەین، بەڵام هەموان دەزانن کە ئێوە لەم بوارەدا، چ لە فەرەنسادا و چ لە دەرەوەی فەرەنساشدا، بـە ناچاری بوونەتە سەرچاوەیەکی ناسراو..**

پێشـتریش ئەمـەیان بـە من گوتـوە. بـەڵام بـە ڕاسـتی بیڵـێم، مـن کاری خـۆم لـە تازەکردنەوەی شوناسی جولەکەدا نابینمەوە. هەر لەبەرئەوەی من لە تۆژینەوە فەلسەفیەکانمدا ئایەتەکانی تەلمود[27] بە نموونە دەهێنمـەوە، ئیتر مـەرج نییـە من بە تازەکەرەوەی جوولەکەیی لە قەڵەم بدەن.

***وێڕای ئەمانەش، تۆ کتێبی پیرۆز زۆر دەخوێنیتەوە.**

من هەمیشە وتوومە کە ئەوروپا واتـە "کتێبی پیرۆز" و یۆنـان. نـاتوانین بـەبیٚ "کتێبـی پـیرۆز" لـە خۆرئـاوا بگـەین. "کتێبـی پـیرۆز" فێرمـان دەکـات کـە دراوسێکانمان وەکو خۆمان خۆش بوێت و تاکەکەس کاتیٚ دەستپێدەکات کە لەگەڵ ئەوی دیکەدا پەیوەندی پەیدا دەکات. لەبەر ئەمەیە کە "کتێبی پیرۆز" گرنگە.

***ئایا خۆتان بە بیرمەندێکی ئایینی دەزانن؟**

---

[27] **تەلموود** یەکێکە لەگرنگترین کتێبەکانی ئاینی جولەکە، کە دوای کتێبی پیرۆز تۆمارکراوە. تەلموود دەبێت بە دووبەشەوە: یەکەمیان پێی دوترێت میشنا, واتە دابونەریتەکان ( ئەمـەیان شـەریعەتێکی سـەرزارییە ) کە لـەنێوانی زاناکانی لێکۆڵینـەوەی ئایینەکـەدا, هـەتاکو سەدەی دووەمی دوای زایین باو بووە. ئەوی تریان پێی دەوترێت گەمارا, کە بریتیە لە ڕاڤەکردنی میشـنا. دوو کـۆپی لەتـەلموود لـەجیهانی کۆنـەوە بـۆ ئێمـە جێمـاوە, کـە بەشـی گـەماراکانیان جیـاوازی تێدایـە, بـەڵام میشـنا لەهەردوکیانـدا یەکێکـە. ئـەو دوو تـەلموودەش بـریتین لـە تەلموودەکـەی فەلەسـتین ( سـەدەی چوارەمی پـێش زایـین) , تەلموودەکـەی بابـل ( سـەدەی شەشەمی پێش زایین ) کە ئەمیان زیاتر جێی متمانەیە.





ئاین لە فەلسەفە ناچێت. پایەکانی ئاین لەسەر کۆمەڵێك حەقیقەت بەندن کە یەکجار و بۆ هەتاهەتایە دابەزیون. فەلسەفە وا نییە، کەسی فەیلەسووف بەپێی ئایین کارناکات، بەڵکو وەکو کەسێکی باوەڕدار کە کاری فەلسەفەش دەکات، کارە ئاینیەکانی ئەنجام دەدات. لەبەرئەمەشە کە من هەرگیز نەمویستوە نەریتی فەلسەفی خۆرئاوا لەگەڵ تەوراتدا بە یەك چاو تەماشا بکەم. هەرگیز لای من ڕووی نەداوە کە نەریتی هزری خۆرئاوایی مافی ژیانی نەبووبێت هەر لەبەرئەوەی کە من ئەزموونی تەوراتی بە ئەزموونی سەرەکیی مرۆڤایەتی دەزانم. ئەم دوو نەریتە، کە لە من و لە بیری مندا لەگەڵ یەکتردا گونجاون، بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونەکانم لە ژیاندا.

**حوزەیرانی** 1994

**سەرچاوە:**

**نقد عقل مدرن- رامین جهانبگلو- چاپ اول** 1376**- تهران**





**( ریچارد رۆرتی فەیلەسووفێکی هاوچەرخی ئەمریکاییە و بە فەیلەسووفی پۆستمۆدێرن ناسراوە, گەرچی خۆی نکووڵی لەوە دەکات. گرنگترین کتێبیشی "فەلسەفە و ئاوێنەی سروشت"ە, لەم گفتوگۆیەدا جگە لەوەی دەربارەی ژیانی خۆی دەدوێت, دەربارەی کۆمەڵێك مەسەلەی زیندووی ئەمڕۆش دەدوێت" لەوانە : پێکەوە ژیان, پلورالیزم, گفتوگۆ, بەجیهانیبوون -و- )**

***جەنابی پرۆفیسۆر, ئێوە لە 4ی ئۆکتۆبەری 1931دا لە نیویۆرك و لە ناو خێزانێکدا هاتوونەتە دونیاوە کە دژایەتیی ستالینیزمیان کردووە. ئایا ئەو ژینگە چەپڕەوەی خێزانەکەتان کاریگەریی لەسەر بڕیاری ئێوە بۆ خوێندنی فەلسەفە هەبووە؟**

لە راستیدا نەخێر. مەیلی من بۆ فەلسەفە دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەریی مامۆستاکانم لە زانکۆ. من ساڵی 1946 چووم بۆ زانکۆی شیکاگۆ. ئەو کات فەلسەفە بەشێکی گرنگ بوو و هەموو بوارەکانیشی دەگوترایەوە. ئەوسا فەلسەفە بەڕادەیەك گرنگیی هەبوو کە دەیانوت کەسێك ئەگەر فەلسەفە نەخوێنێت" نوقسانە. من بە پلەی ماجستێر زانکۆی شیکاگۆم تەواو کرد و بۆ بەدەستهێنانی پلەی دکتۆراش چووم بۆ زانکۆی ییل.

***پێم وایێت لە شوێنێکدا خوێندومەتەوە کە مامۆستای ئێوە لە زانکۆی شیکاگۆ "ڕۆدۆلف کارناپ" بووە. ئایا کارناپ رووی سەرەکی نەبوو لە ڕێنوێنیی ئێوە بۆ بواری فەلسەفەی زانست و ئەپیستمۆلۆژیا؟**

—لە راستیدا کارناپ[28] رۆڵی سەرەکی و کاریگەری هەبوو لە ئاشنابوونی مندا بە فەلسەفەی شیکاری. ئەوکات (لە کۆتایی چلەکان و سەرەتای شەستەکاندا) لە

---

[28] **کارناپ**, رۆدۆڵف Carnap, Rudolf (1891-1970) ناوێکی درەوشاوەی ئەو جوڵانەوە فەلسەفییەیە کە بە ناوی پۆزەتیڤیزمی لۆجیکیی یاخود ئەزمونگەرایی لەجیکییەوە ناسراوە. لە





ئـەمریکادا بـزاوت و تـەوژمێکی نـوێ (لـە فەلسـەفەی شـیکاریدا) فۆرمەلـە بووبـوو و کارنـاپیش تاقـە کەسـێك بـوو کـە لـە شـیکاگۆ ئـەو بەشـەی دەوتـەوە. قوتابیەکانیشـی هەموو لە ناوە دیارەکانی ئەم بزاوتە بوون کە ساڵانی دواتر لە فەلسـەفەی ئەمریکاییـدا گەشەی سەند.

***ئایا بە بۆچوونی ئێوە کارناپ لە ئەمریکاش هەر هەمان ڕوانگەی قوتابخانەی ڤیەننای هەبوو؟**

بەڵێ. ئـەو ئەنـدامی گروپێـك بیرمەنـد بـوو لـە بـەرلین کـە مایـەی ڕەزامەنـدیی ئەنـدامانی قوتابخانەی ڤیەننا بوون. لەو گروپەشدا روخسارێکی دیاربوو. نەوەیـەك لـە کۆچـەرانی ئەڵمانی هەبوون وەکو کارناپ, کە وردە وردە لە مەیدانی فەلسەفەی ئەمریکاییـدا بـوون بە روخساری دیار و بەناوبانگ.

***ئایا ئێوە لە ژێر کاریگەریی کارناپدا دەستتان بە خوێندنەوەی ڤیتگنشتاین کرد؟**

–مـن لەسـەر راسـپاردەی کارنـاپ دەسـتم بـە خوێندنـەوەی کتێبـی "تراکتـاتۆس" کـرد, بـەڵام ئـەو کاتـە لێـی تێنەدەگەیشـتم و چـەند سـاڵێك دواتـر کتێبـی "رامـانی فەلسـەفی"یـم خوێنـدەوە, کـە بـەبڕوای مـن کتێبێکـی زۆر گرنگـە و مـن لـە کـارە فەلسەفیەکانی خۆمدا زۆر سوودم لێبینیوە.

***فەلسەفەکەی ئێوە کاریگەریی "جۆن دیوی"یشی لەسەرە. کەی لەگـەڵ کارەکـانی ئـەودا ئاشنایتان پەیدا کرد؟**

---

18ی مایسدا لە رۆنسدرۆفی ئەڵمانیا لە دایك بووە, لە زانکۆی جێناو فرایبورگ خوێندوویـەتی, لە ماتماتیك و فیزیاو فەلسەفەدا پسپۆڕ بووە. دان بە کاریگەریی ماتماتیکزانی ئەڵمانی گۆتلیب فرێگ لەسەر ماتماتیك و بیرنارد رۆسێل و لۆدڤیگ وتینگستێین لەسەر فەلسەفە, دەنێت. کارناب ئەندامێکی کارای بازنەی ڤییەننا بووە, کە گروپێك بوو لە زاناو فەیلەسوفان. لە ساڵێ 1935 دا, لە دەستی نازییـەکان هـەڵاتووە بەرەو ئەمریکا و پەیوەندیی کردووە بە زانکۆی شیکاگۆوە. لە ساڵی 1954 دا پۆستێکی زانکۆی کالیفۆرنیا لە لۆس ئەنگلۆس پەسەند دەکات. لە رۆژی 14 ی ئەیلولـدا لـە سـانتا مۆنیکـای کالیفرۆنیـا دەمرێـت. کارنـاپ فەلسـەفەی وەك شـیکردنەوەیەکی لۆجیکییانە لەقەڵەم داوە. بایـەخی داوە بە شیکردنەوەی زمانی زانست, چونکە بەلای ئەوەوە گوزارشتی ئەزموونییانە تاکە شێوازی ماناداره. یەکەمین کاری بریتیـە لـە بونیـادی لۆجیکییانـەی جیهان ـ 1928. سینتاکسی لۆجیکییانەی زمان ـ 1934, سەرهەڵدانی لۆجیکییانەی شێمانە ـ 1950. هـەروەها بەشـدارییکردووە لـە دەرچـوونی گۆڤـاری ئێـرکێنتیس و ئینسـایکلۆپیدیای زانستە یەکگرتووەکان.





–وەختێ قوتابیی زانکۆ بووم "دیوی[29]"م دەخوێندەوە, ئەوکات هاوڕێیەکم هەبوو ناوی سیدنی هۆك[30] بوو دژ بە ستالینیزم بوو و قوتابیی "دیوی" بوو. من لە ڕێی "سیدنی هۆك"ەوە ئاشنایەتیم لەگەڵ هەندێ لە بیروباوەڕەکانی دیوی دا پەیداکرد. بەڵام زۆر حەزم پێی نەکرد. ئەم حاڵەتە وەکو خۆی مایەوە تا لە تەمەنی سی ساڵیدا سەرنجم دا کە بیروباوەڕەکانی جۆن دیوی چەند گرنگن.

***ئایا بەڕای ئێوە دیوی هیچ پێگەیەکی لە بیروباوەڕەکانی ئەمریکای ئێستادا هەیە؟**

بە بڕوای من دیوی هەروەکو مارکس تیۆرەی مێژووگەرایی هێگڵی وەرگرت. بەڵام ئەم بە پێچەوانەی مارکسەوە کە بیری لە گۆڕانکاری و شۆڕش دەکردەوە لە ناو کۆمەڵگادا, دیوی ریفۆرمخوازێك و سۆسیال دیموکرات بوو. ئەمڕۆکە, وای بۆ دەچم کە دیوی رۆڵێکی بەرچاوی لە ئەورووپای خۆرهەڵاتدا هەبێت, لەبەرئەوەی لەوێ فەیلەسووفەکان کەم تا زۆر بیروبۆچوونیان دەشوبهێتە سەر ئەو و درێژەی

---

[29] **دێوی**, جۆن, Dewey, John (1859-1952) سایکۆلۆجیست و فەیلەسوفێکی ئەمریکییە, لێکۆڵینەوەی لەسەر سیستمی پەروەردەیی لەچین و یابان و مەکسیك و تورکیاو یەکێتی سۆڤێت کردووە. خاوەنی تیورییەکی پەروەردەیی تایبەتییە کەبەناوی خۆیەوە ناسراوە, کەجەخت دەکاتە سەر گۆڕینی شێوازی فێرکردن لەشێوازێکی رەقوتەقی میکانیکییەوە, بۆ جۆرەها چالاکیی جیاجیا کەهەموویان بەمەبەستی فێرکردن و یاری کردنیش ئەنجام دەدرێن. هەروەها وەکو فەیلەسوفیش, جەختی کردۆتە سەر لێکۆڵینەوەی پراکتیکییانە بۆ پیشاندانی ئەوەی چۆن ئایدیا فەلسەفییەکان دەتوانن لەژیانی رۆژانەدا کاربکەن. کارە دیارەکانی بریتین لە: قوتابخانەو کۆمەڵگا ـ 1899, دیموکراسی و فێرکردن ـ 1916, بیناکردنەوەی فەلسەفە ـ 1920, گرفتەکانی پیاوان ـ 1946.

[30] **هۆك**, سیدنی Hook, Sidney (1902-1989) فەیلەسوف و رەخنەگرێکی کۆمەڵایەتی ئەمریکییە. قوتابی و بایۆگرافی نوسی جۆن دێوییەو پرۆفیسۆری زانکۆی نیو یۆرکە 1927 – 1972. چەند دەهەیەك سەرقاڵی کێشمەکێشی میللی بووە. لە ساڵی 1933 دا بەرەو تێگەیشتنی کارل مارکسی نوسیوە, لە سەرەتای سییەکانی سەدەی رابردوودا لە پارتی کۆمۆنیستەوە نزیك بووە, بەڵام دواتر هەڵگەڕاوەتەوەو بووە بە یەکێك لە سەرکردە رۆشنبیرەکانی چەپی دژە کۆمۆنیزم و لە نوسینەکانیدا داکۆکی لە ئازادیی و ئازادیی چالاکییە سیاسییەکان کردووە. کارە ناسراوەکانی تری: پاڵەوان لە مێژوودا ــ 1943, مارکس و مارکسییەکان ــ 1955, پارادۆکسی ئازادی ـ 1962, مانای تراجیدیاییانەی ژیان ـ 1974.





بیروبۆچوونەکانی مارکسن, بەڵام بە جەختکردنێکی زیاتر لەسەر ئاقاری سۆسیال دیموکراسی.

***ئێوە سەرەتا لە ساڵانی 1952 تا 1956دا لە ییل, پایاننامەکەی خۆتان سەبارەت بە "چەمکی توانا" نووسی, کەچی ئێستا لە بەشی ئەدەبی بەراوردکاری لە زانکۆی ستنفۆرد وانە دەڵێنەوە. ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە بەلای ئێوەوە ئەدەب لە فەلسەفە سەنجراکێشتر بووە؟**

نەخێر, راستییەکەی ئەوەیە کە زۆربەی بەشە فەلسەفیەکان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا, بە فەلسەفەی شیکارییەوە خەریکن و کەمتر بایەخ بە کارەکانی هیگل یا هایدیگەر دەدەن, بەم پێیە گەر تۆ بتەوێ سەبارەت بەمانە وانە بڵێیتەوە, وا ئاسانترە لە دەرەوەی بەشەکانی فەلسەفەدا ئەم کارە ئەنجام بدەیت.

***من دیسانەوە لە شوێنێکی تریشدا ئەوەم خوێندووەتەوە کە ئێوە وتوتانە ئەسەفبارن لەوەی مێژووناس نین!**

نەک ئەسەفبار, بەڵام وای بۆ ئەچم کە فەلسەفەی مێژووگەرای پاش هێگڵ, زۆر لە مێژووی فیکر نزیک بووەتەوە, بەجۆرێك کە جیاکردنەوەی جیاوازیەکانیان رۆژ دوای رۆژ دژوارتر دەبێت, من وا هەست ئەکەم لێرەدا کەسێکی وەکو بلومبێرگ دەیەوێت کە راستەوخۆ خۆی وەکو مێژووناسێك رابگەیەنێت" نەك وەکو فەیلەسووفێك.

***ئایا حەزتان دەکرد وەکو ئایزایا بێرلین مێژووی فیکرتان بخوێندایە؟**

بەڵێ, هەست دەکەم ئایزایا بێرلین[31] شتێکی راستی هەڵبژاردووە. ئەو خۆی لە کۆتی فەلسەفەی شیکاری رزگارکرد" کە لە سیەکان و چلەکاندا لە ئۆکسفۆرد باو بوو, بۆ ئەنجامدانی کاری سەرنجراکێشتریش روویکردە بواری مێژووی فیکر.

---

[31] **بێرلین**, سێر ئایزایا (1900-) Berlin, Sir Isaiah فەیلەسوف و مێژوونوسێکی بەریتانییە, لە لاتیڤیا, بەرلین لە دایك بووەو بە منداڵیی رەوی کردووە بۆ ئینگلتەرەو خوێندکارێکی دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆرد بووە. یەکەمین کتێبی بریتیە لە بایۆگرافیای کارل مارکس ـ 1939, لەماوەی نێوان ساڵانی 1937 – 1967 دا لە زانکۆی ئۆکسفۆرد وانەی وتۆتەوە, لەماوەی نێوان ساڵانی 1967 – 1975 دا سەرۆکی کۆلێجی والفسۆن بووە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد. دیارترین کاری بریتیە لە ژیژك و رێوی, وتارێکە دەربارەی تێروانینی تۆلیستۆی بۆ مێژوو ـ 1953, حەتمییەتی مێژوویی ـ 1955, هێرشێك بۆ سەر حەتمییەت و دوو چەمکی ئازادیی ـ 1958.





***چی وای لێکردیت بایەخ بە "پراگماتیزم" بدەیت؟**

بەڕای من پراگماتیزم[32] یەکێکە لە دەرکەوتەکانی دژایەتیکردنی فەلسەفەی ئەفلاتونی و دیکارتی. ویلیەم جەیمس[33] و نیچە، هەردووکیان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بەڕووی پێشگریمانەکانی فەلسەفەی ئەکادیمیی دیکارت و کانت دا وەستانەوە. پراگماتیزم لە ئەمریکادا زۆر قەرزاری نیچە و هەروەها ڤیتگنشتاین لە قۆناغی دووەمیدا و هایدگەرە لە قۆناغی یەکەمیدا. خاڵی هاوبەش لە نێوانیاندا ئەوەیە کە ئەوانیش ئەو فەیلەسووفە ناوبراوانەیان لاپەسەند نەبوو. ئەفلاتون و دیکارتیان پێقبووڵ نەبوو.

***ئایا لەو بڕوایەدا نین کە پراگماتیزم دیاردەیەکی ئەنگلۆ- ئەمریکاییە؟ هەروەکو دەزانن، پراگماتیزم لە نێو فەیلەسووفە ئەڵمانی و فەرەنسایەکاندا بڵاونەبۆوە.**

---

[32] **پراگماتیزم** Pragmatism جوڵانەوەیەکی فەلسەفییە، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەوە تا ئەمڕۆ، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر کەلتوری ئەمریکیی هەبووە. پراگماتیزم داوا دەکات ئایدیاو تیورییەکان بە کردەوە تاقی بکرێنەوە، لە ڕێگای خەملاندنی ئەوەی ئایا ڕەفتارکردن لەژێر سایەی ئەو ئایدیا یان تیورییەدا، ئەنجامی پەسەند یان ناپەسەندی لێدەکەوێتەوە. وشەی پراگما لە زمانی یۆنانیی دێریندا مانای ئەو شتانە دەگەیەنێت کە دەکرێن. بە پێی پراگماتیزم پێویستە هەموو دەربڕینەکان دەربارەی ڕاستیی، زانین، ئاکارێتی، هەروەها سیاسەتیش، بەم ڕێگایە تاقی بکرێنەوە. پراگاتیزم بە توندی ڕەخنەی لە نەریتەکانی فەلسەفەی خۆراوایی گرتووە، بە تایبەتی ئەو بیرۆکەیەی دەڵێت ڕاستیی ڕەها و بەهای ڕەها بوونیان هەیە. کەرچی بۆ ماوەیەك پراگماتیزم لە فەرەنساو ئینگلتەرەو ئیتالیاش جەماوەری هەبوو، بەڵام زۆرینەی چاودێران پێیان وایە زیاتر نەریتێکی ئەمریکییانەیە.

[33] **جەیمس**، ولیەم (1842-1910) James, William فەیلەسوفێکی ئەمریکای باکورە، لە نیویۆرك لە دایك بووەو لە نیوهەمپشایەر مردووە. براگەورەی هینری جەیمسی ڕۆماننوسە. خێزانەکەی ڕەوکردووەیەکی ئێرلەندیی بووەو لە ئەمریکا دەوڵەمەند بوون. منداڵیی بە گەڕان و سەفەری ئەوروپا بەسەر بردووە، لە زۆر وڵاتدا و لە زۆر قوتابخانە خوێندوویەتی تا سەرەنجام لە قوتابخانەی هارڤاردی پزیشکی دەوامی کردووە، پاشان وازی لەویش هێناوەو دوای زانای زانستە سروشتییەکان لویس ئاگاسیز کەوتووە و چوون بۆ حەوزی ئەمازۆن و دواتریش سەفەری کردووە بۆ ئەڵمانیا. لە ساڵی 1872 دا دەستی کردووە بە وانە وتنەوەو لەسەر ئەم پیشەیەیان بەردەوام بووە. لە کتێبەکانی: کورتەی سایکۆلۆجیا ــ 1891، ئیرادەی باوەڕ ــ 1897، وێنە جیاجیاکانی ئەزمونی ئاینیی ـ 1902، پراگماتیزم ـ 1907.





پراگماتیزم هەرگیز لە ئەوروپادا مایەی پەسەندکردن نەبووە. بەڕای من ئەوە جێی داخە, بەڵام لە وڵاتە ئینگلیزەکانیشدا برەوێکی وای نەبوو. ئەم قوتابخانەیە هەم لە بەریتانیادا تەواو فەرامۆش کراوەو هەم لە ئەڵمانیا و فەرەنساشدا لە ئەمریکاش, پاش دووەم جەنگی جیهانی بە تەواوی ئەفەرۆز کراو فەلسەفەی شیکاری جێی گرتەوە. بەم پێیە, ناتوانین پراگماتیزم بە بزووتنەوەیەك لە قەڵەم بدەین, بەڵکو بە تەنها ناوێکە بۆ هەندێ ڕوانینی فەلسەفیی دیاریکراو کە دەتوانین لە کارەکانی جۆن دیوی و ولیەم جەیمسدا بیدۆزینەوە, بەڵام ئەم ڕوانینانە لەلای هایدگەر و گەلێ کەسی تریش دەبینرێتەوە.

***ئایا تا ئێستا لە زانکۆکانی ئەمریکادا جۆن دیوی و ولیەم جیمز دەخوێندرێن؟**

زۆر نا.. هەندێ جار.

***ئایا ئێوە خۆتان بە فەیلەسووفێکی پۆستمۆدێرن دەزانن؟**

نەخێر, من هەرگیز نەمزانیوە وشەی پۆستمۆدێرن یەعنی چی. هەموو من بە پۆستمۆدێرن لە قەڵەم دەدەن, بەڵام لە ڕاستیدا من نازانم واتای ئەم زاراوەیە چییە.

***شتێکی زۆر سەیرە, ئێوە خۆتان بە پۆستمۆدێرن نازانن, بەڵام لە کار و نووسینەکانتاندا پشتیوانی لەو بۆچوونەی فرانسوا لیوتار دەکەن کە دەڵێت حیکایەتە فەلسەفیە گەورەکان کۆتاییان هاتووە و حیکایەتە بچووکەکان جێیان گرتوونەتەوە.**

ڕاست دەکەیت. من پشتیوانیم لەو بۆچوونەی لیوتار[34] کردووە, بەڵام هەستدەکەم بە هەڵەداچووم. وای بۆ دەچم کە ئەو بۆچوونە ڕاست نییە. لە ڕوانگەی منەوە, هەموو

---

[34] **لیوتار, جان فرانسوا** Jean Francios Lyotard (1924 ـ ) فەیلەسوفێکی فەرەنسییە, دیارترین کتێبەکانی بریتین لە"گوتارو شکڵ ـ 1973", "ئابوریی شەبەقی ـ 1974", داینەمۆکانی دۆشان ـ 1977, دابو دەستورە وەسەنییەکان ـ 1977, مەرجی پۆست مۆدێرنیزم ـ 1979.. هەروەها چەندان لێکۆڵینەوەشی لە بوارەکانی هونەر و وێنەکێشاندا هەیە, بە بڕوای ئەو هونەر شێوازێکە لە شێوازەکانی وێرانکاریی, هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئیستاتیکا لە لای لیوتار لەسەر بنەمای ئابورییەکی شەبەقیانە دامەزراوە. لە ساڵی 1954 بە دواوە بووە بە مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی پاریسی هەشتەم. لە نێوان ساڵانی 1950 ـ 60 بەشێوازێکی مارکسییانە بیری دەکردەوەو پێوەست بوو بە پارتی کۆمۆنیستەوە, بەڵام لە ساڵی





ئـەو كارانـەی كـە ليوتـار ئەنجاميـداون" قووڵبوونـەوەو تێفكرينـە لـە "حيكايـەتی گەورە"ی ئەويدی و كتێبە بەناوبانگەكەشی كە ناونيشانی "دۆخی پۆستمۆدێرن"ە, خـۆی جۆرێكـە لـە حيكايـەتی گـەورە, بـەم پێيـە, مـن لـەو بڕوايـەدام كـە هەميشـە حيكايەتی گەورەمان دەبێت. ئێمە ناتوانين لەو حيكايەتانە جيابينەوە.

***كەواتە ئێوە, وەكو هەندێكی دی, جياوازی لە نێوان مۆدێرنيتە و پۆستمۆدێرندا ناكەن؟**

من تێناگـەم چۆن كەسانێك جياوازیەكی لـەمجۆرە دەكـەن. كەسانێك هـەن بـە جۆرێك دەدوێـن وەك ئـەوەی بتـوانرێ ئـەم جياوازيانـە لـە نـاو چيرۆك و هونـەر و فەلسـەفە و سياسەتيشدا بكرێ. بەڵام من لە چيرۆكی جياوازی نێو ئەم هەموو بوارانە تێناگـەم" كـە لە لێكۆڵينەوەكانی پۆستمۆدێرنەكاندا ئەنجامدەدرێن.

***ئايا بەلای ئێوەوە پۆستمۆدێرن لە هونەر و ساختومانسازيدا مانای هەيە؟**

لـە ساختومانسـازيدا بـەڵێ. ئێـوە دەتـوانن فێـری ئـەوەبن چـۆن سـاختومانە پۆسـتمۆدێرنەكان جيابكەنـەوە. دەكـرێ ئـەم زاراوەيـە لـە ساختومانسـازيدا بـەكاربهێنرێ. بـەڵام راسـتيەكەی ئەوەيـە كـە مـن لـەوە تێناگـەم كـە چـۆن چيرۆكێكی پۆستمۆدێرن دەنووسرێ, يان چۆن دەبمە خاوەنی ڕوانينـی فەلسـەفييانەی وەها كـە ئەوانی دی من بـە فەيلەسووفێكی پۆستمۆدێرن بزانن. روانينـە فەلسـەفيەكانی مـن لـە سـاڵی 1900يشـدا لـە ئـارادا بـوون. ئـيتر ئەگـەر كـۆن بـن" كەواتـە پۆسـتمۆدێرنەكان وشەيەكی ناڕاستيان بۆ هەڵبژاردووە.

***كەواتە ئەگەر ئێوە بتانەوێ بە وشەيەك ناو لە خۆتان بنێن, چی دەڵێن؟**

خۆم بە پراگماتيست لە قەڵەم دەدەم.

***وا بزانم ئێوە لەو بيرمەندانەن كە ئەگەر بزانن فەلسەفە كۆتايی هاتووە, كێشەيەكی واتـان نايێـت. مەبەستم لەوەيە كە ئێوە لەو بيرمەندانەن كە ترستان لەو بڕوايەی نيچە نييە كە حەقيقەت نەماوە.**

هەموو ئەوەی كە وای لە نيچە دەكرد رافزی بێت ئەو بيرۆكەيەيە كە راسـتی (واقعيـەت) گەوهەر و ماهيەتێكی ناوەكی و خوديی هەيە و حەقيقەت دەركەوتـەی ئـەو ماهيەتەيە.

---

1980 بەدواوە باوەڕی بە ماركسيزم نامێنێت و بە بيركردنەوەيەكی تۆتاڵيتارييانە لە قەڵەمی دەدات.





بەلای منەوە ئەم روانینە نیچەییە مایەی قبووڵکردنە و ئا ئێستاش هێشتا ئێمە فەلسەفەمان هەیە. لەبەرئەوەی فەلسەفە لە پێناوی کۆکردنەوەی بەشە جیاوازەکانی کەلتووردا هەوڵ ئەدات و تا ئەو دەمەی پێویستمان بە گۆڕانی کەلتووری بێت" خەڵك پێویستیان بەوە دەبێت کە کۆن و نوێ لەگەڵ یەکدا بگونجێنن. مەبەستم لەوەیە کە دەبێ لە پاڵ شێوە نوێیەکانی گوتاردا" شێوە کۆنەکانیشیان هەبێت. بەم پێیە" هەمیشە فەلسەفە دەبێت, تەنانەت ئەگەر هەمووش لەگەڵ دروشمەکەی نیچەدا بن کە حەقیقەت نەماوە.

***بەڵام من بڕوام وایە کە چیدی "ئەقڵی نەمر - یان ئەزەلی-" مانایەکی بەجێ و جیهانی نییە.**

بەڵێ, من لەو بڕوایەدام کە هێگڵ (وەکو هزری یۆنانی کۆن) راستی دەگوت کە ئێمە سەبارەت بە یەك شت نادوێین و یەك کێشە چارەسەر ناکەین. بەڵام دەبێ ئەوە بڵێین کە ئێمە لە دونیایەکی جیاوازتر لە دونیای ئەواندا دەژین و نەوەکانی دوای ئێمەش لە دونیای جیاوازتردا دەژین. من وایدەبینم کە هێگڵ ڕاست بووە لەوەدا کە وتویەتی "فەلسەفە کاتێك خۆیەتی کە لە فیکردا بەرجەستە بێت". کەواتە دەبێ لە هەر قۆناغێکی کەلتووریدا تازە بێتەوەو بەم پێیەش نەمر نابێت.

***بە بڕوای ئێوە بە چ شێوازێك لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا گفتوگۆی فەلسەفی بەرقەرار دەبێت؟ ئایا ئێوە هیچتان سەبارەت بە فەلسەفەی خۆرهەڵات خوێندۆتەوە؟ فەلسەفەی خۆرهەڵات چۆن دەبینن؟**

لە راستیدا من زۆر کەم دەربارەی فەلسەفەی خۆرهەڵات دەزانم. من وا هەستدەکەم کە فەلسەفەی خۆرئاوا دیاردەیەکی تەواو لۆکاڵ و سنووردار بووە کە لە ململانێی نێوان زانستە تازەکانی فیزیا و نەریتە ئایینیەکانەوە سەریهەڵداوە. ئێوە ئەگەر لە وڵاتێکدا بن کە ئەم ململانێیەی بەخۆیەوە نەدیبێت, یان تازە تاقی بکاتەوە, لەم حاڵەتەدا ئەوەی بەناوی فەلسەفەوە لە وڵاتەکەی ئێوەدا دێتە ئاراوە" تەواو جیاوازە لەوەی خۆرئاوا.





***ئەوەی کە لەسەد ساڵی رابردوودا ڕوویداوە ئەوەیە کە فەیلەسووفانی خۆرهەڵات لە بیروباوەڕە نوێیەکانی خۆرئاوایان کۆڵیوەتەوەو دەیانەوێ خۆیانی لێ نزیك بکەنەوە و لێی تێبگەن. بەڵام فەیلەسووفانی خۆرئاوا کەمتر بایەخیان بە گوتارە فەلسەفیەکانی خۆرهەڵات داوە.**

وابزانم فەیلەسووفانی خۆرهەڵات بەشێکی زۆری کارەکەیان بۆ سازدانی گفتوگۆی خۆرهەڵات و خۆرئاوا ئەنجامداوە. لەبەرئەوەی ئەوانە کەسانێکن کە مێژووی فیکریی ئەوروپایان خوێندۆتەوەو لێی فێربوون. لە کاتێکا, بەلای فەیلەسووفانی خۆرئاواوە زۆر زەحمەتە سەبارەت بە مێژووی فیکر لە چین و هیندستان یان ئێراندا بخوێننەوەو شت فێربن.

***بۆچی؟ ئایا لەبەرئەوەی ئەوانە خۆیان بە سەنتەر دەزانن و شەیدای ئەوروپان؟**

بەڵێ. خۆیان بە سەنتەر دەزانن. خۆرئاواییەکان هەمیشە بە پیاچوونەوەی قۆناغێکی فیکری قەڵس دەبن. بەمپێیە, ئەوان بە ناچاری وایدەبینن کە هەموو ئەو شتانەی خۆرهەڵات, کاتی خۆی ئەوروپا لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدەدا پیایاندا تێپەڕیوە. بێگومان ئەمە تێڕوانینێکی تەسکبینانەیە و ڕزگار بوون لە داوی هەروا ئاسان نییە.

***ئەمڕۆ لە خۆرهەڵاتدا و بەتایبەتیش لە وڵاتانێکی وەکو هیندستان و ئێراندا زۆر گفتوگۆ لەسەر "مۆدێرنیتە" دەکرێ. لەم ڕووەشەوە ڕۆشنبیرەکانمان سەرگەرمی خوێندنەوە و توێژینەوەی ئەو کارانەن کە لە خۆرئاوادا بڵاودەکرێنەوە, کاری کەسانی وەکو ئێوەو هابرماس و دێریدا و فۆکۆ و ئایزایا بێرلین و ئەوانی دی. من حەزدەکەم بزانم تێڕوانینی ئێوە بۆ چەمکی مۆدێرنیتە چییە. پێگەتان لەم بوارەدا چییە؟ لەبەرئەوەی هەروەکو خۆشتان دەزانن, هابرماس و فەیلەسووفە کانتییە نوێیەکان, مۆدێرنیتە بە پرۆژەیەکی تەواونەکراو دەزانن و لەم بوارەشدا دەگەڕێنەوە بۆ تێزی ڕۆشنگەری و هەوڵئەدەن بنەمای تیۆرەیی گونجاو بۆ ڕوانینە فەلسەفی و سیاسیەکانی خۆیان بدۆزنەوە.**

من لە بنەڕەتدا لەگەڵ هابرماسدام[35], واتە لە شێوازی خستنەڕووی مەسەلە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکاندا, بەڵام بیرۆکەی دۆزینەوەی "بنەمای فەلسەفی" بۆ

---

[35] **هابرماس, یۆرگین** Habermas, Jürgen (1929- ), فەیلەسوفێکی ئەڵمانییە, تیوریستێکی کۆمەڵایەتییشە, یەکێکە لە رابەرەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت Frankfurt School . ئەو





بونیادە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان, لای من جیاوازە لە بۆچوونی هابرماس. بەڵام لە بنەڕەتدا من لەگەڵ ئەوەدام کە پرۆژەی خۆرئاوا بۆ ڕۆشنگەری دەگەڕێتەوەو ئەم تێزەش تەواو نەکراوە.

***ئەم تێڕوانینەی ئێوە سەرنجی من بۆ کتێبەکەتان "فەلسەفە و ئاوێنەی گەوهەر" رادەکێشێت کە ریچارد بیرنشتاین بە "یەکێك لە گرنگترین و ئارگیومێنت وروژێنترین ئەو کتێبانەی کە لەم چەند دەیەی دواییدا لەلایەن فەیلەسووفێکی ئەمریکاییەوە بەچاپ گەیەنراوە" ناوی دەبات. ئێوە لەم کتێبەدا هەوڵتان داوە ئەوە بخەنە ڕوو کە ئەو بەهەڵەدا چوونە تەوەرەییانەی کە لە فەلسەفەی شیکاریی سیستماتیزەکراودا دەیبینینەوە, لە هەمان نەریتی باوی دیکارتی و کانتییەوە سەرچاوە دەگرێت, واتە بڕواهێنان بەوەی ئەپیستمۆلۆژیا باڵاترە, بەوەی تەقەللایەکە بۆ ڕەوایەتیدان بە خودی رامانی فەلسەفی. ئایا ئێوە لێرەدا دەتانەوێ بڵێن کە لافی فەیلەسووفەکان بەوەی بونیادەکانی ئێمە دەخولقێنن, لافێکی بێ بنەمایە؟**

بەڵێ. من لەو بڕوایەدام کە پێویستە فەیلەسووفەکان واز لەو پرسیارە بێنن کە بونیادەکانی ئەمە یان ئەوە چین و لەبری ئەوە بیر لەوە بکەنەوە کە چۆن دەتوانین ئەم یان ئەو بزاوتە, یان ئەم یا ئەو بەشە لە کەلتوور پێکەوە بگونجێنین. بە بڕوای من دەبێ فەیلەسووفەکان زیاتر وەکو گونجێنەرێك لە خۆیان بڕوانن, نەك بەدوای بونیاد و بوارەکاندا بگەڕێن.

***کەواتە ئەگەر پەیبردن و تێگەیشتن لەسەر بنچینەی جۆری بونیادی بابەتیی زەین نەبێت, لەبەرئەوەی کە ئێمە جیهان لە دەلاقەی نموونە (پارادایم)ی جۆراوجۆرەوە لێك دەدەینەوە" لەم حاڵەتەدا ئێمە چۆن زەمینە بۆ کردارە ئاکاری و سیاسیەکانی خۆمان بدۆزینەوە؟**

---

قوتابخانەیە تایبەت بووە بە پەرەپێدانی بیرو پەیمانگایەك بووە بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی, لە شاری فرانکفۆرتی ئەڵمانیا لەساڵی 1923دا دامەزرێنراوەو شێوازێکی لێکۆڵینەوەی پێشکەشکردووە کە بە تیوریی رەخنەیی ناسراوە. هابرماز ماوەیەکی کورت وەکو یاریدەدەری تیۆدۆر ئادۆرنۆ کاری کردووە, لەپەیمانگای لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان. بەڵام لەساڵی 1983 ـ 1994 لەزانکۆی فرانکفۆرتدا دەرسی وتۆتەوە تا خانەنشین کراوە. نوسینە سەرەکییەکانی بریتین لە: تیوریی و پراکسیس ـ 1963, زانین و سودی مرۆڤ ـ 1971, گوتاری فەلسەفی مۆدرێنیزم ـ 1985.





زۆر باشە, هەر کەلتوورێك بۆ وەڵامدانەوەی کردار و بیروباوەڕەکان, نموونەی پاساودەرەوەی خۆی هەیە. کەلتوورەکان لە رووی دۆزینەوەی پاساوهێنانەوەی بەجێ, لە یەکدی جیاوازن. بەرەنجامی کەلتووری لە راستیدا بریتییە لە دۆزینەوەی چەند رێگایەك کە بە هۆیانەوە بتوانرێ کۆمەڵێك لەم پاساوانە ئاوێتە و چوونیەك بکرێن و بێگومان ئەم کارەش هیچ پەیوەندییەکی بە دۆزینەوەی زەمینەی نوێ و یان دۆزینەوەی زەمینەی راستەقینە نییە بۆ مەعریفە و کردارەکان. بەڵکو تەواو پەیوەندیی بە گونجاندن و پاساودانی نموونەیەکی رەفتاری مرۆییەوە هەیە بە نموونەیەکی تری رەفتاری مرۆیی. نەریتی فەلسەفی لە سەدەی هەڤدە بەملاوە وتویەتی کە هەندێ لە بەشەکانی کەلتوور بەرز و باڵان. بۆ نموونە زانستە سروشتیەکان بەرز و باڵان, یان هەروەکو کانت دەڵێت "هوشیاریی گشتیی ئاکاری" بەرز و باڵایە و ئێمەی فەیلەسووفانیش دەبێ روونی بکەینەوە کە بەرز و باڵایە, لەبەرئەوەی ڕەگوڕیشەی لە بونیادی زەین یان بونیادی راستی (واقعیەت)دا هەیە. بەڵام لە روانگەی پراگماتیستییەوە" ئەمانە بەرز و باڵا نین. هیچ کام لەم گوتارانە یان بوارە کەلتووریانە ئیمتیاز و ئاوارتەییەکیان نییە, بەڵکو جووتکردنیان لەگەڵ بەشەکانی تری کەلتووردا دژوارە.

***لەم حاڵەتەدا, چۆن دەتوانین قسە لەسەر چەمکی "جیهانی" بکەین؟ ئایا چەمکی جیهانی, چەمکێکی بێمانای میتافیزیکییە؟**

چەمکی جیهانی, دەبێ بە مانای شتێك بێت کە قابیلی بەدەستهێنان بێت. بۆ نموونە, کاتێ تۆ دەڵێیت ئێمە پێویستمان بە "کۆمەڵگایەکی جیهانی" یان "ژیارێکی جیهانی" یان "یاسا و رێسایەکی جیهانییە بۆ مافی مرۆڤ", باسی هەندێ شت دەکەیت کە قابیلی وەدەستهێنانن. بەڵام چەمکی "جیهانی" لە قاڵبە ئایدیالی و کۆمەڵایەتییە داواکراوەکەیدا, کە وەکو سیفەتێك بۆ ئاسۆکان یان ڕوانگە تایبەتیەکان پێناسە دەکرێ" بەلای منەوە بیرکردنەوەیەکی چەوتە.





***من لەسەر ئەم مەسەلەیە پێدادەگرم. لەبەرئـەوەی ئێـوە دەزانـن کـە خـەڵکانی خۆرهـەڵات بـە گوێرەی هەندێ نەریتی ئایینی (ناسکولار) دەژین. بەم پێیە پرسیاری لە جـۆری "ئایـا مەعریفـەی ئایینی" هەیە" هێشتا بەلای زۆر لەو خەڵکانەوە پرسیارێکی بەجێیە.**

بـە بۆچـوونی مـن ئـەم پرسـیارە نادروسـتە, مەبەسـتم ئـەو پرسـیارەیە کـە "ئایـا ئەمـە مەعریفەیە؟" پرسیارێکی سـوودبەخش نییـە و هـیچ یارمەتیـەکمان نـادات. بیروبـاوەڕی وا هەیە کە کەلتورێك بە پاساودراوی دەزانـێ و خـۆی دەبێتـە بەڵگـە و بیـانووی خـۆی. لە کاتێکا دەشێ لە فەرهەنگی تردا پاساو دراو نەبن و خۆیان بەڵگە و بیـانووی خۆیـان نەبن. پرسیاری سوودبەخش ئەوەیـە کـە "ئـەم کەلتوورانـە چۆن دەتـوانن لەگـەل یەکدا بگونجێن؟" مەسەلەکە ئەوەیە کە "کامیان ناتەبایە؟".

***کەواتە دیسانەوە دەگەڕێینەوە سەر مەسەلەی گفتوگۆ, ئەگەر هەریەك لەم کەلتوورانـە بیروبـاوەڕی جیاوازی خۆی هەبێت و لای خۆی بەجۆرێك پاساودراو بێت کـە کـەلتوورەکانی دی نـەزانن, ئـەی چۆن گفتوگۆ لە نێوان ئەم کەلتوورانەدا دادەمەزرێ؟**

لەو کۆمەڵگایانەدا کە نەریتی پلورالیزمی ئایینیان تیادایە و کاسـۆلیکەکان و جوولـەکە و پرۆتسـتانت[36] و موسـڵمان هـەموو پێکـەوە لـە هەلومـەرجێکی ئاشـتیانەو عادیلانـەدا دەژین" پرسیاری وا بەلایانـەوە لـە گـۆڕێ نییـە کـە "کامیـان مەعریفـەیان هەیـە", بەڵکو زیاتر ئەو مەسەلە کۆمەڵایەتییە لە ئارادایە کە "چۆن دەتوانین پێکـەوە بژین" و بـەڕای مـن ئـەم پرسـیارە ڕێگایـەکی راسـتە بـۆ فۆرمەلـە کردنـی مەسـەلەی پلـورالیزم لـەم کۆمەڵگایانەدا. بەم پێیە, ئەگەر کەسێك بڵێت "مەعریفـە لای ئێمەیـە و لای ئێـوە نییـە" و فەیلەسووفانیش بپرسن "ئایا بە راستی ئەوە مەعریفەیە؟", ئـەم شـێوە گفتوگۆیـە بـە بۆچـوونی مـن بـە ڕێگایەکـدا دەڕوات کـە لـە روانگـەی فەلسـەفییەوە سـوودی بۆمـان نابێت.

---

[36] **پرۆتستانتیزم** ,Protestantism یەکێکە لـە سـێ لقە سـەرەکییەکەی ئـاینی مەسـیحی, کـە دوانەکـەی تـر کاسـۆلیك و ئارسۆدۆکسـن. پرۆتسـتانتیزم لەسـەدەی شـازدەیەمدا, وەکـو جولانەوەیەکی ریفۆرمکار لەناو کەنیسەی خۆراواییدا, دەستی پێکردووە. مەبەستی سەرەکیشی بریتی بوو لەژیاندنەوەی دابونەریتە رەسەنەکانی مەسیحییەت.





***فەلسەفەی وا هەیە کە هەر باوەڕیشیان بە بوونی مەعریفە نییە.**

بەڕای من ئەمە زۆر لە باسەکەی ئێمەوە دوورە. هاوکاریی کۆمەڵایەتی لە نێوان خەڵکدا پەیوەندیی بە بوونی بیروباوەڕی هاوبەش و قبووڵکردنی پاساو و ڕێگەچارەی هاوبەشی ئەم بیروباوەڕانەوە هەیە. ئێمە پێویستە لەگەڵ یەکتردا گفتوگۆ بکەین. ئەبێ پاساو بۆ یەکتر بهێنینەوە و یەکتر قەناعەت پێبکەین. بەڵام ئەم پاساو هێنانەوەیە بۆ کرداری بیروباوەڕەکان لە لایەن مرۆڤەکانەوە" جیاوازە لە نەریتی فەلسەفیانەی "گەڕان بە دوای حەقیقەت" و یان "بەدوای مەعریفەدا وێڵبوون". ئەویان بابەتێکە لە بواری گەیشتن بە تەباییەکی گشتیدا, لە پێناوی بەختەوەریدا لە کۆمەڵگادا.

***ئێوە خۆتان بە بۆرژوا – لیبراڵێکی ڕۆمانتیک دەزانن و باوەڕتان بە عەدالەتی کۆمەڵایەتی و ئازادی هاووڵاتیان هەیە و چەمکی سەرەکیش لە فەلسەفە کۆمەڵایەتیەکەی ئێوەدا چەمکی "پێکەوەبوون"ە. کاتێک دەڵێن "پێکەوەبوون" لە خۆیەوە دروست نابێت و لە ڕێی تەجەللاوە کەشف نابێت" بەڵکو دروست دەکرێ, ئایا مەبەستتان لەوەیە کە لەو شتەدا لەگەڵ سارتەردا یەکدەگرنەوە کە دەڵێت "مرۆڤ چ نییە ئەو شتە نەبێت کە خۆی دروستی دەکات"؟.**

سارتەر جەلاییکارییەکی زۆری ئەم بیرۆکەیەی کردووە. بەڵام کرۆکی ئەو شتەی کە ویستوویەتی بیڵێت" ڕاستە. ئەفلاتوون و ڕێبازە ئایینیەکان دەڵێن کە ڕێگای پێکەوە بەستنەوەی ئادەمیزادەکان ئەوەیە کە بزانین خاڵی هاوبەش لە نێوانیاندا چییە. ئەو ڕێگایەش, یان ئەقڵانیەتە و یان ئەو ڕاستییەی کە هەموو ئەو ئادەمیزادانە مەخلوقی یەک ئافریدگارن. ڕێگای سارتەریش لەم میانەدا, واتە پێکەوە بەستنەوەی ئادەمیزادەکان, دۆزینەوەی ئەو لایەنانەیە کە قابیلی قبووڵکردنن لە نێوانیاندا و ئەفەرۆزکردنی ئەو کێشانەش کە لە سەرەتادا لەگەڵ یەکدا هەیانبووە.

***ئایا ئێوە باوەڕتان بە چەمکی "کەلەپووری هاوبەش" هەیە؟ ئایا ئەم چەمکە دەتوانێت سوود بەو شتە بگەیەنێت کە تۆ ناوت ناوە "پێکەوەبوون"؟**

تەواو وایە. بۆ ئەوروپاییەکان وا ئاسانترە کە لەگەڵ ئەوروپاییەکانی تردا گفتوگۆ بکەن, لەبەرئەوەی خاڵی هاوبەشی پێشینەی وایان هەیە کە دەکرێ پشتی پێ





ببەستن و سوودی لێوەربگرن. لێکدانەوە پرۆتستانتی و کاسۆلیکیەکانیش بۆ دەقە پیرۆزەکان بۆ ئەم شتانە دەگەڕێنەوە. بەم پێیە, ئەمانە بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ یەکتردا پەنا دەبەنەوە بەر کۆمەڵێك خاڵی هاوبەشی پێشوویان. بەڵام بەلای ئەوروپاییەکانەوە گفتوگۆ لەگەڵ چینییەکان یان هندییەکاندا دژوارترە لە گفتوگۆ لەگەڵ ئەوروپاییەکانی تر و یان ئەمریکاییەکاندا.

***ئایا دەکرێ هونەر, ئەدەب و فەلسەفە" وەکو نیشانە و توخمی کەلەپووری هاوبەشی مرۆڤایەتی لەقەڵەم بدەین؟ من لەو بڕوایەدام کە موزارت ئەڵمانییەکی پەتی نییە, هەروەها ڤان گوگ, بە تەنها هۆڵەندی نییە, هەرچۆن جەلالەدینی ڕۆمیش بە تەنها موڵکی ئێرانیەکان نییە. ئەمانە وەکو بەشێك لە کەلتووری مرۆڤ" سەر بە هەموو مرۆڤەکانن.**

من بەو جۆرە بیرناکەمەوە. بە بۆچوونی من ئەمانە لە ڕووی کەلتورییەوە بە یەکترەوە بەستراونەتەوە. لەو بڕوایەدام پێداگرتن لەسەر ئەوەی شتێکی هاوبەش لە نێوان هەموو مرۆڤەکاندا بدۆزینەوە, ئەنجامەکەی نائۆمێدی دەبێت. لە کەلتووری چینیەکاندا کۆمەڵێك ڕەگەزی بێشومار هەیە کە من هەر نازانم چین و ناشزانم چۆن فێریان بم و کاریان پێبکەم. با نموونەیەکت بۆ بهێنمەوە. من کونفۆشیۆسم خوێندۆتەوە, بەڵام نازانم چۆن کەسێك دەتوانێ بیخوێنێتەوە و پەیڕەوی لێ بکات. هەڵبەت دەکرێ شتی وای تیا بدۆزینەوە کە بە بەشێك لە کەلەپووری هاوبەشی ئادەمیزادی لە قەڵەم بدەین. بەڵام ئەم ئاراستەیە بە هیچ کلۆجێك ئاسان نییە.

***فەیلەسووفی ئەڵمانی هانز یۆناس بەردەوام بەرپرسیارێتی بە هەڵوێستێکی ئاکاری زانیوە لە ئاست مەسەلە تێکشکاو و لاوازەکاندا. بۆ نموونە زەوی, کە ئێستا لە بەردەم ئەم هەموو لەوتان و تاقیکردنەوە ئەتۆمیانەدا بێدەسەڵات و تێکشکاوە.**

**لە ئێستاشدا ئێمە لەبەردەم کەلەپوورێکی مرۆیی لاوازکراوداین کە پێویستی بە پشتیوانی و پاراستنە. بۆ نموونە شارگەلێکی وەکو فلۆرەنسا و ئیسفەهان و ڤینیسیا, یان کارە هونەرییەکانی مایکل ئەنجیلۆ" وەکو "پیتا" و "داڤید".**

بەڕای من تێکشکانی کاری هونەری شتێکەو تێکشکانی کەلتووریش شتێکی تر. لە ڕاستیدا کەس نازانێ کە کەلتووری ژیارێکی ئاشتیخواز و جیهانی لە حوکمڕانیەکی





فیدراڵدا چۆن دەبێت. بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەم کەلتوورە گەلێ لە توخمەکانی خۆی لەدەست دەدات.

تۆش ناچار نیت لە ئایندەدا بەرپرسیارێتیی پاراستنی قەوارەیەکی زۆری توخمە کەلتوورییەکان لە ئەستۆ بگریت, کەواتە گەلێ لە کارە هونەرییەکان و گەلێ کتێبیشت لەدەست دەچێت. ئەمانە وازیان لێدەهێنرێ و ئەمەش نرخێکە کە دەبێ لە پێناوی ئاشتی جیهانیدا بیدەین.

***پێدەچێت ئێوە سەبارەت بە ئایندەی مرۆڤ زۆر بەدبین بن؟**

زۆر چاکە. هەڵبەتە من ناڵێم کە لەوانەیە هەموومان لە کارەساتێکی ئەتۆمیدا بمرین. بەڵام لە لایەکی ترەوە وا بیردەکەمەوە کە حکومەتێکی جیهانی تاقە ئومێدێکە کە لەبەردەم مرۆڤایەتیدایە.

***بۆ ئەم تاقە ئومێدەش, دەبێ گەلێ کەلتوور و زمان و نەریت لەناوبچن, پێدەچێت تا ئێستاش هەروا بووبێت.**

بەڵێ, گەلێ ژیاری کۆن هەبوون کە ئێستا نیشانەیەکیشیان لێ نەماوەتەوە. گەلێ لە کەلتوورەکانی ئەفریقا بەبێ هیچ ئاسەوارێك فەوتان و تیاچوون. تا هەزار ساڵی دی, گەلێ لەو کەلتوورانەی کە ئێستا دەیانناسین, لەنێودەچن و ئاسەواریان نامێنێت.

***بەڵام چۆن دەکرێ هەم باوەڕمان بە پلورالیزمی کەلتووری هەبێت و هەم لەو راستییەش بەئاگابین کە گەلێ لەم کەلتوورانە مەحکومن بە فەوتان؟**

پلورالیزم تەنها بە مانای "پێکەوە بوون لەگەڵ خەڵکانێکدا کە دەبێ لەگەڵیاندا بیت" نەك بەو مانایەی کە "لەگەڵ هەر کەسێکدا و لە هەر شوێنێکدابیت". تۆ ناتوانیت لەگەڵ هیتلەر و ستالیندا بیت. ئاشڤایتس و گولاگ شوێنی پێکەوەبوون نین, بەڵکو دەبێ بۆ لەناوبردنی ئەوانە خەبات بکەیت.

***من وایدەبینم کە جیهانی ڕوو لە بەجیهانیبوونی ئێمە لە ڕووی ئابووری و سیاسییەوە لە ژێر کۆنترۆڵی خۆرئاوادایە و ئەم پرۆسەی بەجیهانیبوونەش بەجۆرێك لە جۆران راپێچکردنی جیهانە بەرەو یەکتەرزییەکی لەبابەت ماکدۆناڵدو مایکرۆسۆفت و کۆکاکۆلا و گەلێ نیشانەی تری خۆرئاوا.**





منیش دەڵێم کە تۆ تەواو راست دەکەیت, بەڵام بەڕای من یەکتەرزیی کەلتوری نرخێکە دەبێ بیدەین" ئەگەر بمانەوێ خۆمان لە کارەساتێکی ئەتۆمیدا نەفەوتێنین. ئەمە شتێکە مایەی شەرمە" بەڵام لە راستیدا من نازانم دەبێ چی بکەین. لەوانەیە سەد ساڵی تر هەموومان لە جیاتی کۆکا کۆلا" چا بخۆینەوە, لەبەرئەوەی ئەوکات چین دەبێتە دەسەڵاتی ئابووریی باڵادەست لە جیهاندا. کەلتووری ئەمریکایش لەناودەچێت. هەڵبەت من ئەم مەسەلەیەم بەلاوە گرنگ نییە. بەلای منەوە ئاشتی گرنگترە لەوەی بزانین کام کەلتوور باڵادەستە.

***لەم حاڵەتەدا, لەم جیهانە شێتەی ئێمەدا چ شتێك ئارامی و ئومێدتان پێدەبەخشێت؟ سیاسەت یان شتێکی تر؟**

لە دونیای سیاسەتدا شتێك نییە ئارام و بەختەوەرت بکات. ئەگەر ئەتەوێ خەیاڵت ئاسوودەبێت" بەڕای من دەبێ کونجێك بدۆزیتەوەو تەنها لەگەڵ ئەو کتێبانەدا بژیت کە لات خۆشەویستن.

***ئەو کتێبانەی مایەی خۆشەویستی و ئومێدن لای ئێوە کامانەن؟ تۆڵستۆی؟ دۆستۆیڤسکی؟ یان پرۆست؟**

پرۆست و نابۆکۆڤ[37].

***بۆ ئاینده بەرنامەتان چییە؟**

بەتەمام کتێبێکی دیکە بنووسم. بابەتەکەی دەربارەی جیاوازی نێوان فەلسەفەی شیکاری و ناشیکارییە. جگە لەمە, ئەمەوێ سەفەر بکەم و گەلێ لە وڵاتانی دونیا ببینم.

***کەواتە بەڵکو بەختی ئەوەمان هەبێت لە ئێرانیش بتانبینین.**

زۆرم پێخۆشە ئێران ببینم. تا ئێستا نەمدیوە. بەنیازم لە هاوینی 2003دا بێم بۆ ئێران.

---

[37] **نابۆکۆڤ**, ڤلادیمێر ڤلادیمیرۆڤیچ 1899-1977 **Nabokov, Vladimir Vladimirovich.** نوسەرو شاعیرێکی ئەمریکییە لە روسیا لە دایك بووە, هەروەها کورتەچیرۆك و رۆمانیشی نوسیوە, کە دیارترینیان رۆمانی "لۆلیتا"یە ـ 1955 کە بەشێوەیەکی ساتیریستانە نوسراوە.





***ئێوە چ ساڵێك چوونە گۆڤاری "ئیسپری"یەوە؟**

ساڵی 1975 لە بەشی فەلسەفەی سیاسیدا خوێندنم تەواوکردبوو و، سەرنووسەری ئەوسای گۆڤارەکە، واتە پۆڵ تیبو" داوای لێکردم بچمە گۆڤارەکەوە و یارمەتیی بدەم.

***ئەی چ ساڵێك ئێوە کران بە سەرنووسەری گۆڤارەکە؟**

ساڵی 1988.

***"ئیسپری" گۆڤارێکە شەست ساڵە هەیە. دەزانین کە دامەزرێنەرەکەی، واتە ئەمانۆییل مۆنیە، لە ڕووی فیکرییەوە لایەنگری کەسێتیگەرایی(*individualisme* )و ئەو ئایدیۆلۆژیایە بوو کە ئەو فیکرەی کردبووە پشتیوانی خۆی. بە ڕای ئێوە ئایا "ئیسپری" لە سەرەتای چالاکییەوە تا ئەمڕۆ لە بواری تیۆریدا تەوژم و هێڵێکی بەردەوامی هەبووە" یان لەم نەریتە جیابووەتەوە؟**

شێوازی گۆڤارەکە بە زۆری هەمان ئەو شێوازەی سەرەتایەتی. بەڵام لەبەرئەوەی مەسەلەکانی کۆمەڵگای ئەمڕۆ و تەنانەت چاخناسیی ئەمڕۆش لەگەڵ ئەوانەی ساڵانی سیەکاندا جیاوازە، هەر بۆیە لە نێوان ئەو شتانەی ئێمە دەیڵێین و ئەو شتانەدا کە مۆنیە دەیگوتن جیاوازی هەیە. بڕوانە، لە چاخناسیی ئەمڕۆدا دوو هێڵ هەیە، یەکێکیان درێژەی هەمان چاخناسیی ساڵانی سیەکانە، واتە تا ئێستا هەر باس لە "قەیرانی ژیار" دەکات و بڕوای وایە کە ئەو دیموکراسیەی ئێستا بەسەر خۆرئاوادا باڵی کێشاوە" تێپەڕە و بەردەوام دەشێ شێوەی تازەی فاشیزم بێتەوە گۆڕێ. هێڵەکەی تریش کە ئێستا (ئیسپری) گرتوویەتیە بەر" بڕوای وایە کە حکومەتە دیموکراتەکان ڕەگوڕیشەیان لەوە قووڵترە کە تەسەور دەکرێ و، مەسەلەکەش لێرەدا پتەوکردن و مەحکەمەکردنیانە. کەواتە بە ردەوامبوونەکە لە شێوازی گۆڤارەکەدایە. بەڵام وا نەزانیت ئەوە مەسەلەیەکی کەمە. شێوازی کار لە (ئیسپری)دا یەکێکە لە گرنگترین تایبەتمەندیەکانی ئەم گۆڤارە. بڕوانە (ئیسپری) لە ڕووی شێوازی کارکردنەوە لەگەڵ هەموو گۆڤارەکانی تری فەرەنسادا جیاوازە.





دەتوانین بڵێین کە (ئیسپری) گۆڤارێکە بە شێوەیەکی دەستەجەمعی بەڕێوە دەچێت، واتە بە شێوەیەکی دەستەجەمعی بابەتەکانی هەڵدەبژێردرێ و بە شێوەیەکی دەستەجەمعیش لە بارەیانەوە تێدەفکرین. لە رووی بەراوردەوە، دەبینین کە گۆڤارێکی باشی وەکو (دیبا) بەستراوەتەوە بە دوو سێ کارگێڕی سەرەکیەوە، بەڵام (ئیسپری) وا نییە. (ئیسپری) لە ڕێی کارگێڕەکانیەوە باس ناکرێ" بەڵکو لە ڕێی تایبەتمەندێتییەوە لە شێوازی کاریدا. لە ڕاستیدا گۆڤارەکەی ئێمە فەزایەکی نەریتیە کە کەسەکان بە بیروباوەڕی جیاوازیانەوە پێکەوە کاری تیا دەکەن. هەر لەناو هاوکارەکانی (ئیسپری)دا تیایاندایە ڕاستڕەون و لایەنگری لیبرالیزمن، هەندێك هەن کاتۆلیکن، هەن پرۆتستانتن، ژمارەیەکیان جوولەکەن و، تیاشیاندایە هیچ ئاینێکیان نییە. هەڵبەت لە ڕووی سیاسیەوە زۆربە لەگەڵ چەپە نامارکسیستەکاندایە. هێزی (ئیسپری)یش لەوەدایە کە وەکو "تاقیگەیەکی ڕۆشنبیری" وایە و فەزای کارکردنی عەلمانییە و، ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە دامەزرێنەرەکەی خوازیاری بوو. فەزای عەلمانی[1]" واتە فەزایەك کە هەموو کەسێك بتوانێ تیایدا بە بیروباوەڕی خۆیەوە ئامادەیی هەبێت. هەر ئەم بە عەلمانی بوونەشە وای کردووە کە (ئیسپری) تەمەنێکی درێژی وای هەبێت. هەروەها دیسانەوە هەر لەبەر ئەمەشە کە (ئیسپری) بەبێ کێشە لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی دی دەمێنێتەوە.

***تۆزێك زیاتر سەبارەت بە شێوازی کارتان لە گۆڤارەکەدا بۆمان بدوێن. وتار و بابەتەکانی هەر ژمارەیەك چۆن هەڵدەبژێرن؟**

هەندێ لە وتارەکان لە دەرەوەی گۆڤارەکەوە بە دەستمان دەگەن، زۆربەی ئەم وتارانە باشن و بەرزیی ئاستی ئەو وتارانەی کە پێمان دەگەن" نیشانەی ئەوەن کە

---

[1] **عەلمانییەت seculairsm** بریتیە لەوباوەڕەی کەنابێت ئایین و مومارەسە ئاینییەکان بەشداریی بکەن لە کاروبارە سیاسیی و مەدەنییەکاندا, یاخود دامودەزگامەدەنییەکان و بەتایبەتی قوتابخانەکان بەڕێوە ببەن. بەمجۆرە عەلمانییەت بریتییە لەدەرکردن یان دوورخستنەوەی ئایین لەسیستمە فەلسەفییەکان یاخود ئاکارییەکان.





گۆڤارەکەمان لە دۆخێکی باشدایە. خۆیشمان هەندێ فایل دەکەینەوە. عادەتەن لەو ڕۆژەوەی کە بڕیار لەسەر دروستکردنی فایلەکە دەدەین تا ئەو ڕۆژەی تەواو دەبێت و دەبێتە بابەتی تایبەتیی ژمارەیەك لە ژمارەکان" دوو ساڵ دەخایەنێت. کەسێك یان چەند کەسێك لە ئامادەکردنی وتارەکانی فایلەکان بەرپرس دەبن. هێزی (ئیسپری) دەگەڕێتە بۆ ئەم فایلانەو، ئەمەش باشترین کارمانە کە ئەنجامی دەدەین. زۆر بابەت هەن کە بایەخی ڕۆژانەی خۆیان لەدەست دەدەن" بەڵام ئێمە بڕوامان وایە کە هێشتا هەر گرنگن. زۆر مەسەلەی تریش هەیە کە ئێمە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە لە ئایندەیەکی نزیکدا گرنگی بەدەست دەهێنن و بۆیە پێشتر فایلیان لەسەر دەکەینەوە. بۆ نموونە تەواوی ئەو باسانەی کە ئەمڕۆ سەبارەت بە کەنارگیری لە فەرەنسادا لە ئارادایە، ئێمە پێشتر پێشبینیمان کردبوون و فایلمان لەسەر کردبوون. لەبەرئەمەیە کە ئێمە ئەمڕۆ لە بواری مەسەلەکانی جوانناسیدا لە پێش هەمووانەوەین. ئێستاش ئێمە خەریکی ئەوەین کە کار لەسەر بە گشتیکردنی ڕەخنەی تۆتالیتاریزم دەکەین لە بواری کەلتووریدا، لەبەرئەوەی بڕوامان وایە کە بەم زووانە ئەم باسە لە کۆمەڵگادا دەوروژێت.

***(ئیسپری) چۆن بەڕێوە دەچێت، چۆن سەرنووسەر هەڵدەبژێرن؟**

(ئیسپری) ئەنجوومەنێکی ئیداریی هەیە کە ئەرکی هەڵبژاردنی سەرنووسەر لە ئەستۆی ئەودایە، بەڵام عادەتەن کاتێ سەرنووسەرێك وازدەهێنێت" ڕای خۆی سەبارەت بە باشترین کەسێك دەردەبڕێت کە دەکرێ ببێتە جێگرەوەی. من کاتێ بەرپرسیارێتیی بەڕێوەبردنی (ئیسپری)م قبووڵ کرد، گۆڤارەکە بە دۆخێکی زۆر خراپدا تێدەپەڕی و لە ڕاستیدا بڕیاردرابوو کە لەبەر گرفت و کێشەی ماددی دابخرێت. بە ڕای من ئەم کارە بە هەڵەداچوونێکی گەورە بوو. من پرۆژەیەکی چاپەمەنی ماددیم ئامادەکرد و توانیمان بەسەر کێشەکاندا زاڵ بین. تەواوی بڕیارە ئیدارییەکان لە ئەستۆی ئەنجومەنی بەڕێوەبردندایە. ئەندامانی دەستەی نووسین زۆربەی ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە پێکدەهێنن و باقی ئەندامەکانی تریش بریتیە لە کادێری دارایی و بڵاوکەرەوەکانی گۆڤارەکە.





***لە ئێستادا "ئیسپری" بە تیراژی چەند دەردەچێت؟**

ئێستا تیراژی نۆ هەزار دانەیە. پێنج هەزار بەشدارمان هەیە نزیکەی سێ تا چوار هەزار نوسخەش بە دانەدانە دەفرۆشرێ، هەندێ لە ژمارەکانیشمان بۆ جاری دووەم چاپ دەکەینەوە.

***چۆن بودجەی گۆڤارەکە دابین دەکەن؟**

ئیسپری لەم بوارەدا حاڵەتێکی زۆر تایبەتی هەیە، واتە گۆڤارێکە تەواو سەربەخۆ. ئیسپری وەکو کۆمپانیایەکی سەرمایەدار تۆمارکراوە و ئەم کۆمپانیایە گۆڤارەکە بەڕێوە دەبات. ئێمە لە ڕووی داراییەوە تەواو سەربەخۆین و سەربەخۆیی شەخسیشمان پەیوەندیی بەم سەربەخۆییە داراییەوە هەیە. تاقە کۆمەکێك کە وەریدەگرین لە "سەنتەری نەتەوەیی ئەدەبی فەرەنسا"یە کە یارمەتیی هەموو گۆڤارەکان دەدات، بەڵام ئەم کۆمەکە بە بەراورد لەگەڵ بودجەی گشتیی گۆڤارەکەدا هیچ نییە. زۆربەی ئەو گۆڤارانەی لە "ئیسپری" دەچن سەر بە دەزگایەکی بڵاوکردنەوەن، بەڵام ئێمە وانین.

***بەڵام ئێوە پەیوەندییەکی نزیکیشتان لەگەڵ دەزگای بڵاوکردنەوەی "سوی"دا هەیە؟**

بەڵێ، پەیوەندییەکی نزیکمان هەیە، بەڵام یەکێك نین لە گۆڤارەکانی ئەم دەزگایە.

بڕوانە" بەسەرهاتی ئیسپری و سوی بەم جۆرەیە:

دامەزرێنەرانی سوی پەیوەندییەکی نزیکیان لگەڵ ئیسپری دا هەبوو. بەڵام لە کاتی ڕووداوەکانی مانگی ئایاری ساڵی 1968دا لە فەرەنسا" جیاوازیەکی زۆر لە نێوانیاندا دروست بوو. سوی ڕەگێکی کاتۆلیکی[2] هەبوو، "ئیسپری"یش فەزایەکی عەلمانی (نادینی)، ئەمەش بووە مایەی ناکۆکییەکی زۆر لە نێوانیاندا. لەگەڵ ئەو ناکۆکیانەشدا سوی دەیتوانی لە سەرەتای حەفتاکاندا "ئیسپری"

---

[2] کاتۆلیك یان کاسۆلیك, کەنیسەی ڕۆمانیی Roman Catholic Church, بریتیە لە فراوانترین بەشی ئاینی مەسیحی, لەو مەسیحییانە پێکهاتووە کە ملکەچن بۆ دەسەڵاتی پاپای ڕۆما. وشەکە لە وشەی *katholikos* ی یۆنانییەوە هاتووە, کە مانای گەردونیی یان جیهانیی دەگەیەنێت و هەر لەسەرەتاکانی ئاینی مەسیحییەوە بەکارهاتووە, ئەوکاتەی کە تاکە کەنیسەی مەسیحیی بووە.





بکات بە گۆڤاری سەرەکیی خۆی، بەڵام نەیکرد. ئەمڕۆ ئەو ناکۆکیانە کاڵبوونەتەوە و ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ "سوی"دا باشە، بەڵام لە ڕووی داراییەوە سەربەخۆین و بەهەرحاڵ "سوی"یش وەکو گەلێ دەزگای بڵاوکردنەوەی دی ڕووبەڕووی قەیران بووەتەوە و ئەمەش مایەی ئەفسووسە.

***لەگەڵ دەوڵەتدا چۆن بوون؟ هیچ کاتێك لەگەڵیاندا دووچاری شتێك بوون؟ ئایا ڕووبەڕووی سانسۆر و شتی لەم بابەتە بوونەتەوە؟**

لە کاتی شەڕی جەزائیردا لەگەڵ دەوڵەتدا بەیەکداهاتین و چاپکردنی هەندێ بابەتمان لێ قەدەغە کرا. ئەم قۆناغە، قۆناغێکی زۆر سەخت بوو.

***لە بنەڕەتدا "ئیسپری" چ پەیوەندییەکی لەگەڵ سیاسەتدا هەیە؟ ئایا بۆ نموونە دەتوانین بڵێین "ئیسپری" هەڵوێستێکی سیاسیانەی هەیە، چ لە بواری مەسەلە ناوخۆییەکانی فەرەنسادا و چ لە بواری مەسەلە نێو نەتەوەییەکاندا؟**

بەڵێ دەتوانین وا بڵێین و ئێمە زۆریش هەوڵ دەدەین کە لە بواری سیاسەتدا ئامادەییمان هەبێت و چالاك بین. بایەخدانی ئێمە بەم بوارە لە بواری کۆمەڵایەتی زیاترە. هەوڵ دەدەین کەمتر خۆمان لە قەرەی شیکردنەوەی پەیوەست بە گۆڕانکاریی حیزبە سیاسیەکان بدەین. لەبەرئەوەی ئەم جۆرە شیکردنەوانە بووە بە خۆراکێکی ئاسایی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان و، هەر لەبەرئەمەش زوو دووبارە دەبنەوە.

***واتە لەم بوارەشدا ئێوە هەوڵ دەدەن کە بە ڕەچاوکردنی بایەخپێدان و هەستیارێتی بەرامبەر بە مەسەلەکانی ڕۆژ" بچنە سەروو "ڕۆژنامەنووسی"یەوە.**

بەڵێ وایە، ئێمە پەیوەندیمان بە ڕۆژنامەنووسییەوە نییە. مەسەلەی ئێمە لە بواری سیاسەتدا، بەها بەخشینە بە سیاسەت و کاری سیاسی. ئەمڕۆ دەزگاکانی ڕاگەیاندن و شێوازی ژیان خەریکن بە تەواوەتی سیاسەت بێبەها دەکەن" کە ڕەگی لە چەمکی نوێنەرایەتیدایە. تەوەری کاری ئێمە ئەوەیە پیشانی بدەین کە مەسەلەی نوێنەرایەتی لە چوارچێوەی فەلسەفە، جوانناسی و سیاسەتدا زۆر گرنگ و ڕۆڵێکی دیاریکەری هەیە و پێویستە سەرلەنوێ بایەخی پێ بدەینەوە.





هـــەر لەبەرئەمەشـــە کـــە ئێمـــە تـــەواو دووریـــن لـــە گوتـــاری بونیادشـــکێنی (*deconstructivisme*)، کـە سیاسـەت بـە بێبـەها سـەیر دەکـات. ئێمـە تەنانـەت گـەر ئـەوەشمان پـێ قبـووڵ بێـت کـە دیـدگای کەسـێکی وەکـو دێریـدا لـە ڕووی فەلسەفییەوە جێی سەرنجە و شتی ڕاست دەخاتەڕوو، بەڵام وەختێ بە مەسەلەی دیموکراسـی دەگـەین، ئـەم دیدگایـە بێمانـا دەبێـت. لەبەرئـەوەی دەبێتـە مایـەی دروسـتکردنی گومـانی گشـتی و هـەروەها گومـانکردن لـە دیموکراسـی و، ئێمـە ڕەخنـە لـەم تێڕوانینـە دەگـرین. ئێمـە بڕوامـان وایـە کـە ئەگـەر ئادەمیزادەکـان چاودێری دیموکراسی بن، سیستمە دیموکراتەکان ئایندەیان دەبێت. دیموکراسی پاکـەتێك نییـە ئادەمیزادەکـان تیایـدا لـە پـەنا یـەکترەوە ڕیزکـرابن. دیموکراسـی پێویستی بـە کـار و بەرپرسیارێتیی تاکەکەسەکانە. با بزانین بەرامبـەر بـە ڕژێمـە دیموکراتـەکان ئێمـە چ ئاڵتـەرناتیڤێکمان هەیـە. تەنانـەت گـەر هـەموو ئـەو جـۆرە ئایـدیۆلۆژیا نوێیانـەش ئەفـەرۆز بکـەین کـە لـە ئـارادان، دیسـانەوە مەسـەلەی کۆمۆنیزم[3] هەر دێتـە پێشـەوە. هەڵبـەت کۆمۆنیزم ئەمڕۆ چیدی لافی جیهانگیری لێنادات و زیاتر لە شێوەی کۆمۆنیزمی نەتەوەییدا لە چین درێژە بە ژیانی خۆی دەدات. بـەڵام، بەهـەرحاڵ تـا ئـەم نموونەیـەش لـە ئـارادا بێـت" نـاتوانین بـاس لـە مـەرگی کۆمـۆنیزم بکـەین و بـەم پێیـەش بـەرگریکردن لـە دیموکراسـی بێبایـەخ و ناپێویستە.

دەبیـــنین کـــە چـــین تەنانـــەت هەوڵـــدەدات کۆمـــۆنیزم لەگـــەڵ بنـــەماکانی سـەرمایەداریدا سـازش پـێ بکـات. واتـە جگـە لـە دیموکراسـی هـەموو شـتەکانی

---

[3] **کۆمۆنیزم** Communism چەمکێك یاخود سیستمێکی کۆمەڵگایە, کە تێیدا کۆمەڵگا خاوەنی یەکەمی سەرچاوە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنان و ئامێرەکانی بەرهەمهێنانەو ئەو مافە لەتاکەکات وەردەگیرێتەوە. لەرووی تیورییەوە ئەم چەشنە کۆمەڵگایانە بەشی یەکسان بۆ ئەندامەکانی دابین دەکات, بـەپێی توانـای هەریـەکێکیان و, بـەپێی پێویسـتییش سـودیا پێدەگەیـەنێت. لەهەنـدێك بۆچوونی کۆمۆنیزمییدا دەوڵەت سودێکی ئەوتۆی نامێنێت, بۆیە پێیان وایە کە کۆمەڵگایەکی لەم چەشنە, لەدواقۆناغیدا, بێ دەوڵەت دەبێت. کۆمۆنیزم لەرێگای شۆڕشەوە سودی تایبەتی و زێدەبایی کار پووچ دەکاتەوەو هەموو تواناو لێپرسراوێتییەکان دەخاتە دەستی پارتی پێشڕەوی کۆمۆنیستەوە.





خۆرئاوای پێ قبووڵە. هەروەها بە ڕای من هەندێ لە ئیسلامیەکانیش لە هەموو شتەکانی دی زیاتر هێرش دەکەنە سەر دیموکراسی، کە هێشتا نازانم بۆچی. دەبێ ئەم ڕەخنانە بە جیدی وەربگرین و، لە ئەنجامیشدا، پشتیوانی لە دیموکراسی بکەین. دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە ئەوروپا سەری خۆیان بەوە ئاسوودە دەکەن کە ڕەخنەی ئیسلامەکان دواکەوتووانەیە و دەیانەوێ بۆ دواوە بگەڕێینەوە و، ئەمەش شتێکی مەحاڵە. ئەو قسانە بە جیدی ناگرن، لە کاتێکدا بە ڕای من ئیسلامگەرایی بە تەنها ئەم لایەنەی نییە، بەڵکو هەروەکو "داریوش شایگان"یش دەڵێت" خاوەنی دوالیزمێکی دیارینەکەرە، واتە نە تەقلیدییە و نە نوێخواز. هەر لەبەرئەمەشە لە وڵاتێکی وەکو ئێراندا، کە وڵاتێکی نە تەواو تەقلیدییە و نە تەواو مۆدێرن" هاتە ئاراوە. واتە نابێ بگوترێ کە گوتاری ئیسلامگەرایان گوتارێکی دواکەوتوو و کۆنە و گوتاری لادێیە بەرامبەر بە شار. نەخێر، بەم سادەییە نییە. ئیسلامگەراکان مەسەلەی یەکسانی دەخەنە ڕوو" کە مەسەلەیەکی گرنگە. سەرەنجام دەبینین" کە لە بەیەکترگەیشتنی ئەم گوتارانەدا" پێویستە پایەی دیموکراسی بپارێزین و لە ڕێی ڕەخنە و دووبارە هەڵسەنگاندنەوەیانەوە کۆتایی بەو قەیرانەی و هەروەها قەیرانی کۆمەڵگا ئەوروپییەکانیش بهێنین. ئایا دیموکراسی سیستمێکی لیبراڵ و یەکسانیخوازە؟ ئایا دیموکراسی ڕێز لە کەسێتیی تاکەکەسەکان دەگرێت؟ ماوەیەکە لە ئەمریکادا ئەم باسانە لە گۆڕێن و فەرەنساش ناچارە بچێتە ناو ئەم باسانەوە. هەر لەبەر ئەمەش لێکۆڵینەوەکانی ڕۆڵز و واڵزەر سەبارەت بە عەدالەتی کۆمەڵایەتی بۆ ئێمە زۆر گرنگن. ئێمە پێویستە وەڵامی ئەو پرسیارە سەرەکیە بدەینەوە کە کۆمەڵگایەکی دیموکرات و لیبراڵ بایەخ بە کام پەیوەندییانە دەدات.ئەگینا نابێ سەرمان لەوە سووڕبمێنێت کە جۆرەها وەڵامی خەمئەنگێز و وەڵامی پاش دیموکراسییانە بەم پرسیارانە بدرێتەوە.





***زۆر چاکە، بەڵام ئێوە خۆتان لەم بوارەدا چۆن بیردەکەنەوە، واتە چۆن مەسەلەی دیموکراسی دەخەنە ڕوو؟ لەبەرئەوەی مەسەلەی دیموکراسی، هەمیشە و هەر لە سەرەتاشەوە مەسەلەی "ئیسپری" بووە.**

ڕاستە، دیموکراسی هەمیشە مەسەلەی "ئیسپری" بووە. بەڵام ئەمڕۆ بە بەراورد لەگەڵ ساڵانی سیەکاندا، تێگەیشتنێکی ترمان بۆ ئەم چەمکە هەیە. بەلای "مۆنیە"وە کە دامەزرێنەری "ئیسپری" بوو، دیموکراسی هاوبەهاو هاوتای لیبراڵیزم و تاکگەرایی بوو، ئەویش هەر چاوەڕێی ئەم شتانەی لە دیموکراسی دەکرد. هەربۆیە، لەو قۆناغەدا زیاتر باس لە قەیرانی ژیار دەکرا نەك دیموکراسی. بۆ نموونە چەمکی وەکو "تاکگەرایی کۆمەڵایەتی" لە ئارادا بوو، کەسە جیاوازەکان لە ڕوانگەی مارکسیستی یان ئێگزیستانسیالیستی یان لیبرالیەوە وەڵامیان دەدایەوە و وەڵامی ئێمەش زیاتر کەلتووری بوو نەك سیاسی.

لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا و لەژێر چاودێریی بەڕێوەبەرایەتیەکەی پۆڵ تیۆدا، "ئیسپری" وەرچەرخانێکی گرنگی ئەنجام دا و پێویستە بڵێم کە کتێبی "کۆمەڵە دوورگەکانی گوڵاك"ی سولژنیتسین ڕۆڵێکی دیاریکەری لەم وەرچەرخانەدا هەبوو، لەبەرئەوەی سەرنجی ئێمەی بەلای دیاردەی تۆتالیتاریزمدا ڕاکێشا و، ڕەخنەگرتنیش لە تۆتالیتاریزم، چ لە شێوە فاشیستیەکەیدا و، چ لە شێوە کۆمۆنیستیەکەیدا" ئێمەی بە مەسەلەی دیموکراسی گەیاند. ئێمە لە ڕێی ڕەخنەگرتنی سیاسییەوە لە کۆمەڵگایەکی چوونیەك کە یەك حیزبی سیاسی تیایدا دەسەڵاتدارە، توانیمان بە تێگەیشتنی خۆماندا بۆ دیموکراسی بچینەوە. ئەم پیاچوونەوەیەش لە ڕێگای چەمکگەلێکی وەکو ناکۆکی و بەراوردەوە ئەنجام درا.

بەلای ئێمەوە، کۆمەڵگای مۆدێرن بە تەنها لە شێوەی کۆمەڵگایەکی بەشبەشبوودا مانای هەیە. ئێستاش مەسەلەکەی ئێمە ئەوەیە کە بە ڕەچاوکردنی ئەم دابەشبوونە" چۆن دەتوانین ڕێککەوتنێکی تیۆریی وا بە دەست بهێنین کە ببێتە سەرچاوەی پایەداریی هەر کۆمەڵگایەك. بە واتایەکی دی و، هەروەکو پۆڵ





ڕیکۆریش[4] دەڵێت، دیموکراسی فەزای "ڕێککەوتنی بۆچوونەکانە بە تێکەڵبوون لەگەڵ پێکداداندا". بڕوانە، لە کۆمەڵگایەکی دیموکراتدا، تاکەکان لەسەر ڕێساکان ڕێك کەوتوون، لەسەر دەزگاکان ڕێك کەوتوون، بەڵام ئەم ڕێککەوتنانە نابێ ڕێ لە بە یەکداچوونی بیروباوەڕەکان بگرن و، لەمەش گرنگتر، نابێ بەشە جیاوازەکانی کۆمەڵگا لەناوبەرن. لە ڕاستیدا ئەگەر جیاوازی لە ئارادا نەبێت" کە مایەی پەیدابوونی شێوە جۆراوجۆرەکانی وزەیە لە کۆمەڵگادا، مەترسیی ئەوە هەیە کە ئەوەی "ڕێککەوتنی بۆچوونەکانە" بەرەو "حوکمڕانیی بیروباوەڕ" بچێت. بەم پێیە، دەبێ لە یەك کاتدا هەم بیر لە ڕێککەوتنی بۆچوونەکان و هەم لە جیاوازیی بۆچوونەکان بکەینەوە. لەم ڕووەشەوە، بە بۆچوونی ئێمە مەسەلەی سیاسی گرنگترین مەسەلەیە و ئێمە لەو بڕوایەداین کە کۆمەڵگا بە تەنها لە شێوەی کۆمەڵگای سیاسیدا بوونی هەیە و ئەوە پەیمانی کۆمەڵایەتیە کە توانای ژیان و بەردەوامی بە کۆمەڵگایەکی مێژوویی دەبەخشێت. بەڵام ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەماندا لە دەرگای کۆمەڵناسیەوە ناچینە ژوورەوە، بەڵکو بیر لە "ڕێککەوتنی بۆچوونەکانی تێکەڵ بە پێکدادان" دەکەینەوە، واتە ڕێککەوتن لەسەر ڕێساکان هاوکات لەگەڵ توانای گەشەدان بە کۆمەڵگای سیاسی لە ڕێی هێزە جۆربەجۆرەکانەوە.

***باسی ڕیکۆرت کرد و دەزانم کە هانا ئارێنت و کلۆد لۆفۆریش لەم ساڵانەی دواییدا کاریگەرییان لەسەر هێڵی فیکریی "ئیسپری" هەبووە. دەتوانیت کەمێك لەسەر کاریگەری و چۆنێتیی ئاشنابوون و هاوکاریی ئەم کەسانە لەگەڵ "ئیسپری"دا بۆمان بدوێیت؟**

---

[4] **ریکۆر ، پۆل** (1913 Ricoeur, Paul فەیلەسوفێکی فەرەنسییە، پشت بە هەردوو بوونگەرایی و فینۆمینۆلۆجیا دەبەستێت، هەوڵ دەدات خۆی لەناو مەسەلەی لێکدانەوەدا بهێڵێتەوە، واتە سەیرکردنی بوون لە تویێی شیکردنەوەی کردەوەی ئیرادەگەراوە. یەکەمین کتێبی ئەم ئاراستەیەی گرتۆتە بەر ئیرادی و نا ـ ئیرادی 1950. پاشان کۆتا و تاوان 1960. ریکۆر پێی وایە خراپە لە ڕێی جووتنەبوونی مرۆڤ لەگەڵ هەستەکانیدا، دێتە ناو جیهانەوە، ئەم جووتنەبوونە لەسەر هەموو ئاستەکانیزانین و کردەوەو سۆزیش دەبێت.





بۆ پەیبردن بە کاریگەریی ئەم کەسانە لەسەر "ئیسپری"، دەبێ سەرنج لە هزری فەلسەفی و سیاسیی ئەوان بدەین.

هەروەکو دەزانیت، ڕیکۆر کارێکی گرنگی هەیە بەناونیشانی "پارادۆکسی سیاسی". ئەوەی ڕیکۆر لەم نووسینەیدا دەیڵێت ئەوەیە کە گەورەترین باشە، واتە گەورەترین ئەقڵانیەت، دەشێ ببێتە مایەی گەورەترین خراپە. گەورەترین ئەقڵانیەت لە ڕوانگەی ئەوەوە هەمان توانای ڕێکخستنی پێکەوەژیانی تاکەکەسەکانە لە کۆمەڵگایەکی عەلمانیدا، واتە توانای گەیشتن بە "پەیمانی کۆمەڵایەتی"ی ڕۆسۆ. بۆئەوەی ئەم پێکەوەژیانەش مەیسەربێت، جیهانی مۆدێرن دەزگای نوێنەرایەتی دەهێنێتە ئاراوە و ناوی لێدەنێت "دەوڵەت". بەڵام ئەم دەوڵەتە دەشێ خۆی ببێتە سەرەکیترین ئامرازی دەسەڵات. بەم مانایە" دەشێ گەورەترین خراپە، کە دەسەڵاتی ڕەهایە" لە گەورەترین ئەقڵانیەتەوە لەدایك ببێت. کەواتە هەر ئەوەندەی پێ دەنێینە ناو کۆمەڵگای مۆدێرنەوە، پێ دەنێینە ناو سنوورێکەوە کە تیایدا دەسەڵاتی ڕەها هەیە. هەر لەم ڕوانگەیەشەوەیە کە ئەو وا دەڕوانێتە دیموکراسی کە ڕێککەوتنی بۆچوونەکانە تێکەڵ بە پێکدادانیان و هەروەها بیر لە ماف و سیاسەت و دەزگاکانیش دەکاتەوە. لەم ڕووەوەیە کە ڕیکۆر بەلای ئێمەوە نووسەرێکی گرنگە. کارەکانی ڕیکۆر بە دڵنیاییەوە لەژێر کاریگەریی بیروبۆچوونە ئایینیەکانیدان. بەڵام لە بیروڕاکانی ئەودا جیاوازیەکی تەواو لە نێوان ئیمان و فەلسەفەدا هەیە. واتە ناتوانین لە ڕێی ئیمانی ئایینیی ڕیکۆرەوە پەی بە فەلسەفەکەی بەرین. ئەو بە مانای تایبەتیی وشەکە فەیلەسووفە. کاریگەریی ئایین لەسەر هزری ئەو لە هەمان بە سەنتەریبوونی خراپەدا کۆدەبێتەوە. بەڵام شێوەی مەسەلەی خراپە لای ئەو لەگەڵ گوتاری باوی پەیوەندیدار بەم بابەتەدا جیاوازە. ئەوانی دی بڕوایان وایە کە خراپە چواردەورمانی تەنیوەتەوە و هێرشمان دەکاتە سەر، لە کاتێکا، ڕیکۆر بڕوای وایە کە خراپە بەسەرماندا ناسەپێنرێ و ناتوانێت لە بەردەم کارکردنماندا ببێتە ڕێگر. ئەو بڕوای وایە کە هەر لەبەر ئەوەی حراپە هەیە و بوونی ئەو پێش بوونی من





دەکەوێت" بۆیە دەبێ کار بکەم و وەڵامی بدەمەوە. بڕوانە، دەتوانین بە دوو شێوە باسی خراپە بکەین. یەکێکیان بەرەو گومانمان دەبات و ئەوی تریشیان بۆ کارکردن هانمان دەدات و مەسەلەی ڕوونکردنەوەی سیاسەتی دیموکراتیمان بۆ دەهێنێتە گۆڕێ. لە بیروڕاکانی ڕیکۆردا فاکتەری بەرجەستەکردنی فەلسەفەیەکی کار هەیە و لە پرۆژەی هایدیگەری و دێریدایی بونیادشکێنی جیاوازە. ڕیکۆر فەلسەفە لە مێژووی فەلسەفەدا کورت ناکاتەوە. گرنگیی هزری ئەویش بۆ ئەو کارەی کە ئێمە دەیکەین لەم هاندانی کارکردنە و هەوڵدانەدایە بۆ ڕوونکردنەوەی سیاسەتی دیموکراتی. بۆیە کاتێ ئێمە دەڵێین مەسەلەکەی ئێمە سیاسییە، واتە مەسەلەکەی ئێمە سەبارەت بەوەیە کە هەلومەرجەکانی کارکردن لە بواری سیاسیدا برەخسێ.

بەڵام سەبارەت بە ئارێنت[5]، کاتێ من هاتمە گۆڤاری "ئیسپری"یەوە تازە خەریك بوون بایەخیان بە هانا ئارێنت دەدا. ئەودەمە کەس لە فەرەنسادا باسی ئەوی نەدەکرد. لە ساڵی 1974دا گروپێکی فەلسەفیمان دەربارەی ئارێنت پێکهێنا و لە ساڵی 1979دا ژمارەیەکی تایبەتمان بەو دەرکرد. ئارێنت زۆر سەرنجی ڕاکێشاین و لەسەر پێشکەوتنی فیکریی ئێمە زۆر کاریگەر بوو. ئارێنت بە شێوەیەکی تەواو نوێ سەرگەرمی ڕەخنەگرتن لە تۆتالیتاریزم[6] بوو. لە

---

[5] **ئارێنت, هانا** Arendt, Hannah (1906-1975) ژنە بیریارێکی ئەڵمانی پۆست مارکسییزمە, سەرقاڵی شیکردنەوەی سروشتی سیاسیی و کۆمەڵگای مۆدێرنە. سەرەتا لەژێر سەرپەرشتی هایدگەردا خوێندویەتی و پەیوەندیی خۆشەویستی لەنێوانیادا هەبووە. بەڵام لەساڵی 1925دا پەیوەندیی بە هایدگەرەوە دەپچڕێت و لەگەڵ کارل یاسپەرزدا خەریکی ئامادەکردنی دکتۆراکەی دەبێت لە"چەمکی خۆشەویستی لەفەلسەفەی ئۆگەستیندا . 1928. لەسەردەمی نازییەکاندا دەچێتە پاریس و لەوێشەوە بۆ ئەمریکا. لەساڵی 1951دا کتێبی ریشەی تۆتاڵیتارییەت بڵاودەکاتەوەو دوای ئەو کتێبە نێوبانگ دەردەکات و لە شەش حەوت زانکۆی ئەمریکیدا موحازەرەی دەدەنێ و ئەویش بایەخ دەدات بە مەسەلەکانی لە دەسچوونی ئازادی, نامۆبوون و مەترسی ئەتۆمیی و ڕژێمە تۆتاڵیتارییەکان. کتێبەکانی تری دەربارەی شۆڕش 1963, دەربارەی توندو تیژیی 1970, قەیرانی کۆماری 1972 .

[6] **تۆتالیتاریزم** Totalitarianism بریتیە لە زانستێکی سیاسی, سیستمێکی حکومەت و ئایدیۆلۆجیایەك, کە تێیدا هەموو چالاکییە سیاسی, ئابوری, رۆشنبیریی, کەلتوریی, لەگەڵ





بیروڕاکانی ئارێنتدا لایەنێکی سەرنجڕاکێشی تریش هەیە. ئەو نووسەرێکە دژ بە دوورەپەرێزییە لە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان. بە بڕوای من ئەو کەسانەی کە بیرمەندی کاربوون، بیرمەندی جۆرێك لە ڕووناکبینیی گەورە بوون و، لە ئاست مێژوودا، بە بیرمەندی سیاسی لە قەڵەم دەدرێن. ئارێنت ئەو توانایەی هەبوو کە بیر لە مەسەلە هاوچەرخەکان بکاتەوە و، هەروەکو دەشزانن، ئەم کارە شتێکی بنەڕەتییە بۆ ئێمە. کاتێ ئێمە باس لە ڕەخنەگرتن لە تۆتالیتاریزم دەکەین، لە هەمان کاتدا توانای بیرکردنەوە سەبارەت بە مەسەلە هاوچەرخەکان و سیاسەت لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دەخەینە ڕوو.

دەربارەی کلۆد لۆفۆریش دەبێ بڵێم کاتێ بۆ "ئیسپری" هاتم نامەی ماجستێرەکەم لەسەر هزری لۆفۆر تەواو کردبوو، بەر لەویش کارم لەسەر بیروڕاکانی مۆریس میرلۆپۆنتی کردبوو. ئەو بابەتەی کە سەرنجی منی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا ئەوەبوو کە چۆن ئەو بیروباوەڕانەی پشتبەستوون بە دیاردەناسیی دەرککردن" دەبنە سەرچاوەی بیرکردنەوە دەربارەی سیاسەت. بە بۆچوونی من شتێکی ڕێکەوت نییە. کاتێ دەبینین کە ڕەخنەگرتن لە تۆتالیتاریزم تا ئەم ڕادەیە کاریگەریی لەسەر هزری دیاردەناسانە (فینۆمینۆلۆژیانە) هەیە.

هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە پەیوەندی لە نێوان ڕەخنەگرتن لە تۆتالیتاریزم و توانای وەسفکردن و شیکردنەوەی ڕاستیدا هەیە. بەرامبەر

---

چالاکییە ڕۆحییەکاندا, دەکەونە ژێر ئیختیاری سەرۆکەکانی وڵاتەوە. شەش حەوت خەسڵەتی گرنگ تۆتاڵیتاریزم جیادەکەنەوە: چەشنە ئۆتۆکراسییەتێکی تایبەت بە سەدەی بیستەم, کە لەشێوە کۆنەکانی ڕەهایەتی و پاشکۆیەتی و ستەمکارییەوە پوختە کراوە, لەفۆرمە دێرینەکانی ئۆتۆکراسییدا, خەڵکی بۆیان هەبوو بەشێوەیەکی سەربەخۆ بژین و کاربکەن, هەروەها خەسڵەتە سیاسییەکانی خۆیان پاراستبوو. بەڵام لەتۆتاڵیتاریزمی مۆدرێندا, ئەوا خەڵك بەتەواوەتی لە خەون و هیواو پێداویستییەکانیاندا, پشت بەپارتێکی سیاسی و سەرکردەکانیان دەبەستن. ئۆتۆکراسیزمی دێرین لەلایەنی پادشایەکەوە, یان هەر ئەدرێسێکی تری ئەریستۆکراسەوە بەڕێوە دەبرا, کە بەپێی ڕەنسیپی مافی لەوێنەی یەزدانیی , وڵاتی بەڕێوە دەبرد, بەڵام لەتۆتاڵیتاریزمی نوێدا وڵات لە لایەنی سەرکردەیەکەوە یان بەڕێوەبەرێکەوە بەڕێوە دەبرێت کە کۆنترۆڵی پارتی سیاسیی دەسەڵاتداری کردووە.





بەمەش، دەتوانیت ئەوە ببینیت کە هێزی پشتبەستوو بە بونیادشکێنی لە مەسەلەی سیاسیدا ڕووبەڕووی چیەها گرفت دەبێتەوە.

***هەرکاتێ قسە لەسەر دیموکراسی دەکرێ" باسی بەجیهانیبوون و ڕێژەیی کەلتووری دێتە ئاراوە. دەمەوێ هەڵوێستی گۆڤاری "ئیسپری" لەم بارەیەوە بزانم؟**

ئێمە لەم بوارەدا وتاری زۆرمان بڵاوکردۆتەوە، لە نێویاندا وتاری پیرهاسنەر و میشیل والزەر کە بەرگری لە هێزی فرەچەشنیی بەجیهانیبوونەکان دەکەن. ئەو قسەیەش بەو مانایە نایەت کە مەسەلەیەکی بەجیهانیبوو دەبووایە حەتمەن خۆی لەگەڵ کەلتوورە جیاوازەکاندا بگونجاندایە، واتە بۆ نموونە، مافی مرۆڤی چینی یا مافی مرۆڤی ئێرانیمان هەبێت. بەڵکو مەسەلەکە لەسەر شێوەیەکی سیاسیی جیاوازە کە بەرگریکردن لەم مافانە لە چوارچێوەی کەلتووریی جیاجیادا" لەخۆ دەگرێت. سەرباری ئەمە، قسەی ئێمە ئەوەیە کە دیموکراسی نە بە تەنها فەرمانڕەوایی خەڵکە واتە فەمرانڕەوایی زۆرینە، نە بە تەنها دەوڵەتی قانوونە و، نە بە تەنها مافی تاکەکەسەکانیشە" بەڵکو هەرسێکیانە بە یەکەوە. ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە پیرهاسنەر ناوی لێناوە "سێگۆشەی ئاڵتوونی". واتە ناتوانین وا بیر لە دیموکراسی بکەینەوە کە بە تەنها بریتییەلە حوکمڕانیی زۆرینە. دیموکراسی هەم فەرمانڕەوایی خەڵکە و هەم مافەکانی تاکەکەس. بەم پێیە دەبێ بەم سێ ئاقارە خەبات بکرێ.

***وەکو دواپرسیار حەزدەکەم بزانم کە ئایا هەوڵ دەدەن لەگەڵ گۆڤاری تری وڵاتانی تردا پەیوەندیتان هەبێت و، بۆچی؟**

بەڵێ، دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ هەموو ئەو گۆڤارانەدا کە وەکو ئێمە کاردەکەن بەلای ئێمەوە زۆر گرنگە. لە بنەڕەتدا ئیسپری گۆڤارێکی نێونەتەوەییە. ئێمە ڕۆشنبیرانێکی کۆسمۆپۆلیتی نین کە لەسەر بەرزاییەك دەوەستن و بەمتمانەوە بە لەسەر هەقبوونی خۆیان دەڕواننە کۆمەڵگاکەیان. هەرچۆن ئێمە خۆمان بە ڕۆشنبیران و نووسەرانی ژێر ستەم یان ستەمدیدەی ئاینده نازانین. ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە ئەوەیە کە جەمسەری ڕۆشنبیریی جیاجیا لە





کۆمەڵگاکاندا پەیدا بن و دۆخە دیموکراتەکان یارمەتیی پەیدابوونی هێزی ئازاد بدەن و ئەم جەمسەر و هێزانە پێکەوە و لەسەر ئاستێکی جیهانیدا لەگەڵ یەکدا پەیوەندییان هەبێت. لە هەمان کاتدا" بە ڕای من ئەوە بەس نیە کە چەند کەسێك لە گۆشەکانی دونیاوە ناوبەناوێك لە دەوری یەك کۆببنەوە. دەبێ پێشتر خۆمان بۆ ئەم دیدارانە ئامادە بکەین. دەبێ بۆ گۆڤارەکە کار بکەین" ئەگینا دەکەوینە داوی سیمیناربازییەوە. ئامانج لە کۆبوونەوە دەبێ ئەوە بێت کە بۆ ڕۆژی ئەنجامدانی، کۆمەڵێك ئامانج و ئاسۆ دیاری بکەین و بە ئەنجامیان بگەیەنین. بۆئەوەی بۆ پرسیارەکەی پێشووی ئێوەش سەبارەت بە جیهانیبوون بگەڕێمەوە، دەبێ بڵێم کە ڕۆشنبیر بە تەنها ڕۆشنبیری کۆمەڵگاکەی خۆی نییە، هەرچەندە کە هەر ڕۆشنبیرێك لەسەر ئاستی نەتەوەییدا مەترەحە، ئەگینا سەر بە هیچ کوێ نابێت، بەلآم لە هەمان کاتدا ئەو ڕۆشنبیرەی کە ڕێز لە مافەکانی مرۆڤ دەگرێت" ناتوانێت کۆسمۆلیۆلیت بێت. کەواتە ئەبێ ئەندامێکی کۆمەڵگاکەی خۆت بیت" بەبێ ئەوەی تیایدا بتوێیتەوە. ئەبێ لایەنگری مافی مرۆڤ بیت، بەلآم کۆمەڵگاکەی خۆت لەم مافانە تێربکەیت، دەنا مافی مرۆڤ دەگۆڕێ بۆ کۆمەڵێك پرنسیپی ڕووکەش.

ڕۆشنبیرێك کە لە گۆڤارێکدا کاردەکات، نە جیهانییە و نە کۆیلەی نەتەوەکەی خۆی، بەڵکو کەسێکە هەوڵدەدات پەیوەندی لە نێوان ئەم دووانەدا دروستبکات.

**ك.** 1/1993

**سەرچاوە: نقد عقل مدرن, رامین جهانبگلو,** 1376 – **تهران.**





***ئێوە لە لەهستان (پۆڵەندا) لەدایکبوون. ئـەو یادەوەریانـەی سـەبارەت بـە منـاڵی و دووەم جەنگی جیهانی هەتانە" چین؟**

بێگومـان کۆمـەڵێك یـادەوەریی زۆری منـاڵیم لـە بـیرە. بـۆ نموونـە زۆر بـە وردی سـاڵانی جـەنگم دێتـەوە یـاد. ئـەو سـاڵانە بـۆ هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە لـە سـای داگیرکردنـی نازییەکانـدا دەژیـان" ڕۆژگـاری تـرس بـوو. مـن بـۆ ئۆردوگـای دیلـە ئەڵمانیەکان نەچووم و، هەروەکو دەمبینیت بە زیندوویی مامەوە.

***لە کوێ خوێندتان؟ چۆن حەزتان بە فەلسەفە کرد؟**

من لە لۆدز خوێندم کە دووەم شاری پۆڵەندا بوو و، لە ساڵە سەرەتاییەکانی پاش جەنگیشـدا بـە پایتـەختی ڕۆشـنبیریی وڵات دەژمێـردرا، لەبەرئـەوەی وارشـۆ[7] لـە لایەن هێرشبەرە ئەڵمانیەکانەوە بە تەواوی وێران کرابوو. مامۆستاکانم کۆمەڵێك ئەقڵگـەرای بـەهێزبوون و بـە نوێنـەری هـزری شـیکاری و ئەزموونگـەرا لـە قەڵـەم دەدران. بەشـی زۆری ڕۆژگـاری خوێنـدنم بۆ لۆجیك و فەلسـەفەی زانسـت تـەرخان بـوو. مـن ئێسـتا چـیدی پـەیڕەوی لـەم شـێوازی بیرکردنەوەیـە ناکـەم، بـەڵام سوپاسـگوزاری مامۆسـتاکانی زانکـۆمم کـە ئێمـەیان لەسـەر ڕوحیـەتی

---

[7] **وارشـۆ** بەپۆڵەنـدی پێـی دەڵـێن وارسـزاو (Polish *Warszawa*), **Warsaw** پایتـەخت و گەورەترین شاری پۆڵەندەیە, ناوچەیەکی ئیدارییە لەهەرێمی مازۆڤیادا, دەکەوێتە ناوەڕاستی پۆڵەنـدەوەو لەسـەر ڕوبـاری ڤیسـتولا دروسـتکراوە. زیـاتر لەسـەدا نـەوەدی شـارەکە لەجـەنگی جیهـانی دووەمـدا وێرانکـراوە. دواتـر بەناڕەحـەنی و مەشـەقەتێکی زۆر بەشـە مێژووییەکـەی شارەکە بیناکرایـەوە. دیـارترین شوێن لەوارشـۆدا بریتیە لەکۆشکی زانست و ئەدەب لـەدامێنی شـارەکەدا. لەگـەڵ هەرەسهێنانی کۆمۆنیزمـدا لەسـاڵی 1989دا, وارشـۆ بوژانەوەیـەکی ئـابوریی بەخۆیەوە بینیوە, ئیتر باڵەخانەو میوانخانەی نوێ بیناکران و سیما تەماوییەکەی شارەکەیان گۆڕی. وارشۆ شارێکی ساردە, لەهاویناندا بەرزترین پلەی گەرما تێیدا دەگاتە 24 پلـەی سـەدی و نزمترینیش 14 پلەی سەدییە. زستانانیش بـەرزترین پلـەی گـەرما تێیدا سفر پلـەی سـەدییەو نزمترینیش 6. پلەی سەدییە. بەفرێکی زۆری لێدەبارێت و ماوەیەکی زۆریش دەمێنێتەوە.





بەرپرسیارێتیی فیکری و وردبوونەوەی لۆجیکیانە پەروەردە کرد. دوای فەلسەفە، کەمێك کۆمەڵناسی و هەروەها کەمێکیش ئەدەبیاتی یۆنان و ڕۆمم خوێند.

***دواتر لە زانکۆی وارشۆدا دەستتان بە وتنەوەی وانەی فەلسەفە کرد، بەڵام ڕژێمی کۆمۆنیستی، پاش کەوتنی پراگ لە ساڵی 1968دا، ئێوەی لەسەر ئەو کارە لابرد.**

لە مارتی 1968دا، دەوڵەت من و هەندێ لە هاوکارەکانمی لە زانکۆی وارشۆ دەرکرد. دەوڵەتی کۆمۆنیستی ئێمەی بەوە تاوانبار کرد کە لە بزووتنەوەی خوێندکارانی دژ بە دەوڵەت بەرپرسیارین و دژی ڕژێمی ستەمکار دەجەنگین. ئەم پاکسازییە گەورەیە بوو کە گورزێکی بە زەبری لە ژیانی ڕۆشنبیریی پۆڵەندە وەشاند. خەڵکێکی زۆر فڕێدرانە زیندانەوە و، کۆمەڵێك دەزگای ڕۆشنبیریی جیاجیاش فەوتێنران.

***ئێوە ناچار بوون پۆڵەندا جێبهێڵن و لە زانکۆ جیاوازەکانی ئەوروپا و ئەمریکادا وا نە بڵێنەوە. بەڵام بۆچی بڕیارتان دا لە ئۆکسفۆرد بمێننەوە و لێرە وانە بڵێنەوە؟**

دوای ئەوە لە کۆتاییەکانی ساڵی 1968دا پۆڵەندام جێهێشت" ساڵێکم لە زانکۆی ماك گیل مۆنتڕال بردە سەر و هەروەها ساڵێکیش لە زانکۆی بیرکلی بووم لە کالیفۆرنیا. دەمتوانی لە گەڵ شوێنی ئەمریکادا بمێنمەوە،بەڵام هەر ئەوەندە دەرفەتم بۆ هاتە پێشەوە ،وام پەسەند کرد بچم بۆ ئۆکسفۆرد. من ئەمریکام خۆش ویستووە، ئێستاش هەر خۆشم دەوێ، بەڵام وام پێ باشتر بوو لە ئەوروپادا بمێنمەوە، لەبەرئەوەی لەو ژینگە ڕۆشنبیرییەوە نزیکە کە پێی ئاشنام، هەروەها لە پۆڵەنداشەوە نزیکە.

***تایبەتمەندێتیەکانی وتنەوەی وانەی فەلسەفە لە ئۆکسفۆرد چیە؟ ئایا شتێك هەیە پێی بوترێ فەلسەفەی ئۆکسفۆرد؟**

ئەوەندەی من دەتوانم بیڵێم ئەوەیە کە هێشتا نەریتی شیکاری بەسەر فەلسەفەی ئۆکسفۆرددا زاڵە –کە منە لەمەدا هیچ ڕۆڵێکم نیە و تیا بەشدار نیم– هەرچەندە ڕاستیش نیە بڵێن هیچ شتێکی دیکە نیە. ڕێبازە کۆنەکان –وەکو ئەزموونگەرایی





لۆجیکی و فەلسەفەی زمانی ئاسایی- بەو شێوەیەی پێشوویان نابینرێن، بەڵام هێشتا ڕوحیەتی گشتیی نەریتی فەلسەفەی شیکاری هەر زاڵە.

***ئایا ژینگەی فەلسەفیی ئۆکسفۆرد، هیچ کارێکی کردۆتە سەر ئێوە؟**

نەخێر، ناتوانم بڵێم کە ژینگەی فەلسەفیی ئۆکسفۆرد کارێکی زۆری کردۆتە سەرم. من ڕێز لە نەریتی فەلسەفەی شیکاری دەگرم، بەڵام خۆم لەو نەریتەدا نابینمەوە.

***ئایا لە نێوان کاری فەلسەفی و کاری مێژوویتاندا نزیکییەك هەیە؟**

ناتوانم هێڵێکی ورد لە نێوان کاری فەلسەفی و کاری مێژوویيمدا بکێشم. هەندێ لە کتێبەکانم (بە تایبەتیش "ئامادەبوونی ئەفسانە، ئایین و ترسی میتافیزیکی") بە مانای وردی ئەم وشەیە مێژوویی نین، بەڵام ئەوەندەی پەیوەندیی بە پێشزەمینەی هەڵبەز و دابەزە مێژووییەکانی بیروباوەڕەکانەوە هەبێت" پەنا دەبەمە بەر لێکدانەوەی فەلسەفی. من تا ڕادەیەکی زۆر سەبارەت بە "فەلسەفەی کەلتوور"" مانای بیروباوەڕەکان، مانای فیکری ئایینی و میتافیزیکا لە تانوپۆی مێژووییدا بیردەکەمەوە. دەشێ باشتر بێت بڵێم کە کارە فەلسەفیەکانی من پەراوێزن لەسەر وەسفی مێژوویی.

***ئەمڕۆ ئێوە بە یەکێك لە ڕاڤەکارە سەرەکیەکانی فەلسەفەی مارکسیستی دەزانن. چۆن هەرەسی فەلسەفەی مارکسیزم لە جیهاندا لێك ئەدەیتەوە؟**

بێگومان مارکسیزم بەشێکی گرنگی ژیاری ئەورووپای پێکهێناوە و لەم ڕووەشەوە هەمیشە شایانی لێتۆژینەوەیە. مارکسیزم، وەکو یۆتۆپیا، وەکو بەرنامەیەك بۆ ئایندە، یان وەکوە پێشبینی بۆ گەشەسەندنی ژیار، هیچ پەیوەندییەکی بە مەسەلەکانی ئەمڕۆمانەوە نیە. تەواوی پێشبینیەکانی مارکس هەڵە دەرچوون، تەواوی بیروباوەڕە پەیوەستدارەکانی بە ئایندەی پرشنگداری کۆمۆنیزمەوە -کە بە شێوەیەکی کارامانە و بە ڕواڵەت فریودەرانە بوون- بوون بە ئامرازی ئایدیۆلۆژی بەدەست ڕژێمە تۆتالیتارەکانەوە. لەگەڵ ئەمەشدا، مارکس هەندێ بۆچوونی بایەخداری دەربارەی مێژووی کەلتوور لە دوای خۆی جێهێشتووە.





دەکرێ ئەم بۆچوونانە بەکارببرێن" بەبێ ئەوەی بە سیستمێکی گشتگیرەوە ببەسترێنەوە، سیستمێك کە لافی ئەوە لێبدات کە هەموو شتێکی لەخۆ گرتووە. مارکسیزم وەکو یەك "سیستم" مردووە، بەڵام وەکو دیاردەیەکی مێژوویی هێشتا جێی بایەخپێدانە. لەم دوو دەیەیەی دواییدا و بگرە پێشتریش، بەر لە هەرەسی کۆمۆنیزم لە ئەوروپادا، مارکسیزم هێشتا لە وڵاتە کۆمۆنیستیەکاندا جۆرێك لە ئایدیۆلۆژیای ناچاری یان نیمچە ناچاری بوو، بەڵام ئەو ڕوخساری لایەنداری لە هەقەی لە دەست دابوو و کەس بە ئایدیۆلۆژیایەکی جیددیی نەدەزانی.مارکسیزم بوو بە دیکۆرێکی بێبەها و هەرەسهێنانی تەواوی بە خۆیەوە دەبینی.

***بۆچوونی ئێوە سەبارەت بە بارودۆخە سیاسیەکانی وڵاتە کۆمۆنیستیەکانی جاران چیە؟**

زەحمەتە بتوانین بڵێین ئادەمیزاد لە دۆخی سیاسیی وڵاتە کۆمۆنیستیەکانی پێشوودا "خۆشحاڵ" بووە. چەند ساڵێك لەمەوبەر قسەکردن لەسەر "بازاڕ" یا "تایبەتمەندیسازی" ئاسان بوو، بەڵام کەس بۆئەوە نەدەچوو کە ئەم گۆڕانە تا چەند دژوار دەبێت. سەرباری ئەمە و، لەگەڵ ئەو هەموو کێشە گەورانەی وەکو بێکاری و هەژاری و ئارگیومێنتی سیاسیدا، ئاشکرایە کە ئابووری لە جیهانی پاش کۆمۆنیزمدا لە جووڵەدایە و هیوایەکی بەجێش هەیە کە لەم وڵاتانەدا دەزگا دیموکراتیەکان سەقامگیر بن. مەبەستم وڵاتانێکی وەکو پۆڵەندا و هەنگاریا و کۆماری چیکە. من ڕێ بە خۆم نادەم سەبارەت بە ڕوسیا و ئۆکرانیا پێشبینیی شتێك بکەم، ئەم وڵاتانە لە دۆخێکی تەواو دژواردان و هێشتا چارەنووسی دیموکراسی تیایاندا ڕوون نیە.

***ئێوە وەکو فەیلەسووف ناسراون، بەڵام شانۆنامە و کاری ئەدەبیش دەنووسن.**

بەڵی چەند شانۆنامەیەك و چەند کارێکی ئەدەبی –چەند چیرۆکێك–م نووسیوە. قەرار نەبوو ئەم کارانەم جێی ڕامانە فەلسەفیەکانم بگرنەوە، بەڵام هەردوو ئەو شێوە کارانەم پەیوەندییان بە یەکەوە هەیە. هەموویان تێڕامانن سەبارەت بە هەندێ کێشەی چارەسەرنەکراوی مرۆڤ.





***ئێوە یەکێکن لەو بیرمەندە ئەوروپاییە کەمانەی کە هەم سەر بە نەریتی ڕۆشنگەرین و هەم سەر بە کەلەپووری مەسیحی.**

بێگومان، مرۆڤ ناتوانێت سەر بە ژیاری ئەوروپی بێت، گەر لە هەمان کاتدا سەر بە نەریتی ڕۆشنگەری[8] و کەلەپووری مەسیحی نەبێت. ڕۆشنگەری و مەسیحیەت هەردووکیان پێکەوە ژیاری ئێمەیان دروستکردووە، لە کاتێکا بەردەوام لە ململانێیەکی بێکۆتاییشدان لەگەڵ یەکدا. ئەم ژیارە هەرگیز ناتوانێت بەشە بەیەك ناکۆکەکانی لە یەك پێکهاتەدا کۆبکاتەوە، بەڵام هەر ئەم دژایەتیە ناوەکیەشە کە وا دەکات ئەم ژیارە زیندوو بێت. ئەو ژیارانەی کە یەکتەرز و یەکپارچەن ناتوانن بەردەوام بن. ئیدی ئەم یەکپارچەییە بە زۆر دروست کرابێت یان لە ئەنجامی تەبایی و گونجانەوە هاتبێتە ئاراوە، ئەمجۆرە ژیارانە یان لەت و پەت دەبن و یان دەمرن.

***ئایا ئەمرۆ لاوان هان ئەدەیت کە بێنە بواری لێکۆڵینەوەی فەلسەفییەوە؟**

من هانی کەس نادەم بێتە بواری لێکۆڵینەوەی فەلسەفییەوە. بەڵام دان بەوەدا ئەنێم کە پرسیارە سەرەکیەکانی فەلسەفە -گەرچی بە گوێرەی خواست "چارەسەر" ناکرێن -وەسوەسەی ئەبەدیی هۆشی ئادەمیزادن و بایەخدان پێیان نابێتە هۆی لەناوبردنی ئەو ئەنجامانەی کە ئەزموونگەرا ڕادیکاڵەکان پێی دەگەن.

***ئایندەی هزری فەلسەفی چۆن دەبینن؟**

---

[8] **ڕۆشنگەری** enlightenment جوڵانەوەیەکی ڕۆشنبیریی سەدەی هەژدەیە, لە ئەوروپای خۆراوادا سەری هەڵداوە. سەراسیمەی عەقڵ و زانست بوو لە فەلسەفەو لێکۆڵینەوەی کەلتوری مرۆڤایەتی و جیهانی سروشتیدا. ڕۆشنگەریی ئاڕاستەیەکی سیاسیی ـ کۆمەڵایەتیی ـ زانستیی هەبووە, نوێنەرانی ئەم ڕەوتە هەوڵیانداوە ناتەواوییەکانی کۆمەڵگا دەستنیشان بکەن و چارەسەریشیان بۆ بدۆزنەوە, ئینجا ئاکارێتی و بیرکردنەوەی کۆمەڵگا بگۆڕن و پێشی بخەن و شێوازەکانی ژیان و گوزەرانی تاکەکان و گرووپەکان چاك بکەن. بیرو بۆچوونەکانی دادپەروەریی و یەکسانیی و زانینی زانستیی لەناو جەماوەردا بڵاو بکەنەوە. بیریارانی ڕۆشنگەریی باوەڕێکی زۆریان بە هۆش هەبووەو پێیان وابووە ڕۆڵی یەکلاییکەرەوە دەگێڕێت لە پێشخستنی کۆمەڵگادا. بیریارانی ڕۆشنگەریی بریتین لە ڕۆسۆ, ڤۆڵتێر, مۆنتسکیۆ, لیسینگ و هێردەر و گۆتەو گەلێکی تریش.





**نـاتوانین بـە شـێوەیەکی کـۆنکرێتی و بابەتیانـە سـەبارەت بـە ئاینـدەی هـزری فەلسەفی ڕادەربڕین. دەشێ بە سڵەوە بڵێین کە لـە ئێستادا چەند فەیلەسووفێکی هوشیار و بە توانا و باش هەن، بەڵام ئەوەندەی من دەتوانم ببیبینم، فەیلەسووفی گەورە و زیندوو، فەیلەسووفێك کە ئاسۆی تازەی بە ڕووی هزری فەلسەفیدا واڵا کردبێت" لە ئارادا نیە. لەبەرئەوە با ئاینده بە ئاینده خۆی بسپێرین.**

**ئابی** 1994

**سەرچاوە: نقد عقل مدرن, رامین جهانبگلو,** 1376 – **تهران.**





***ئێوە یەکێکن لە مامۆستایانی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست و لە ناوجەرگەی ئەوەدان کە ئەمڕۆ ناویان لێناوە "ڕێبازی مێژوویی فەرەنسا". چۆن بوو چوونە ناو بواری مێژووەوە و بۆچی بایەختان بە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست دا؟**

سەرچاوەی بایەخپێدانەکانی منیش" وەکو زۆر بایەخپێدانی دی، تا ڕادەیەك ئاڵۆز و نادیارە، تەنانەت بە لای خۆشمەوە. هەر لە تافی نەوجەوانیمەوە، کاتێ تەمەنم لە نێوان دە و چواردە ساڵیدا بوو" حەزم دەکرد ببم بە مامۆستا، بە تایبەتیش مامۆستای مێژوو، لەبەرئەوەی وام دەبینی کە مێژوو دەتوانێ پێگەمان لە جیهاندا ڕوون بکاتەوە و ، جگە لەمەش مێژوو بەلای منەوە لایەنێکی جوانی هەبوو کە منی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا. هەستیش دەکەم کاریگەریی سەرەکی لە سەرم دەگەڕێتەوە بۆ خوێندنەوەی ڕۆمانە مێژوویەیکانی والتەر سکۆت[9] لە لایەکەوە و، هەروەها بۆ یەکێك لە مامۆستا زۆر باشەکانم لە تەمەنی سیانزدە ساڵیمدا و لە وانەیەکدا کە تایبەت بوو بە وتنەوەی مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست.

***مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست چ بایەخ و سوودێکی سەبارەت بەو تێڕوانینە هەیە کە ئێمە بۆ جیهانی مۆدێرن هەمانە؟**

من بڕوام وایە کە جیهانی مۆدێرن لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەستی پێکردووە. لەبەرئەوەی منیش وەکو فیرنان برۆدیل باوەڕم بە گرنگیی بەردەوامی هەیە چ لە مێژوو و چ لە نووسینەوەی مێژوودا. هەروەها بڕوام وایە کە سەدەکانی ناوەڕاست قۆناغێکی درێژخایەن بووە کە تیایدا

---

[9] سکۆت، سێر والتەر 1771-1832 SirWalter Scott نوسەرێکی بەریتانییە، رۆمانی داستانیی و مێژوویی نوسیوە، کە ژانرێکی ئەدەبییەو خۆی دایهێناوە. لە رۆمانەکانی: وەیڤرلەی ـ 1814، ئاڤنهۆ ـ 1819.






ڕێنیسانسی[10] جۆراوجۆر ڕوویداوە و، ئەم ڕێنیسانسانەش لە سەدەکانی 9، 12، 14 و 16 دا ڕۆڵیان لە بزاوتی بەرەوپێشبردنی مۆدێرنیتەدا هەبووە. دەسکەوتەکانی سەدەکانی ناوەڕاست بۆ ئێمە بریتی بوون لە بزاڤی ئابووری، شار، بەکاربردنی ئەقڵ لە ڕێی فەلسەفەی سکولاستیکەوە و، شێوەی هونەری ڕۆمی و گۆتیک -کە یەکەمین دەرکەوتەکانی هونەری مۆدێرنن- و، لە بواری ئەدەبیشدا، ڕۆمان و شیعری لیریک، هەروەها سەدەکانی ناوەڕاست داهێنەری زانکۆ و سیستمی تاقیکردنەوەکان بووە. لەو بڕوایەدام کە بتوانین لە سەرەتای چاخی ئیسلامیشدا (مێژووی کۆچی)، گۆڕانکاریی لەم چەشنە لە ژیانی موسڵماناندا بدۆزینەوە، وێڕای ئەوەی کە جیهانی ئیسلام لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستەوە" نوقمی قەیرانێکی درێژخایەن بوو.

***بالزاك**[11] **دەیوت کە "سەدەی نۆزدەیەم تۆڵەی سەدەکانی ناوەڕاستی لە سووکایەتی پێکردنەکانی سەدەی هەژدەیەم سەندەوە". بە ڕای من سەدەی بیستەم هەنگاوێکی زیاتریشی ناوە و پایە و ئابرووی بۆ سەدەکانی ناوەڕاست گەڕاندۆتەوە.**

---

[10] **ڕێنیسانس** ,Renaissance بریتیە لەزنجیرەیەك لە جوڵانەوەی ئەدەبیی و کەلتوریی لەهەرسێ سەدەی 15, 16, 14, دا. ئەم جوڵانەوانە لەئیتالیاوە سەریان هەڵداو, بەرەو ئەڵمانیا, فەرەنسە, ئینگلتەرەو بەشەکانی تری ئەوروپا تەشەنەیان کرد. لێکۆڵینەوەی ژیارە مەزنەکانی یۆنانی دێرین و ڕۆمانەکان, بوون بەهۆی ئەوەی کەکەلتوری تایبەتی خۆیان بەرهەم بهێنن و بن بەکێباری ئەو ژیارە دێرینانە. بیرکردنەوەی ئەو بیریارانە کەوتە ژێر کاریگەریی مرۆڤدۆستییەوە . هیومانیزم, کە جەخت دەکاتە سەر بایەخی تاك. هیومانیستەکانی ڕێنیسانس باوەڕیان وابوو کەتوانرێت لەرێی ڕۆشنبیریی کلاسیکەوە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پیش بخرێت. ئەم ڕۆشنبیرییە سەرچاوەی خۆی لەنێکستە دێرینەکانەوە وەرگیراوەو جەخت دەکاتە سەر شیعرو مێژوو. ڕەوانبێژیی , لەگەڵ فەلسەفەی ئاکارییدا.

[11] بالزاك ( *Balzac* 1799 . 1850 ) ڕۆماننوسێکی نایودارى فەڕەنسایە , زۆر بە وردی لە ئاکاری سەردەمەکەی خۆی کۆڵیوەتەوە , دیارترینی کارەکانی بریتین لە کۆمیدیای مرۆیی و ئۆژینی گراندە .





سووکایەتی کردن بە سەدەکانی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە بۆ پێش سەدەی هەژدەیەم . هیومانیستەکان بوون کە نەیانتوانیڕەسەنایەتیو داهێنانیسەدەکانی ناوەڕاست بدۆزنەوەو ئەرکی خۆیان بەرامبەر بەم قۆناغە بەجێ بهێنن.ڕاستە کە لە سەدەی پانزدەیەمەوە فەلسەفەی سکولاستیك ڕوو لە نەمان بوو،بەلاّم پاشماوەی ژیاری سەدەکانی ناوەڕاست هەر بەردەوام بوو. چاخی ڕۆشنگەری نەیتوانی پێشکەوتنەکانی ئەقڵ لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دیاری بکات و لە پێناوی ئەو کاریکاتێرەی کە خۆی لەو بارەیەوە دروستی کردبوو سووکایەتیی بەم لایەنە کرد. فەیلەسووفەکان ترۆپکی دوژمنایەتیکردنی ئەقڵیان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دەبینیەوە. لە ڕاستیدا بزاڤی ڕۆمانتیزم پلەوپایەی بۆ سەدەکانی ناوەڕاست گەڕاندەوە، بەلاّم لەسەر هەمان بناغە، لەبەرئەوەی ڕۆمانتیزمیش بەرگریی لە دژایەتیکردنی ئەقڵ دەکرد. بزاڤی ڕۆمانتیزم ئەگەر لەبەرئەوە گرنگە کە دەرکی بە پایەی جوانناسی و هەستیاریی سەدەکانی ناوەڕاست کردووە" ئەوا لە هەمان کاتدا وێنەیەکی هەڵەشی سەبارەت بەو قۆناغە بە دەستەوە داوە و تیایدا تۆوی ئایدیۆلۆژیایەکی دۆزیوەتەوە کە بۆ سەدەی بیستەم خەتەرناکە. لە ڕاستیدا سەدەی بیستەم هەنگاوێکی زیاتری ناوە و بە شێوەیەکی باشتر ئەدگارە ڕاستەقینەکانی سەدەکانی ناوەڕاست دەناسێت و توانیویەتی سەرچاوەی بەها و بیروڕاکانی ئێمەی تیا دیاری بکات. لەگەڵ سەدەی بیستەمدا قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاست بە شێوەیەکی کردەیی و واقیعی گۆڕا بۆ منالّیی ئێمە، بەلاّم نابێ ئەوەشمان بیر بچێت کە هێشتا ژنان و پیاوانێکی زۆر هەن کە لە ماهیەتی سەدەکانی ناوەڕاست بێئاگان و بە سووکییەوە سەیری دەکەن، یان بە هەڵە ئەو قۆناغەیان خۆشدەوێت.

***ئایا دەتوانین قسە لەسەر "گەڕانەوە"ی سەدەکانی ناوەڕاست بکەین، وەك چۆن قسە لەسەر "گەڕانەوەی ڕوحانیەت" دەکەین، یان بڕواتان بە بەردەوامی مێژوویی هەیە؟**

من باوەڕم بە گەڕانەوە نییە لە مێژوودا، نە گەڕانەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست نە بۆ هیچ قۆناغێکی دی. چەمکی گەڕانەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست، کە لە ڕاستیدا هەندێ نیمچە ڕۆشنبیر بانگەشەی بۆ ئەکەن و برەوی پێ ئەدەن" مەسەلەی گەڕانەوەی سووکایەتیی سەدەکانی ناوەڕاست یان گەڕانەوەی ئەو تێگەیشتنە هەڵەیەیە سەبارەت بە سەدەکانی ناوەڕاست کە وەکو چاخی ئیمان و دژ بە ئەقڵ پێناسەی دەکات. من وەکو خۆم وام لا باشترە کە وێڕای قەیرانە قووڵ و ئازاربەخشەکان، باسی بەردەوامبوونی بەرەو پێشچوونی سەدەکانی ناوەڕاست بکەم لەم ڕۆژانەدا و ئومێدەواریشم سبەینێش ئەم کارە هەر بەردەوام بێت.

***لە سەدەکانی ناوەڕاستدا یەکپارچەییەکی ڕۆحی هەبوو کە لە قاڵبی مەسیحیەتدا خۆی دەنواند. بە بڕوای ئێوە لە ئەورووپای ئەمڕۆدا لەو یەکپارچەییە ڕۆحییە چی ماوەتەوە؟ چۆن دەتوانرێ ئەم کەلەپوورە لە قاڵبی بەرنامەیەکی سیاسی- مێژووییدا فۆرمەلە بکرێ و گەشەی پێ بدرێ؟**

بێ هیچ گومانێك مەسیحیەت نەك هەر مایەی یەکپارچەیی ڕۆحیی سەدەکانی ناوەڕاست بوو" بەڵکو مایەی یەکپارچەیی کەلتووریشی بوو. بە بڕوای من تا ئێستاش بەهاکانی مەسیحیەت لە ئەورووپای ئەمڕۆدا کۆڵەکەی شتە زەینی و هەستیەکانە، بەڵام ڕێ و ڕەسمە ئایینیەکانی مەسیحیەت بە شێوەیەکی دیار پاشەکشێیان کردووە. ئەوەی ماوەتەوە مەسیحیەتێکی بە دنیاییبووە، زیاتر کۆمەڵەیەکی ئاکارییە نەك ئایینێك و، من هیوام وایە کە ئەم ڕەوتی پاڵاوتنە ئاکارییەی مەسیحیەت بەردەوام بێت. ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن بووژاندنەوەی ژیانی ڕۆحی، جگە لە چەند ئاوارتەیەکی گرنگ -وەکو کۆمەڵگای * لەناو لاواندا- هەوڵێکی نائەقڵانییە بەرەو گروهەکان (فیرقەکان)، مەزەبایەتیەکی نائەقڵانی و خەتەرناك و، هەندێ جار تێکەڵە بە خیانەتیش، کە بە بڕوای من پەیوەندییەکی زۆر کەمی بە مەسیحیەتەوە هەیە و ڕەگوڕیشەی بۆ دەرەوەی مەسیحیەت دەگەڕێتەوە. ئەوەی سەدەکانی





ناوەڕاست دەتوانێ لەم ڕۆژگارەدا بۆ بەرنامەیەکی سیاسی- مێژوویی بکات، لە بنەڕەتدا گرنگیی ئەو یەکپارچەییە ئەوروپاییەیە کە لەسەر کۆمەڵێك کەلەپووری مێژوویی بنیاد نراوە، ئەو کەلەپوورانەی کە خۆیشیان هەر لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە یەکێتی و فرەچەشنییان تێکەڵ بە یەك کردووە و پێویستە بە ئاراستەی ڕەوایی و کرانەوەی زیاترەوە بگۆڕێن. هەڵبەت سەدەکانی ناوەڕاست خاوەنی دەزگا و کار و کردەوەی خراپیش بووە، وەکو پشکنینی بیروباوەڕەکان یان گیتۆ.

***ئایا بە بڕوای ئێوە پاش هەرەسی مارکسیزم پێویست دەکات پێناسەیەکی سەرلەنوێی ئەوروپا بکرێتەوە؟**

هەرەسی مارکسیزم ئازادکەری ئەوروپا و ئەوروپییەکانە، هەروەکو چۆن دوا جەنگی جیهانی ئەوانی لە کۆتی فاشیزم و نازیزم ڕزگار کرد.ئەوروپا ناتوانێت لەگەڵ ئایدیۆلۆژیا و دەوڵەتە تۆتالیتارەکاندا هەڵبکات. ئەوروپای هیتلەر نەفیکردنی ئەوروپا بوو و کۆمۆنیزمی سۆڤێتیش نیوەی ئەوروپای گەندەڵ و خراپ کردبوو. لە بری سەرلەنوێ پێناسەکردنەوە، وای بە باش دەزانم سەبارەت بە ئازادکردن قسە بکەین.

***مێژوونووسێکی وەك ئێوە چۆن دەڕوانێتە قەیرانی هەنووکەیی میللەتانی یوگوسلاڤیای پێشوو؟**

قەیرانی خەماویی یوگوسلاڤیای پێشوو بەرهەمێکی گەنیوی مێژووە. لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە ئەوروپا کە ژیارێکی تاقانە و یەکپارچەی پێکدەهێنا، لە هەمان کاتدا بەسەر کۆمەڵێك نەتەوەدا دابەش ببوو کە شەڕ لە نێوانیاندا ڕێسا بوو. لە سەدەی نۆزدەیەمدا ناسیونالیزم بە دوو سیمای هاودژەوە سەری هەڵدا. یەکێکیان پێشکەوتن بوو، کە لە مافی میللەتاندا لە دیاریکردنی چارەنووسیاندا خۆی دەنواند، ئەوی تریان دواکەوتن بوو، کە بریتی بوو لە بەخشینی سیمایەکی نەفرەتئەنگێز بە بەها نەتەوەییەکان و کردنیان بە ئامرازێك بۆ دەسدرێژیکردنە سەر ئەوانی تر و کۆنترۆڵ کردنیان،





بە تایبەتیش هاوسێکان. دەسەڵاتی دەوڵەتە دیکتاتۆرەکان لە ناوچەی بەڵقاندا بوون بە ڕێگر لە بەردەم جووڵەکردنی ئەم ناوچەیەی ئەورووپادا بەرەو ناسیونالیزم. ئیمپراتۆریەتی ئۆتریشی -مەجەڕی (واتە نەمسایی- هەنگاری)ی خانەدانانی هابزسبۆرگ و ئیمپراتۆریەتی (قەیسەریی- هەنگاری)ی خانەدانانی هابزسبۆرگ و ئیمپراتۆریەتی قەیسەریی ڕووسیا، لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی زیاتر ڕێیان لە پێکهاتنی دەوڵەتی سەربەخۆی یاسایی گرت. دۆخەکەش کاتێ خراپتر بوو کە ئیمپراتۆریەتی سۆڤێتی ئیمپریالیزمی کۆنی لەگەڵ ئیمپریالیزمی نوێی مارکسیست- لینینیستی تێکەڵ بە یەك کرد. یوگوسلاڤیای پێشوو، کە ئاوا ڕکێفکرابوو، ئەمڕۆ بە توندوتیژییەکی زیاترەوە دەتەقێتەوە. ئەم دۆخەش نیشاندەری کۆمەڵێك مەترسییە کە دەسەڵاتە ئیمپریالیستیەکان نەك هەر بەسەر هەندێ نەتەوەدا بەڵکو بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا سەپاندوویانە. یوگوسلاڤیای پێشوو ئەمڕۆ بەرگەی توندوتیژیی کۆمەڵێك ئازاری جۆراوجۆر دەگرێت کە سەدەکانی نۆزدە و بیست خوڵقێنەرین. ئەم دۆخە، کە نەتەوەکان بەرپرسی پلەیەکی نین، لە بەرەبەیانی سەدەی بیست و یەکدا دیاردەکانی سەدەی نۆزدەیەم دەخاتە ڕوو. لە مێژوودا هیچ شتێك لە ناوەخت (anachronisme) خراپتر نییە. ئەم دۆخە پڕئازارە نیشاندەری پێویستبوونە بە دروستکردنی ئەورووپایەکی یەکگرتوو. ئەورووپای هەنووکە بۆ هاوکاریکردنی ڕێگەچارەی هێمن و عادیلانە لەو ناوچانەدا کە مێژوو تیایاندا بۆمبی درەنگی چاندووە" وەسیلەی پێویستی لەبەردەستدا نییە. لەبەرئەمە، بەرلەوەی پەنا ببرێتە بەر زۆر، پێویستە پێشنیازی چوارچێوەیەك بکرێ کە تیایدا ئاشتی و، سەرکەوتن و لێکبوردن بۆ هەموو گروپە نەتەوەیی و میللیەکانی ئەورووپا دابین بکرێ.





***ئێوە ئێستا بە کۆمەڵێك نووسراودا دەچنەوە کە سەبارەت بە مێژووی ئەوروپان و بە زمانە جیاوازەکانی ئەوروپا چاپ دەبن. ئایا ئەمە درێژەی کارەکانتانە سەبارەت بە مەسەلە و شێوازە نوێیەکانی مێژوو، بۆ نموونە وەکو کتێبەکەتان "مێژووی نوێ"؟**

ئامانجی ئەم کۆمەڵە نووسراوە ڕوونکردنەوەی ڕەگوڕیشە مێژووییەکانی مەسەلەکانی ئەوروپا و توانای زیاتر ناسینی ئەو شتانەیە کە لەم کەلەپوورە مێژووییەدا دەبنە هۆی ئاسانکاری یان ڕێگرتن لە بەردەم دروستکردنی یەکێتیی ئەوروپیدا. بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش، دەبێ لە زووەوە مێژوو لە بەرچاوبگرین، لانی کەم لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە. هەر بۆ ئەم مەبەستە پێویستە بایەخ بە لێکۆڵینەوەی بوارەکانی مرۆناسی (واتە ئەنترۆپۆلۆژیا)ی مێژووییش بدەین. واتە ئەو بوارانەی کە لە قووڵاییاندا، بە یەکداچوونەکانی خەڵکی ئەوروپا، مەسەلە شوێنی و زەمانییەکان و مەسەلەکانی ژیانی ڕۆژانە ڕۆڵیان بینیوە. (بەو دواییە کتێبێکمان سەبارەت بە چێشت و خۆراکی ئەوروپی لە سەدەی پێنجەم بەدواوە بڵاوکردوە، هەروەها کتێبێکی تر دەربارەی ژینگە لە ئامادەبووندایە). بە بڕوای من تەنها ئاراستەکانی مێژووی وێ دەتوانێ ڕووناکییەکی مێژوویی لەبار بۆ بیناکردنی یەکێتیی ئەوروپا سازبکات.

***ئێوە هاوکاری گۆڤاری "ئەناڵ "یشن کە مارك بلۆك و لوسین فیڤر لە ساڵی 1929دا دایانمەزراند. ئەمڕۆ، پاش 65 ساڵ، چۆن پێناسەی ئەقڵیەتی گۆڤاری "ئەناڵ" دەکەن؟**

مێژوو، بەر لە نیو سەدە زیاتر، دەرگای گفتوگۆی لەگەڵ زانستە کۆمەڵایەتییەکانی تردا کردۆتەوە و لەم ڕێگایەشەوە ژیانێکی تازەی بەدەستهێناوە. گۆڤاری "ئەناڵ" ڕۆڵی سەرەکیی لەم جووڵەیەی مێژوودا بینیوە. ئەمڕۆ هەرچی زانستە کۆمەڵایەتییەکانە دوچاری قەیرانێکی گشتی بوون، لەبەرئەوەی کۆمەڵگا خۆی و، تەنانەت چەمکی کۆمەڵگاش دووچاری قەیران بووە. مێژووش وەکو یەکێك لە زانستە کۆمەڵایەتیەکان" لەم قەیرانە

بەدەر نییە. دەستەیەکی بەڕێوەبەری تازەی گۆڤارەکە سەرقاڵی دۆزینەوەی ڕێگەچارەن بۆ ڕزگاربوون لەو عادەت و خووانە کە دوای 65 ساڵ لە دەرچوون هەرەشە لە گۆڤارەکە دەکەن و، هەوڵی گۆڕینی بۆ شوێنێك کە بتوانرێ لێیەوە سەیر زانستی مێژوو بکرێ و، دیسانیشەوە هەر لە ڕێی گفتوگۆوە لەگەڵ هەموو زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا و نزیکبوونەوە و مامەڵەکردن لەگەڵ کۆمەڵگا و خواستەکانیدا و بۆ ئەم مەبەستەش دەستەکە هەندێ پێشنیازی بۆ خستنە جووڵەی گۆڤارەکە خستەڕوو. بەڵام ئامانجی ئێمە شۆڕش نییە لە مێژوودا. لەبەرئەوەی وا نایەتە بەرچاو ئەو دۆخە پێویست بە شۆڕش بکات کە دامەزرێنەرانی ئەناڵ لە ساڵی 1929دا بە بەراورد لەگەڵ ئەو مێژووە دیاریکراوەی ئەوسادا ناچار بوون لەگەڵیدا بەیەکدا بێن. لە ژمارەکانی دوو یا سێ ساڵی ئایندەدا دەتوانین بڕیار لەسەرئەوە بدەین کە ئایا "ئەناڵ" لەو جووڵەیەیدا سەرکەوتوو بووە یان نا. بەهەرحاڵ "ئەناڵ" هەوڵدەدات بەسەر ڕەوتی بەش بەشکردنی مێژوودا بۆ مێژووی تایبەت و گۆڤاری تایبەت، یان بە پێچەوانەوە، بەسەر یەکخستن و نیمچە یەکپارچەکردنی گۆڤارە گشتیە بێ بناغە مێژوویی و ڕەخنە جیدییەکاندا، زاڵ بێت. ئێمە لە هەموو کاتێ زیاتر پەیڕەوی لە شێوازی ئازادانەی لێکۆڵینەوەی مێژوو دەکەین، ئەمەش لە ڕێی قبووڵکردنی ئاقار وباسە جیاوازوجۆراوجۆرەکانەوە لە گۆڤارەکەداو تێکەڵکردنیان بە یەکتریو، لەم ڕەوتەشدا،ئەوەی کە وا دێتە بەرچاونوێترین و جیددیترین ئاقارو لێکۆڵینەوەیە لە بواری مێژوودا، قبووڵی دەکەین.

*بە ڕواڵەت لەناو مێژوونووسەکانی "ئەناڵ"دا مەیلێکی تازە بۆ مێژووی -گێڕانەوە- و بە تایبەتیش ژیننامە هاتۆتە ئاراوە. مارك فرۆ و ژیننامەی پەتن ی نووسی و خۆشتان ژیننامەی "سان لویس" دەنووسن. ئەمرۆ لەم "مێژوە نوێیە"دا جێی ژیننامە چییە؟





ژیننامـه لـه "ئـەناڵ"دا بابـەتێکی تـازە نییـە. لۆسـین فیڤـر چـەند کتێبێکـی ژینامـەیی لەسـەر لۆتـەر و مارگرێـت دۆناڤـارا نووسـیوە. مـارك بلـۆکیش[12] بەرلـــەوەی بکـــوژرێ نووســــیبووی کــــە کۆمەڵناســــیەکەی دۆرکهــــایم مێژوونووسەکەی لە تاکەکەسەکەدا زیاتر شێواندووە. هەر مێژوونووسێك لە وەختێ لە وەختەکاندا پێویستی بەوەیە کە هەندێ دیمـەنی گێڕانەوە بخاتـە نـاو کارەکەیـەوە. بـەڵام لـە هەمانکاتـدا پێویسـتە لـە ئاسـت ئـەو مێـژووە -گێڕانەوەییـەدا بـەدگومان بێـت" کـە جگـە لـە مێژوویـەکی ئایـدیۆلۆژیایی ناهوشـیارانە و پۆشـراو، شـتێکی دیکـە نییـە. مێژوونووسـانی "ئـەناڵ" دوژمنـی سـەرەکیی ئـەو شـتە بـوون کـە لۆسـین فیڤـر نـاوی نـابوو مێـژووی -سـندووق. هەنـدێکمان وا بیردەکاتـەوە کـە ئـەمڕۆ ئـامرازی پێویسـتی بـۆ بەکارهێنانی شێوازەکانی ژیننامەیی لەبەردەستدایە، بەڵام ئامانج لە مێـژوو بریتی نییە لە کردنەوەی سندووقی "ژیننامە".

***ئێستا ئێوە سەرقاڵی چین؟**

---

[12] بلـۆك یـان بلـۆخ، ئێرنسـت (1885-1977) Bloch, Ernest فەیلەسـوفێکی ئەڵمانییـە، زۆرجـار دەبەسترێتەوە بـە قوتابخانـەی فرانکفۆرتـەوە، چونکە خوێندنـەوەکانی بلـۆخ بـۆ مـارکس هاوشـێوەی خوێندنـەوەکانی ئـەو قوتابخانەیەیـە. لـە سـاڵی 1917 دا سەردانی سویسرە دەکات. لە بیستەکاندا ئادۆرنۆ و بێنجامین دەبینێت. ئەمیش لە ساڵی 1933 دا بە ناچاریی ئەڵمانیا جێدەهێڵێت، چونکە جولەکە بووە. ئیتر لە نێوانی سویسرە و فەرەنســا و نەمســاو چیکۆســلۆڤاکیادا دێــت و دەچــێت و دە ســاڵیش لــە ویلایەتــە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێت. لە ساڵی 1948 دا رازیی بوو ببێت بە سەرپەرشتیاری پـەیمانگای لیپزیگـی فەلسـەفی بـۆ بەشـداریکردن لـە جوڵانـەوەی دیموکراسـییانەی پـاش نازیزمـدا. بـەڵام لـە سـاڵی 1961 دا و دوای بینـاکردنی دیـواری بـەرلین، بـە راشـکاویی رایگەیاند کە بەهیچ جۆرێك نایەوێت بگەڕێتەوە بۆ ئەڵمانیای دیموکراسی، ئیتر رۆژانی خـۆی بـە وانەبێـژیی لـە تۆبینگـان سـەرف کـرد. نوسـینە سـەرەکییەکانی: بیری یۆتۆپیا ــ 1918، میراتیـی ئـەم زەمانـە ــ 1935، لێکۆڵینەوەیـەك لـە سـایکۆلۆجیای جـەماوەری فاشیست بە شێوەیەکی فینۆمینۆلۆجیی ، لەگەڵ پرەنسیپی هیوا ـ 1954.





بەم زووانە هەڵەبڕیی دەسنووسی ژیننامەی سان لویس تەواو دەکەم. هەروەها لەگەڵ هاوڕێ و هاوکارمدا "ژ، ش. شمیت" سەرگەرمی "کەلتووری خەسڵەتە ڕەسەنەکانی خۆرئاوا لە سەدەکانی ناوەڕستدا"ین -کە خۆمان هەندێ لە وتارەکانی دەنووسین-، سەبارەت بە ڕەوتی فیکریی مارک بلۆك دەخوێنمەوە و لێی دەتۆژمەوە، هەروەها دەمەوێ سەرلەنوێ لە دیاردەی زانکۆ لە ئەوروپای سەدەکانی 12 تا 19 بکۆڵمەوە.

***پاش پەنجا ساڵ زیاتر لە لێکۆڵینەوە، ئێستا چۆن سەیری کارەکانی خۆت دەکەیت.**

ئێستاش وا پەسەند دەکەم زیاتر سەیری پێشەوەم بکەم نەك پشتی سەرم. هەمیشە خۆشحاڵ بووم بەوەی لێکۆڵینەوە و بەگشتیکردن و فێرگوزاریم تێکەڵ بە یەك کردووە. کاتێکیش ئەو پێشکەوتنە گەورانە دەبینم کە مێژوو لە ساڵانی قوتابێتیمدا لەم سێ بوارەدا بە ئەنجامی گەیاندووە و، منیش ئەگەر ڕۆڵێکی زۆر زۆر کەمم تیایدا هەبووبێت، هەست بە ڕەزامەندی دەکەم.

**ك** 1995/1

**سەرچاوە: نقد عقل مدرن**, **رامین جهانبگلو**, 1376 – **تهران.**





***لە كتێبی (دەفتەری شەو)دا نووسیوتانە:"من ناوی خۆم لە كتێبەكانی زماندا هێناوەتە دەرەوە،كەچی هێشتا ئەم ناوە لەو كتێبانەدا هەر دەبینریٚ." كەواتە ئێوە بە بیٚ ئەوەی بشتانەویٚ ، بوونەتە نووسەرێكی بەناوبانگ؟**

من شتەكانم بەناوی خوازراوی "سۆلەرز"ەوە دەنووسم كە كە لە فەرهەنگێكی لاتینیدا دۆزیمەوە،شتێكی سەیریشە كە ئەو وشە لاتینەی بۆ دروستكردنی شوناسی نووسەرێك بەكاربرا، ئێستا لە فەرهەنگێكی فەرەنسیدا دەیبینینەوە. ئەم بابەتە مەسەلەی "ناوی خوازراو" لە ئەدەبدا دەخاتە ڕوو،كە مەسەلەیەكە جێی سەرنجە. ئەمە نەریتێكی فەرەنسایییە. زۆر سەیرە كە لە ئەدەبی فەرەنسیدا ناوی خوازراو زۆرەو ناوی بەهێزیشن. بە تایبەتی لێرەدا دەتوانین ناوی بەناوبانگترین ناوی خوازراو بەرین كە ئەویش ڤۆڵتێرە، هەروەكو دەزانن ناوی ڕاستەقینەی ئەو ئارۆئە بوو و ئەویش ئەو ناوە سەیرەی بۆ خۆی هەڵبژارد كە لە هەموو دونیادا پێی بەناوبانگ بوو. لە ساڵی 1994 دا بە بۆنەی سێسەدساڵەی لەدایكبوونی ڤۆڵتێرەوە ئاهەنگ دەگێڕن ( ئەم چاوپێكەوتنە ساڵی 1993 سازدراوە "وەرگێڕ") و بڕیارە بەم بۆنەیەوە كۆبوونەوەو بۆنەی زۆر سازبكریٚو وتاری زۆر بنووسریٚ. ئەمە كاتێكی زۆر باشە كە لە كۆتایی سەدەی بیستەمدا لە فەرەنسادا و پاش كۆمەڵێك گۆڕانی گرنگ لەم سەدەیەدا،هەوڵ بدەین لە خۆمان بپرسین ئەم ڤۆڵتێرە كیٚ بوو، كە هێشتا هەم كۆنەپەرستان و هەم ڕاستڕەوانیش بە گومانی خراپەوە لێی دەڕوانن-لەبەر ئەوەی لە هەمانكاتدا كە باوەڕدار بوو، دژ بە دۆگمای دینی دەجەنگا-هەروەها چەپڕەوەكانیش-لەبر ئەوەی بە دەوڵەمەندی مرد. خۆت دەزانیت لە فەرەنسادا دژایەتییەك لە نێوان ڤۆڵتێرو ڕۆسۆدا هەیە و تا ئێستاش هەر بەردەوامە. كەواتە منیش وەكو نووسەرێك ناوی خوازراو سەرنجی ڕاكێشام و، لەبەر ئەوەی منیش لەم سیستمی ناوی خوازراوەدا





**دەژیم، هەروەکو ڤۆڵتێرو مۆلێر[13] و بە تایبەتیش ستاندال[14] کە چەند ناوێکی خوازراوی هەبوو. من زۆر بایەخ بەم مەسەلەی جیاوازیی شوناسە دەدەم. بۆ نموونە لە دوا کتێبمدا "نهێنی" گێڕەرەوە ناوێکی زۆر کورتی هەیە: ژان کلیمان، ئەم کە کارمەندێکی نهێنیهەڵگرە، ئەو ناوەی تێگەیشتنێکی دەداتێ سەبارەت بە جیهان کە گەڵێ جیاوازە لە تێگەیشتنی کەسێك کە لەبەر ناوە تایبەتییەکەی خۆی زیاد لە پێویست لە خۆی دەچێت. بەمجۆرە دەکرێ جیهانێکی خەیاڵیی تەواو تایبەت پێکبێت.**

***ئایا ئەم شێوەیە دانانی بکەرێکی دی نییە بەرامبەر بە خود؟**

**ئەمە شێوەیەکە بۆ فراوانکردنی جیهانی خەیاڵی تایبەتی و خستنیە ناو دۆخی جووڵەوگۆڕان و قەیران و ئاڵوگۆڕەوە. بۆ نموونە سیلینیش هەر وایە، سیلینیش وەکو مۆلێرو ڤۆڵتێر وایە. مەسەلەی ناوی خوازراو مەسەلەیەکە لەناو خودی زمانی فەرەنسیدا هەیە.**

***بەڵام ئایا ئەو ڕاستییەی کە تۆ ئێستا بوویتەتە نووسەرێکی جیهانی و لە دونیادا ناسراویت،تێڕوانینی ئێوەی بۆ بەرپرسیارێتیی نووسەر گۆڕیوە؟**

**نەخێر بە هیچ جۆرێك، چونکە من لەو بڕوایەدام کە بەرپرسیارێتیی سەرەکیی نووسەر لە ئیلتیزامیدایە بە جوانناسی و شێوەی نووسینییەوە. پاشان ناودژێتییەکی زۆر هەیە کە لەگەڵ ژیاری وێنەییدا پەرە دەسێنێت و، ئەویش**

---

[13] مۆلێر 1622-1673 **Mo-liere Jean Baptiste Poquelin.** شانۆنامەنوسێکی فەرەنسییە, ژمارەیەك کۆمیدیای زۆر قەشەنگی نوسیوە, لەوانە, تارتۆف ــ 1664, رقهەڵگرتوو ــ 1666, خانەدانی بۆرژوازی.

[14] ستاندال Stendhal ناوی خواستراوی ماری هینری بێلە (1783-1842) رۆماننوس و رەخنەگرێکی فەرەنسییە, کارەکانی پڕن لەهەستوسۆزی وروژاوی پەشۆکاو کەبەزۆریی رەنگدانەوەی کەسێتی نوسەرەکەن, رۆمانسییەت سەراپای نوسینەکانی گرتۆتەوەو بایەخێکی زۆری داوە بەلایەنی سایکۆلۆجی کەسایەتییەکانی, کە بەوسەردەمەدا کارێکی نامۆ بووە. لەسەرەتای لاویدا لەئۆفیسەکانی وەزارەتی جەنگدا کاری کردووە. بەڵام لەساڵی 1830 بەدواوە خۆی تەرخانکردووە بۆ نوسین و رەخنەگرتنی ئەدەبی و مۆسیقی و هونەریی. هەر لەوساڵەدا رۆمانی سورەو رەشەی نوسیوە, پاشان دێری پارما 1839و چەند رۆمانێکی تریش.





ئەوەیــە کــە زیــاتر لــە جــاران وێنــەی دەخەنــە بــری خــۆی. لــەم دواییــەدا پێشەکییەکم بۆ کتێبێکی ژان ژینیٚ نووسیوەوتیایدا باسی یادوەریی ڕۆژێکم کردووە کە هەوڵمدا بەرامبەر خەڵکێکی تا ڕادەیەك زۆر سەبارەت بە ژان ژینیٚ بدوێم و ئەو پرسیارانەی کە دەشکران دەربارەی ئەوە بوو کە ئامادەگیی ژینیٚ لە فلاّن تانوپۆی سیاسی یا کۆمەڵایەتیو یان تەنانەت لە تەلەفزیۆندا ڕوون بکەمەوە. وای بۆ دەچم کە مەسەلەی وێنە یەکێکە لە مەسەلە بنەڕەتییەکانی ژیاری ئێمە، بۆیە ئێستا وێنەی نووسەر جێی خۆی دەگرێتەوە.وێنەی نووسەر زیاتر لە جاران گەورە دەکرێتەوەودەتوانین بڵێین کە خوێندنەوە لە پاشەکشێدایەوله حاڵەتێکی واشدا دەتوانیت ناوی ڤیکتۆر هۆگۆ[15] یا ڤۆڵتێر بەریت بەبیٚ ئەوەی کس شتێکیانی خوێندبێتەوە. بە واتایەکی دی، وردە وردە دەقی نووسەرەکان دەدرێنە دەست لەبیرچوونەوەو، لەبری ئەوە وێنەکان زیاتر جێیان دەگرنەوە. بەڵام ئەم دۆخە بەسەر هەموو کەلتوورەکەشدا دەسەپیٚ. کەواتە مەسەلەیەکی زۆر جیددییە. پاشان پەیوەندیی نووسەریش بە سیاسەتەوە حاڵەتێکی وێنەیی بەخۆوە گرتووە، بۆ نموونە لە فەرەنسادا نووسەرانێکی زۆر ناوداری وەکو شاتوبریان و بنژامین کۆنستان و فرانسوا مۆریاك و سارتەرو زۆری تریش ئەم مۆرکەیان بەخۆوە گرتووە.لەم حاڵەتەدا دەبینین کە ئەم مسەلەیە نەریتێکی زۆر بەهێزی فەرەنساشە. بۆ نموونە، سەرنج بدەنە نووسینە سیاسیەکانی ڤۆڵتێر کە بەرەچاوکردنی ئیمکاناتە سنووردارەکانی ئەو سەردەمە ،زۆر بەهێز بوون. لێرەدا پێویستە لە ئاسەوارەکانی ئەو نووسەرانەدا بە باشی ئەو شتە هەڵبسەنگێنین کە تایبەتە بە سیاسەت و زیانیش بە داهێنانی ئەدەبی دەگەیەنێت.حاڵەتی وەکو سارتەرومالرۆ هەیە کە لە کارەکانیاندا چالاکیی ئەدەبی لە ئاست چالاکیی

---

[15] **هۆگۆ**, ڤیکتۆر ماری (1802-1885) Hugo, Victor Marie شاعیرو رۆماننوس و شانۆنامەنوسی فەرەنسییە, نوسینەکانی گەورەترین کاریگەرییان لەسەر بزوتنەوەی رۆمانسیزم داناوە.





سیاسیدا نەزۆك بووە. هەربۆیە لەو ساتەوەی کە دەمانەوێ ببینە نووسەرێکی ئەم سەردەمە،واتە کۆتایی سەدەی بیستەم،دەبێ تەواو ئاگامان لەم یارییە بێت.بەواتایەکی دی دەبێ ئەم پرسیارانە بکەین:چی دەنووسین؟وێنە چیت لەگەڵدا دەکات تا وات لێ بکات واز لە نووسین بێنیت؟دەستێوەردانە سیاسیوئابوورییەکانی جیهان دەتوانن چ کارێك بکەنە سەر نووسەر؟ئەمانەش بەم پرسیارەمان دەگەیەنن:هەر نووسەرێك لە چ دۆخێکی مێژووییدایە؟

***بەڵام ئایا بەلای ئێوەوە ئیلیتیزامبوونی نووسەر لەم سەردەمەدا هیچ مانایەکی هەیە؟**

بێگومان. ئەوەش بە شێوەیەك کە دەشێ دژایەتی بەخۆیەوە بگرێ.لەبەر ئەوەی ڕۆماننووس گەر نووسەرەو خولقێنەری بەسەرهاتی سەیروسەمەرە نییە،گەر لە چوارچێوەی سەردەمەکەیدا جێیەکی هەیە،ئەمڕۆ هۆشی ئەو گرفتاری بیروباوەڕی وا دەبێت کە پەیوەندییەکیان بە ئیلتیزامەوە نییە بە چەمکە سارتەرییەکەی .ئیلتیزامی لەوجۆرەی سارتەر فەزایەکی مێژووییە کە ئێمە لەم دەساڵەی دواییدا بینیمان چۆن بە تەواوەتی شی بۆتەوەو بەشبەش بووە.لە ئەنجامدا نووسەرێك چۆن ئەم سەردەمە پێناسە دەکات؟گرنگیی کارەکانی ڕۆماننووسێك پەیوەستە بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بنەڕەتییە.بە بڕوای من زۆر سەیرە کە ژمارەیەکی زۆر کەم نووسەری جیهانیمان هەیە کە پێناسەیەکی تەواوی ئەم سەردەمە بەمانا جیهانییەکەی ئەم وشەیە، بەدەستەوە بدەن.واتە باڵادەستیی تەکنۆلۆژیا بەو شێوەیەی کە هایدیگەر لە فەلسەفەکەیدا بیری لێ کردۆتەوە.بەو مانایەی کە ئەو مەسەلانەی قابیلی خستنەڕوون،چین؟لە سەردەمی حوکمڕانیی جیهانیی تەکنۆلۆژیادا "دەبێ لە بوارە ئابووریوسیاسیوژینیتیکیو..هتدا" چی بگێڕینەوە؟لە لایەکی ترەوە،پێدەچێت نووسەرانێك هەبن کە دەستیان لە نووسەری کێشابێتەوە"لەبەر ئەوەی یان کەوتوونەتە داوی وێنەی خۆیانەوەو،یان داوی هەندێ ڕۆڵی کۆمەڵایەتی و یان ڕاگەیاندنەوە کە ڕۆژ دوای ڕۆژ لە زیادبووندان.لەبەر ئەوەی من قەڵەمڕەوی فراوانی هەمیشە ئامادەی ڕاگەیاندن





بــە بەشــێك لــە حــوكمڕانیی تــەكنۆلۆژیا دەزانم و ئــەوەی كــە لــە شــێوەی پاشەكشــێ‌وحاڵەتی ڕابردووخوازانەداولــە شــوێنی جیاجیــادا دەبینرێ،بــە بەشێك لـەم دیاردەیـەی دەزانم.لـە حوكمڕانیی تـەكنۆلۆژیادا دەبـێ‌ چاوەڕێی هـەموو پەلـەكردنێك یـا توندڕەوییـەك بـین لـە تـەواوی ئـەو دیاردانـەی كـە لـە تەكنۆلۆژیاوە سەرچاوە دەگرن. بـەڵام دەبـێ‌ چاوەڕێی دیاردەی وەكو تـرس و هەڕەشەوپاشەكشێش بكەین، هەروەكو چۆن دەتوانین ئەمڕۆ ئەوە بەڕوونی لـە یەكێتیی سۆڤێتی پێشوودا یان لە هەندێ‌ تەقەلای توندڕەوانەدا بۆ پاراستنی یەكپارچەیی لە شوێنی جیاجیادا ببینینەوە.بەڵام بەڕای من ئەم دیاردەیە وەك دیاردەیـەكی جیهـانی دێتـە پێشچاو،واتە ڕۆمـاننووس سـەروكاری لەگـەڵ ئـەو مەسەلانەدا هەیە. هەندێ‌ مەسەلە هەن كە ڕۆماننووس دەتوانێ‌ بە شێوەیەكی تـەواو جیـاواز لـە وتـار یـان فیكـری فەلسـەفی قسـەیان لەسـەر بكـات. ڕۆمـان دەتوانێ‌ كەسانێك بخولقێنێت كە بەشێوەیەكی بابەتی‌و فیزیكی ڕووبەڕووی دیاردەكان دەبنەوە.من لە هەموو ڕۆمانەكانمدا وادەكەم. تەواوی ڕۆمانەكانم لە دە ساڵ لەمەوبەرەوە تا ئێستا یەك مەسەلە دەخەنە ڕوو: فلان یا فیسـارە شت لە سـەردەمی حوكمڕانیی تـەكنۆلۆژیادا دەبێت بـە چی؟بۆ نموونـە لـە كتێبـی (جەژن لە ڤینیسیادا)پرسیارەكە ئەوەیە كە بازاڕی هونەر چیی لێ‌ دێت؟یان لـە ســـەردەمی بەگشـــتیبوونی ئـــەزموونی ژینیتیـــك و بـــە پیشەســـازیبوونی بەرهەمهێنانی جۆری مرۆڤدا،ئادەمیزاد چی بەسەر دێ‌؟سەبارەت حوكمڕانیی جیهـانیی تـەكنۆلۆژیا ،دیسـانەوە مـن دەگەڕێمـەوە بـۆ لای هایدیگـەر كـە لـە چاوپێكەوتنێكیدا لە كۆتایی كتێبەكەیدا دەڵێت:" من قسە لەسەر تـەكنۆلۆژیا ناكــەم" بــەڵكو بەتــەنها دەڵــێم كــە هــەوڵ دەدەم ماهیــەتی بخەمــە ژێــر پرسـیارەوە،واتە لـە كوێـوە دێت؟هـەروەها بۆچـی شتێكی ناچارییە؟" كەواتـە كاردانەوە بەرامبـەر تـەكنۆلۆژیا لەسای حوكمڕانیی تـەكنۆلۆژیادا , بەتـەواوی بەرنامەڕێژی كراوە،هەربۆیە لە هەمانكاتدا هاوشان لەگەڵیدا دەڕوات و ،ڕیگای خۆیشی دەبڕێت.دیاردەكە لەناو خۆیدا ون دەكات،بەڵام لە ڕاستیدا بەتـەواوی





لەگەڵیـدا لـە حاڵـەتی جووڵـەو بزاوتندایـە.هـەر لەبـەر ئەمەشـە کـە هـیچ ئاڵتـەرناتیڤێك بـۆ حـوکمڕانیی تـەکنۆلۆژیا نی‌یـە.حـوکمڕانیی تـەکنۆلۆژیا جیهانییە و زیاتر لە جارانیش جیهانی دەبێت. هەرچەندە دوورگەی بچووکی وا هەیـە کـە هێشـتا هوشـیار نـین بـەوەی کـە لـەم سـەردەمەدا دەژین،بـەڵام بەهەرحاڵ،ئێمە جیهانی بووین.بەبڕوای من ئەمە دیاردەی گەورەی سەدەی بیستەمە،واتە ونبوونی ئاسۆی ئاڵتەرناتیڤەکانی دی.

*ئایا دەتوانین دەربارەی (ڕۆمانی جیهانی)یش قسە بکەین؟

مـن لـەو بڕوایـەدام کـە بابەتـە سـەرەکییەکان جیهـانین. هەڵوێسـتەکان نـابێ ئەبستراکت بن. پێویستە هەڵوێستەکان بەو دۆخە زمانییە بخوێنرێنەوە کە پێـی دەنووسـرێن.مـن ڕۆماننووسـم، بـەڵام نـەك ڕۆماننووسـێکی جیهـانی.مـن ڕۆماننووسێکی فەرەنسیم لە چاخێکی جیهانیدا. ئەمـەش مانای وایە کە من سـوود لـە تـەواوی نـەریتی ڕۆماننووسـیی فەرەنسـی وەردەگـرم. ئـەم نەریتـە ڕۆمـانی فەرەنسـیش دەگرێتـەوە، کـە ئـەویش بـە شـێوەیەکی سروشـتی و بـە تایبەتیش فەرەنسییە.(هەر ئێستا بوو کە باسی ڤۆڵتێرم دەکرد، بۆ نموونە لە دوا کتێبمدا "نهێنی"، لەساتێکی دیاریکراودا گێڕەرەوەکە کتێبی "کاندید"ی ڤـۆڵتێر دەکاتـەوە تـا پیشـانیبدات کـە کتێبێکـی زۆر هەنووکەییـە)،بـەڵام بالزاکیش تیایدا جێی خۆی هەیە.لەبەر ئەوەی لە بالزاکدا تەواوی توخمەکانی خوێندنـەوەی ئـەو شـتە هەیـە کـە ئـەو نـاوی دەنێـت "ئـەودیوی مێـژووی هاوچەرخ".بەم پێیە من دەتوانم سوود لەم نەریتە وەربگرم،واتە بڵێم :"ئەمەیە تەواوی ئەو شتەی کە پیشانی منـی ئەدەن "،"ئەمەیـە تـەواوی ئـەو شـتەی کـە من بە فلان یا فیسارە شێوە دەبێ باوەڕم پێـی هـەبێت".بەڵام مـن تـەواوی ئـەو شتانە کەشف دەکەم کە لـە پشـتیەوەن،ئەمەش ڕێك نـەریتی "پرۆسـت"ە،واتـە دۆخی کەشفکردنی دیوەکەی تری دیاردەکـان: بـۆ نموونـە، کەشـفکردنی ئـەو ئارەزووانـەی کـە ئاماژەیـان بـۆ نـەکراوە ،هـەروەها کەشـفکردنی فێڵبـازیی مێژوو.یەکێك لە گەورەترین مەسەلەکانی هەر ڕۆماننووسێکی سەدەی بیستەم





ئەوەیە کە لە خۆی بپرسێت:سەدەی بیستەم چییە؟سەدەی فێڵبازییە.گەلێ بەڵگەی جۆراوجۆر هەن ئەوە دەسەلمێنن کە هەندێ لەو ئەزموونە تراژیدییانەی ڕوویانداوە یان لە ئایندەدا ڕوودەدەن"لە فێڵبازیی مێژووەوە سەرچاوەیان گرتووە.

*** هەروەکو دەزانن،گۆتە باوەڕی بە "weltliteratur" هەبوو،واتە ئەدەبێکی جیهانی.من دەپرسم ئاخۆ ئەمڕۆ ڕۆمانووسێکی جیهانی هەن کە بەم "w eltliteratur"ەوە پەیوەست بن؟**

بەشێوەیەکی گشتی هەن، بەڵام ئەمەش کارێکی سەختە. بەبڕوای من کەسێکی وەکو میلان کۆندێرا نوێنەری ئەم تەوژمەیە،یان نووسەری ئەمریکی فیلیپ ڕۆت[16] ، نوێنەری ئەم نەریتەیە. نووسینەوەی ئەزموونی تایبەتیی ڕۆماننووسێك ،واتە ژیان بەسەربردن وەکو نووسەرێك لەبەر هەڕەشەی مەرگداو لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا چییە"شتێکی جیهانییە.کەواتە بە بۆچوونی من ئەم چاخەی ئێمە دەبێتە خاوەنی ڕۆماننووسی جیهانی،بەومەرجەی باڵادەستیی سەرتاسەریی تەکنۆلۆژیا ئەوانی بێهەست نەکردبێت،لەبەر ئەوەی باڵادەستیی تەکنۆلۆژیا تا دوارادە توانای داهێنان کەمدەکاتەوە.ئەگەر ڕۆماننووسی وا هەبن،ئەوکات سەبارەت هەموو ئەم شتانە دەدوێین،سەبارەت تەواوی چرکەساتەکانی مێژووی هاوچەرخ.

***بۆ قسەکردن سەبارەت تەکنۆلۆژیا،دیسانەوە دەگەڕێینەوە بۆ هایدیگەر. وابزانم لە کارەکانی هایدیگەردا چرکەساتێ هەیە کە دەڵێت:"جیاوازیی نێوان زانست و فەلسەفە ئەوەیە کە زانست بیر ناکاتەوە."دەتوانین ئەم حوکمە بەسەر ڕۆمانیشدا بدەین وبڵێین ڕۆمانی ئێستا چیدی بیرناکاتەوە؟**

---

[16] ڕۆت, فیلیپ Roth Philip Milton. Born 1933 نوسەرێکی ئەمریکییە, کە ڕۆمانی ئەندێشەیی پڕ لە مەتەڵ و نهێنی دەنوسێت, هەروەها ڕۆمانی گاڵتەجاڕیش دەنوسێت, لە نمونەی سکاڵاکەی پۆرتنۆی ـ 1969, کە باس لەژیانێکی جولەکانەی سەر بەچینی ناوەڕاست دەکات.





بێگومان. ڕۆمانی ئێستا بیر ناکاتەوە. بێگومان کاتێ هایدیگەر باس لە زانست دەکات، باسی خودی زانست دەکات. بەڵام ڕۆمانێك کە بیرنەکاتەوە، ڕۆمانێکی درۆزنـــە، شـــتێکی بازارییـــە. ڕۆمـــان بـــەگوێرەی پێناســـەکەی دەبـــێ بیربکاتەوەوکۆنـدێرا لـەم بارەیـەوە قسـەی کـردووە. پرۆسـت پـڕە لـەفیکر. لەکتێبی "گەڕان بەدوای زەمەنی لەدەستچوودا" ڕووبەڕوو کۆمەڵێك مەسەلەی فیکریی جیاواز دەبینەوە. بۆ نموونە پرۆست مەسەلەی "یادەوەری" دەخاتە ڕوو، یـان مەسـەلەی "زەمـەن"وهـەروەها "سـنۆبیزم"واتـە نمایشـکردنی بەردەوامی هەندێك بەرامبەر هەندێکی دی. ڕۆمانە گەورەکان پڕن لە فیکر. ڤۆڵتێر پڕە لە فیکر، بالزاك بە هەمان شێوە، هەروەها ستاندال. بەم پێیە، ڕۆمانێك کە بیر نەکاتەوە، لە ڕاستیدا لەگەڵ شوناسی خۆیدا ناگونجێت.ئەوە دابەزینی ئەدەبە بۆ مەبەستەکانی میکانیزمی پەتیی جیهانی خەیاڵێکی فەقیر.

***بەڵام ئەمە دۆخێکە کە هەموو ڕۆژێ زیاتر لە جاران دەیبینین.وانییە؟**

–بـەڵێ وایـە.ئەمـەش لـەو چرکەسـاتەدا بـەو مانایـە دێـت کـە باڵادەسـتیی تـــەکنۆلۆژیا دەبێتـــە مایـــەی هـــەژاریی تراژیدییانـــەی میکانیزمـــەکانی بیرکردنەوە.بەم پێیە لەو ساتەدا پێودانگی ئەوەی کە ڕۆمانێك بیردەکاتەوە یان ناکاتەوە ئەوەیە کە بزانین چ کەسێك چی دەخوێنێتەوە؟لێرە بەدواوە توانای خوێندنەوە ڕاستەوخۆ بەمەسەلەی تەکنۆلۆژیاوە بەندە.توانای خوێندنەوە لە حاڵەتی پووکانەوەدایە.لەم ڕۆژگارەی ئێستادا کەسانێکی زۆر کەم هەن توانای خوێندنـەوەی سـەرەتاییان هـەبێت.هـەر ئەوەنـدە خوێندنـەوە دەسـت بکـات بـە پرسیارکردن لەوەی کە فلانە یا فیسارە دەق چ مانایـەکی هەیـەو پەیوەنـدی لـە نێـوان دەقەکانـدا دروسـت بکات"ئیـدی هـەموو ئەمانـە دەکەونـە بـەر شـاڵاوی باڵادەسـتیی تـەکنۆلۆژیاوە. ئەمـە ڕاسـتییەکە.ئەمـە شـاڵاوێکی ڕاسـتەوخۆیە بۆسەر خودی مرۆڤ،ئەگەر تایبەتمەندیی خودی مرۆڤ بیرکردنەوە بێت.

***چارەنووسی ژیارێك چییە کە چیدی ناتوانێت بخوێنێتەوە؟**





–نازانین.ئەوە هەر دۆخی ژیاری خۆرئاوا نی‌یە.بەڵکو دۆخی ژیاری جیهانیشە،ژیارێك كە هیچ ئاڵتەرناتیڤێکی نی‌یە،مەگەر دواخستنە پێکەوە گرێدراوەکانی دەزگایەك لە تەوژمی بەجیهانیکردندا.لەم بوارەدا دەکرێ فڕوفێڵ ودرۆش ڕۆڵی خۆیان هەبێت.دەیانەوێ وا لە خەڵك بکەن باوەڕ بەوە بێنن کە ژیارێکی خۆرئاوایی هەیە کە بووە بە ژیارێکی جیهانیو دەتوانێ ببێت بە ئاڵتەرناتیڤ.ئەمە بە جۆرێك لە جۆرەکان گەڕانەوەیەکە بۆ ئاسۆی مارکسیستی کە دەیبینین بەرەو فەوتان دەچێت و بۆ دژی خۆی دەگۆڕێت:چ چارەنووسێکی سەیرە ! ئەم مێژووە جیهانییەی کە تێیداین"گەوهەرێکی خۆرئاوایی هەیە ،بەڵام چارەنووس وایکردووە بە جیهانی بێت،لەبەر ئەوەی تەکنۆلۆژیا لێرە بەدواوە لە حوکمڕانیی خۆیدا سازش ناکات.من دژی تەکنۆلۆژیا نیم، بەڵام هەوڵ ئەدەم بپرسم بۆچی وایە.

***ئایا بەبۆچوونی ئێوە هیچ پاساوێك بۆ تیۆرەی "کۆتایی مێژوو"هەیە؟**

–بەپێی پێناسە شتێکی گاڵتەجاڕانەیە.نابێ قسە لەسەر کۆتایی مێژوو بکرێ،بەڵکو دەتوانین باسی کۆتایی یەك مێژوو بکەین.ئەبێ لە خۆمان بپرسین کە بۆچی مێژوو بەمانای نووسینەوەی مێژوو،مێژووگەرایی،زانستی مێژوو،یان ئاسۆی مێژوویی،لێرە بەدواوە چیتر قەناعەتپێکەر نی‌یە.خۆ ئەگەر لەبری ئەوەش بایەخ بەو ڕەهەندەی مێژوو بدەین کە هایدیگەر پێیدەڵێت"historial "،ئەوە بەتەواوی شتێکی ترە.ئەمەیان هێزوتینێکی شاراوەی زیاتری تیایە کە بە ناچاری بەرەو چەسپاندنی بەرنامەی حوکمڕانیی جیهانیمان نابات لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا.ئەمە دژایەتییەکە تیایدا دەژین و هایدیگەر باش دەرکی بەمە کردبوو.بەواتایەکی دی نابێ قسە لەسەر کۆتایی مێژوو بکەین،بەڵکو دەبێ قسە لەسەر کرانەوەی مێژوو بکەین.ترسیش لەوەی کە دەسەڵات بچێتە دەستی سیستمێکەوە کە لەسەر بازرگانی بەندە"ناهێڵێت ئەو کرانەوە مێژووییە گەورەیە ببینین کە لە چەمکی "historial" دا خۆیمان پیشاندەدات.بەواتایەکی دی"پێویستە سەرلەنوێ هەموو مێژوو

شیبکەینەوە.ئەگەر ئێوە لەمن بپرسن "سەدەی بیستەم چی‌یە"وەڵامتان ئەدەمەوە کە "نازانم".لەبەر ئەوەی هەموو مێژووەکانی سەدەی بیستەم ساختەن.بۆ نموونە سەیری مێژووی مارکسیزم بکەن لە سەدەی بیستدا.ئێمە هێشتا چاوەڕێی ئەوەین لە ئەرشیفەوە زانیاریمان دەستکەوێ‌وشتی ترسناکمان بۆ دەردەکەوێ.بەڵام ئاخۆ دەرکمان بە هیچ کردووە ؟بڕوا ناکەم .کەسانێك هەن کە سەبارەت بە سەدەی بیستەم دەڵێن کە ئەم سەدەیە سەدەیەکە لە وەهم و وەهماویبوون دروست بووە و،لە کۆتاییدا چی دەمێنێتەوە؟هیچ.هەربۆیە دەست بە قسەکردن لەسەر کۆتایی مێژوو دەکەن.ئەمە خۆی وەهمێکە،وەهمێك کە دەبێتە مایەی ئاسوودەیی.

***تۆ پێت وایە کە دەتوانین وەکو کۆستاس ئاگسیلۆس باس لە"گەمە"ی تازەی جیهان و "ئاسۆ"ی تازەی هزر بکەین و ،ئاخۆ بەرامبەر بەم ئاسۆ تازەیەش ئەرکی ڕۆمان دەبێ چی بێت؟**

-نازانم ،من ڕۆماننووسم و وەکو ڕۆماننووسێکیش بیر دەکەمەوە .من وایدەبینم کە پێویستە ڕەوتە بابەتیەکانی سەقامگیربوونی حوکمڕانیی تەکنۆلۆژیا بە وردی ببینین.شێوەی چی دەگۆڕێ؟

چ شتێك دەخاتە ناو مرۆڤ و خودی‌وجیهانی خەیاڵییەوە ؟ئەبێ بە پێی ئەمەش بزانین کام چیرۆك و کام جۆرە "هەڵوێست دروستکردن" دەتوانێ بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆو لە ڕێی ڕۆمانەوە هەموو ئەم پرسیارانە بخاتەڕوو؟ وای بۆ دەچم لەم زەمەنەدا ڕۆمانێك سەبارەت بە دۆخی هەنووکەیی جیهان ،لە کتێبێکی فەلسەفی زیاتر شت بڵێت و کاریگەرتریش بێت.لەبەر ئەوەی ئەرکی بیرمەند بیرکردنەوەیەو ئەرکی هونەرمەندیش داهێنانی کاری جوانە.هەروەکو هایدیگەریش دەڵێت"فەلسەفە خۆی لە خۆیدا شاعیرانەیە،بەڵام شیعر نی‌یە.شیعریش خۆی لە خۆیدا هێزێکی فیکرییە،بەڵام قەت نابێت بە فەلسەفە.ڕۆمانیش بە هەمان شێوە،ڕۆمان فەلسەفە نی‌یە ،ڕۆمانە.





***لەگەڵ ئەمەشدا ،لەمێژوودا شاعیری فەیلەسووف و فەیلەسووفی شاعیر هەبوون،کەسانێکی وەکو نیچە.**

-ڕاستە،"نیچە "ڕۆماننووسی هزرە،"کیرکەگۆر"یش بە هەمان شێوە.شتێکی ڕێکەوت نییە کە "کافکا" خوێنەرێکی جیددیی کارەکانی کیرکەگۆر بووە.لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کافکا بەر لە هەر شتێك ڕۆماننووسێکی گەورە بووە نەك فەیلەسووف،تەنانەت گەر لە ڕوانگەی فەلسەفەکەی کیرکەگۆریشەوە کارەکانی بخوێنینەوە.هەرچۆن کیرکەگۆریش ڕۆماننووس نییە و بەڵکو فەیلەسووفێکی گەورەیەو بەس.بەم پێیە،پێویستە ڕۆماننووس لە کارەکانیدا مەسەلە فەلسەفیەکان بخاتەڕوو،بەڵام نابێ ئەوەی لەبیر بچێت کە ڕۆمان دەنووسێت ،نەك کتێبی فەلسەفی.

***دەتوانین کەمێکیش لە بارەی کارەکانی خۆتانەوە قسەبکەین؟ ئێوە بە خۆتان دەڵێن کە ڕۆماننووسێکی شێواز بالزاکین، واتە ڕۆماننووسێکی ڕیالیستن..**

-من ئەم قسەیەم لە تووڕەییەوە بەرامبەر بە لەخۆبایبوونی فۆرمالیزم گوتووە. بێگومان من نالێم پێویستە فۆرمالیزم نەمێنێت. لەبەرئەوەی فۆرمالیزمیش لە بارەی شتگەلێکەوە دەدوێت کە ڕاستن. فۆرمالیزم چییە؟ فۆرمالیزم ڕێگایەکە بۆ بایەخدان بەو ڕاستییەی کە کتێبەکان بە وشە و ڕستە نووسراون و، بۆ بەکارهێنانی ئەم ڕستە و وشانەش پێویستە سیستمێك (ڕێکخستنێك) هەبێت. با بگەڕێینەوە بۆ مەسەلەی لەخۆبایبوونی فۆرمالیزم. لەم دواییەدا بۆ گرتنی کۆڕێك سەبارەت بە ئەدەب چووبووم بۆ ئەڵمانیا و، لە کۆتایی قسەکانمدا هەندێ مامۆستا ڕەخنەی ئەوەیان لێ گرتم کە من زیاد لە پێویست قسەم لەسەر ناوەرۆك کرد و بە ڕادەی پێویست باسی فۆرمم نەکرد. منیش بەوانم گوت کە ئەمڕۆ پێویستە جەخت لەسەر ناوەرۆك بکەینەوە نەك فۆرم، لەبەرئەوەی ناوەرۆك خۆیشی جۆرێکە لە فۆرم. هەروەها پێویستە قسە لەسەر مانای ئەدەب بکەین و ئەمەش هەرگیز بە مانای گەڕانەوە بۆ دواوە نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، زۆر وێرانکەرە، ئەزموونی فۆرمالیستیش کاتێ





هێرشی دەکردە سەر ناوەرۆك و مانا" وێرانکەر بوو. بێگومان فۆرمالیزم دەتوانێت ئەم وێرانکارییە لە فلانە یا فیسارە هەڵوێستی دیاریکراودا، یاخود فلانە یا فیسارە ولاتی دیاریکراودا" بپارێزێت، بەلام لەسەر ئاستێکی گشتیتر، لێرە بەدواوە مانا وێرانکەرە، لەبەرئەوەی لە سیستمێکی گشتیدا" کە تەکنۆلۆژیا دەبێتە هۆی جێگیرکردنی پروپاگەندە و تەلەفزیۆن و ئامرازەکانی کات بەسەربردن و دروشمی بەردەوام بۆ کالاکان، پرسیارکردن سەبارەت بە مانا لە پێشەوەی هەموو شتەکان دێت.

***بەلام ئاخۆ لە ڕوانگەی "فیلیپ سۆلەرز"ەوە کە نووسەری "بەهەشت"ە" شێواز گرنگترە یان مانا؟ لەبەرئەوەی "بەهەشت"یش شێوازێکی جوانی هەیە.**

—هەردووکیان گرنگن. بەلام لە ڕۆمانی "بەهەشت"دا مانا بە بەراورد لەگەڵ فۆرمدا، لە حالەتێکی نیوەپۆشراو و شاراوەدایە. لەبەرئەمەشە حەزدەکەم بەرامبەر ئەو کارانەی کە دەیانەوێ مۆدێرن یا پۆستمۆدێرن و یان پێشڕەو بن، بەهەشت هیچ مۆرکێکی پێوە نەنووسێنرێ. بەهەشت ئەزموونێکمە لە چیرۆکدا کە بەلای منەوە زۆر بنەڕەتیتیر و زۆر فراوانترە.

***مەبەستی ئێوە چ جۆرە ئەزموونێکە لە "بەهەشت"دا؟**

—بەهەشت وەلامێکە بۆ تەواوی دەسەلاتی وێنە" لە ڕێی گەڕانەوەی بۆ بزاوت و جووڵەی زمان. بەم پێیە" جووڵەیەکە لە باوەڕهێنان بە سەرچاوەکانی هێزی زمانەوە هەڵدەقوڵێت. بەلام ئەوەی حیسابی بۆ دەکرێ "مانا"ی ئەم کتێبەیە، بۆیە گرنگ ئەو شتەیە کە لە بارەیەوە دەیلێن.

***کەواتە ئایا دەتوانین بڵێین کە ئەم کتێبە نمایشێکی ئەدەبی‌یە بەرامبەر کۆمەڵگایەك کە لەسەر بنچینەی نمایش دامەزراوە؟**

—لەم نمایشە بە گشتیبووەدا، ئەم کتێبە هەنگاوێکە لە ئاست نائومێدیی قووڵی زمانەوانیدا.

***لە چوارچێوەی قسەکردندا لەسەر کۆمەڵگای پشتبەستبوو بە نمایش، لە یەکێك لە وتارەکانتاندا سەبارەت بە سینەما دەڵێن کە "سینەما نمایشگای دژە خەیاڵە".**





-ئەمە باسێکە کە من وروژاندم. ئەم باسە هێندەی پەیوەندیی بە سەقامگیربوونی کۆمەڵەیەك وێنەوە هەیە لە ئاستی جیهاندا" هێندە پەیوەندیی بە سینەماوە نییە. ئامانجی من سەرنجڕاکێشانە بەلای بونیادی کەلتووریی زمان و ئەو ئەزموونە تاکە کەسی و هۆشیارانەیەی کە دەشێ لەهەر زمانێکدا هەبێت و، هەروەها ئەو شتەی کە دەتوانین پێی بڵێن "یادوەریی زمانەکان". ئەمڕۆ نووسینێکی "شاتوبریان"م دەخوێندەوە، نووسینێکی تەواو پێشبینانە، ئەو دەڵێت: "لە هەموو وڵاتەکاندا شێوەی جلوبەرگ پۆشین وەکو یەکی لێ دێ".

ئەمە یەکێکە لەو ئامانجانەی کە لە ڕووی ئەقڵییەوە لەوانی تر زیاتر هاتۆتە دی. بەم پێیە، جووڵەی بەدوایەکدا هاتووی وێنە بەگشتیبووەکانیش هەمان ئیدیعای هەیە، واتە یەك کلێشەی خەیاڵی لەسەرتاسەری جیهاندا بڵاوبکاتەوە. ئەمە پێچەوانەی چەمکی "ئەدەبی جیهانی"ی گۆتەیە، لەبەرئەوەی لە "ئەدەبی جیهانی"ی ئەمڕۆدا بابەتەکان جیهانین، بەڵام هەریەك لەو زمانانەی کە ڕۆمانیان پێ دەنووسرێ یادەوەریی تایبەتی خۆیان هەیە. کەسێکی ئینگلیز لە کاتی نووسیندا بێگومان بیری لای دیکنز یان شەکسپیرە و، هەروەها ئەڵمانیەك لای گۆتە، یا هۆڵدەرلین و نیچە و، جوولەکەیەك بیری لای "کتێبی پیرۆز"ەو، ئیسپانییەکیش ڕووی لە قەڵەمڕەوێکە کە سێرڤانتیس تیا باڵادەستە و هتد.. وای بۆ دەچم کە کێشەی پیشاندانی ئەم خاڵەیە کە ناهێڵێت هەرگیز جیاوازی لە نێوان کەلتوورەکاندا، جیاوازی لە نێوان یادەوەرییەکاندا و جیاوازی لە نێوان زمانەکاندا لەناوبچێت. ئێمە ناتوانین بیر لە هێنانەکایەوەی زمانێکی جیهانی بکەینەوە، مەگەر زمانێك کە لە وێنە دروستکرابێت.

***کەواتە بەمجۆرە، ئێمە هەموو لەگەڵ کۆمەڵێك چیرۆکی ئەفسانەیی گەورەدا کاردەکەین..**





–وایە. بەڵام ئەگەر ئەمانەش بە شێوەیەکی بونیادی، قاڵبێکی زمانی و کەلامییان نەدۆزیبایەتەوە، ئەوکات دەگۆڕان بۆ کەلتووری خەواڵوویی ( la culturede l'hypnose).

***لە ڕاستیدا ئێستا جۆرێك لە سینەما خەریکە دەبێت بە "کەلتووری خەواڵوویی"، وا نی‌یە؟**

–زۆر ڕاستە. ئێوە ئێستا زۆر بە ڕاست و دروستیەوە هاتنە ناو مەسەلەی سینەمای فەرەنسیەوە. لەم بوارەشدا دیسانەوە مەسەلەی باڵادەستیی تەکنۆلۆژیا دێتە گۆڕێ، کە حاڵەتی جیٚ بەیەك لەقکردنیش لەگەڵ دەسەڵاتدا لەخۆ دەگرێت. لە مەیدانی دیاردە بیستراوی –بینراوی‌یەکاندا؟ باشە، چ کەسێك نوێنەری باڵادەستیی تەکنۆلۆژیایە؟ ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ژاپۆن. لەم بارەیەوە کۆکین. لەم مەیدانەدا کێ شوناسی خۆی لەدەست دەدات؟ میللەتە هەژارەکانی جیهانی سێیەم. بەڵام هیچ کارێك ناکریٚ، ئەوەی بەهێزترە دەیباتەوە. بەم پیٚیە شتێکی بێهوودەیە گەر بڵێین: "من بەرامبەر بەم باڵادەستی‌یە" سینەمایەکی نەتەوەیی دەخولقێنم" ئەوەی پێویستە ئەوەیە کە سینەمایەك بخولقێنین کە ئەو مەسەلەیە بخاتەڕوو کە من ئێستا باسی دەکەم.

شتێکی بێسوودە بچین فیلمی "ژێرمینال" بەرهەمبێنین. من مەبەستم ئەوە نی‌یە بڵێم "بۆ دروستکردنی فیلم دەبیٚ بچینە لای بالزاك یان نەك زۆلا." من دەڵێم ئەمرۆ دەبیٚ بۆ نووسین سوود لە زۆلا و بالزاك یان هەر نووسەرێکی تر وەربگرین. من نامەویٚ فیلمێك بە ئەقڵیەتی سەدەی نۆزدەیەم بخولقێنم. من ئەمە بە نامۆبوون، خەسڵەتی شاری، یا دواکەوتنی ناوچەیی دەزانم. واتە شتێك کە دەتوانیٚ وڵاتێك لە ئاست ئەزموونە جیهانیەکاندا سنووردار و دیل بکات. سینەمای شاریش خەریکە دەرگاکانی جیهان بە ڕووی خۆیدا دادەخات. بەڵام نابیٚ ئێمە بە مانا سنووردارەکەی ئەم وشەیە باسی سینەما بکەین، بەڵکو دەبیٚ باسی "جیهانی وێنە" بکەین.





***بەڵێ، مەبەستی منیش زیاتر "جیهانی وێنە" بوو وەك لە سینەما. دوێنێ شەو لە تەلەفزیۆندا بەرنامەیەکم دی کە تیایدا خەلاتێکی سینەمایی ئەوروپیان بە "مایکل ئانجیلۆ ئانتۆنیۆنی" دەدا.**

وێنەی ئانتۆنیۆنی نیوە ئیفلیج و بێدەنگ منی حەپەساند. بە ڕای من ئەم دیمەنە سیمبولی جۆرە سینەمایەکە کە خەریکە دەمرێت و جێ بۆ سینەمای بازرگانیی هۆلیوود چۆڵدەکات. واتە بۆ سینەمایەك کە وردە وردە لەو سینەمایە دووردەکەوێتەوە کە لە ساڵەکانی 1950-1960دا دەمانناسی.

-ئەمە چارەنووسێکی حەتمی‌یە. ئەوسا هەڵەکە ئەوە بوو وایاندەزانی کە سینەما خۆی لە خۆیدا هێندە هێز و توانای هەیە کە ببێ بە هونەری سەرەکی. من وایدەبینم کە توخمی سەرەکی زمانە، شێوەی قسە. پێویستە دووبارە فێری ببینەوە. ئەم خاڵە زۆر گرنگە. بەم پێ‌یە نابێ سەرمان لەوە سوور بمێنێت کە تەکنۆلۆژیا دونیای سینەما قڵپ دەکاتەوە، لەبەرئەوەی تۆوەکەی لە بونیادی سینەمادا هەیە. ئێمە ئەمڕۆ سیستمێك لە ڕۆمانی کلێشەیی دەبینین کە بە ئاراستەی وێرانکردنی زمان دەجووڵێنەوە. تەکنۆلۆژیا کاری خۆی دەکات. ئەوەیە کە دەبێ فێربین بەرامبەر بەم باڵادەستیی تەکنۆلۆژیایە بەرگری بکەین. ئەم کارەش لە ڕێی فیکرەوە دەکرێ، لەبەرئەوەی فیکر لەناوناچێت. خۆت دەزانیت کە یۆنانیەکان بۆ ماوەی 13 سەدە لە مێژووی خۆرئاوادا نەمان، بەڵام دوای ئەوە دووبارە فیکریان هاتەوە ئارا.

***بە سەرنجدانەوە لەوەی کە گوتتان، ئێوە چۆن بیر لە پەیوەندیی نێوان نووسین و ژیان دەکەنەوە؟ ئایا بۆ نووسین دەژین" یان بۆ ژیان دەنووسن؟**

-ئەمە دیالەکتیکێکی ئەبەدی‌یە. من هەرگیز وام پیشان نەداوە کە کتێبێك نەنووسراوە. لەناو چیرۆك خۆیدا شتێك هەیە لە حاڵەتی نووسینێدایە. لە ژیانیشدا، من کاتی خۆم بۆ ئەوە تەرخان دەکەم کە بڵێم هەرچییەك لە ژیانمدا تاقی دەکەمەوە" دەشێ ببێتە نووسین. من لەو بڕوایەدام کە هەموو دۆخێك





قابیلی نووسینە. بە زۆری لە ڕۆمانەکانمدا وەسفی هەندێ دیمەن دەکەم کە لەودیو ئەو دیمەنە جیهانیەوەن کە ئێمە تیایدا دەگوزەرێین. بۆ نموونە، من دەتوانم لە تەلەفزیۆندا سەبارەت بە دروستکردنی بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی بدوێم.

***ئێوە بە زۆری دەبنە پاڵەوانی ڕۆمانەکانی خۆتان.**

-بەڵێ، وایە.

***ئایا لە ئەزموونە جۆراوجۆرەکانتاندا، هەر لە ماویزمەوە تا گۆڤاری "تیل کیل" و گۆڤاری "ئەنفینی" و ڕۆمانەکانتان، گەمەی ڕێکەوت دەبینیت یان جۆرە بەردەوامبوونێك؟**

-پاش ئەو لێکدانەوە زۆرانەی کە جۆرێك لە نەگونجانیان لەم ئەزموونانەمدا دەبینییەوە، وردە وردە خەریکە جووڵەکە پێچەوانە دەبێتەوە و جۆرێك لە گونجانی لۆژیکی لە ژیانی مندا دەبینن. بەم دواییە کەسێك کە ناوی فیلیپ فورەیە کتێبێکی لە بارەی منەوە نووسیوە و، ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر ئەو بێتاقەت دەکات ئەوەیە کە ئەم "نەگونجانە ڕووکەشە" لە ڕاستیدا زۆر گونجاوە. مەسەلەکە ئەوەیە کە ئەم گونجانە وردە وردە خۆی پیشان دەدات. بۆچی؟

لەبەرئەوەی ئەوەندە بەسە کە سەیرێکی کتێبەکان بکەین یان بیانخوێنینەوە تا پەی بەو شتانە بەرین کە دەیخەنە ڕوو. بەم پێیە من داوێکم بۆ کۆمەڵگا نایەوە. بە جۆرێك ڕەفتارم کردووە کە هەر دەڵێی لە هەموو شوێنێك هەم و کۆمەڵگا باوەڕی بە جۆرە وێنەیەك سەبارەت بە من کردووە. بەڵام لە ڕاستیدا، کتێبەکان هەن، کۆمەڵگا ئەوەی هەڵبژاردووە کە ئەوانە بخوێنێتەوە یان لە بیریان بکات. لەگەڵ ئەمەشدا کتێبەکان هەن و لە خەونەکانی ئەواندا درێژە بە ژیانی خۆیان دەدەن. دەمەوێ دەقێکی "بارت"تان بۆ بخوێنمەوە بە ناوی "هەڵبەز و دابەز"ەوە کە لە ساڵی 1978دا نووسراوە، ئەم دەقە بە یادەوەرییەکی کافکا دەست پێدەکات کە تیایدا دەڵێت هیچ شتێکی قەتعی نییە. بە بۆچوونی بارت من لایەنگری هەڵبەز و دابەزم،





لەبەرئـەوەی شـتێکم داهێنـاوە لـە هەڵبـەز و دابـەز دەچـێت و، ئـەو لەگـەڵ هاوڕێیەتیە بەدوایەکەکانی ژیددا بەراوردی دەکات و دەڵێت کە ئەم دووانە هەرگیز وەکو یەك نین. لە ڕاستیدا ئەمە ئەو شتەیە کە من دژ بە ڕوحانیەتی فیکری هێناومەتە ئاراوە. من لێرەدا ڕۆڵی دژە ڕۆحانیەتم بینیوە. دەبێ ئەوە بزانین کە ڕۆحانیەت دەگۆڕێت، ئەمەش پەیوەندیی بە چرکەسات و قۆناغ و وڵاتە جیاوازەکانەوە هەیە. بەڵام هەڵوێستی دژ بە ڕۆحانیەت هەمیشە وەکو خۆی دەمێنێتەوە، بەڵام بە زاراوەی جیاوازەوە. هەر لەبەرئەمەشە کە ڤۆڵتێر زۆر هەنووکەییە. ئەو تا ئەو ڕادەیە دەڕوات کە مەیلەکانی من بە عیرفان بەراورد دەکات و دەڵێت: "هێرشکردنە سەر بێدەنگی و پارسایی وێنە، سروشتێکی خەتەرناك و توندڕەوانەی هەیە، کە توندڕەوێتی تا ڕادەیەك ئەو جووڵانەی عارفێکمان بیردەهێنێتەوە کە لێیان ناگەین.. ڕۆشنبیران دژی هەڵبەز و دابەزن و زۆر بەرهەڵستیی دەکەن، لە کاتێکا هەڵبەز و دابەز بە باشی ڕێ بۆ گومان خۆشدەکات. گومانی لە چەشنی گومانەکەی ژید تەحەممول دەکرێ، لەبەرئەوەی وێنەی وەستاو دەمێنێتەوە. ژید، ئەگەر بکرێ بڵێین، وێنەی وەستاوی چرکەساتی دەخولقاند. بەرامبەر بەو، سۆلەرز دەیەوێ وێنە فۆرمەلە نەبێت.

بەمجۆرە هەموو شتەکان لە ئاستی وێنەدا جێگیرن" نەك لە ئاستی مانا و بیروبڕوادا. ئەوە وێنەیە کە بەردەوام کۆمەڵگا دەیەوێ ڕزگاری بکات، ئیدی هەرچییەك بێت، لەبەرئەوەی وێنە خۆراکی ژیانی کۆمەڵگایە و ڕۆژ بە ڕۆژیش ئەم دۆخە زاڵتر دەبێت. کۆمەڵگای مۆدێرنی سەروو پێشکەوتوو" چیدی پشت بە بیروباوەڕەکان نابەستێت، بەڵکو وێنەکان خۆراکی ئەون. ئەو هەرا و زەنایەی سۆلەرز لەوێوە دێت کە ئەو هێرش دەکاتە سەر وێنە.. ئەو دوا وێنەی شیاو فرێدەدات، وێنەی کەسێك کە بەر لە دۆزینەوەی ڕێگای قەتعی" گەلێ ڕێی جۆراوجۆر تاقیدەکاتەوە، ئەفسانەی ڕەسەنی ڕێگای سەربەرزی" هەروەکو دەڵێن" ئەبێتە شتێك کە بەرگریی لێ ناکرێ".





جێی سەرنجە ، ڕۆلان بارت بەر لە پانزدە ساڵ ئەم دەقەی نووسیوە، بەڵام هێشتا هەر زۆر هەنووکەییە.

*بێجگە لەمە، لە یادمە کە لە سەرەتای دەقێکدا کە دەربارەی تۆ نووسیویەتی، دەڵێت: "قەت باسی سۆلەرز ناکرێ، چیدی ناوترێ کە ئەو نووسەرە، نووسیویەتی و، دەنووسێت". لێرەشدا مەسەلەی زۆران لەگەڵ وێنەدا دێتەوە گۆڕێ. بەم پێیە تۆ بە درێژایی ئەم ماوەیە وەکو سیحربازەکان کارت کردووە، وانییە؟

ئایا نووسەر لە هەمانکاتدا سیحرباز نییە؟ من باوەڕم بەمە هەیە. لەم پێڕە نووسەرەش نووسەرێك هەیە کە حەزی پێ دەکەم، ئەویش "نابۆکۆف"ە کە بە مانای وشە سیحربازە.

*بەڕێز سۆلەرز سوپاس و بە ئۆمێدی دیدار.

ئەمە خواحافیزی نییە، ئێمە یەکتری دەبینینەوە. بەبێ دانەیەك لە گۆڤاری "ئەنفینی" ئێرە جێنەهێڵێت.

دێسەمبەری1993

سەرچاوە: نقد عقل مدرن, رامین جهانبگلو, 1376 – تهران.





***سەرەتا دەمویست باسی خۆتان و ئەو ڕێگایەمان بۆ بکەن کە لە ژیاندا بڕیوتانە.**

لە ساڵی 1923دا هاتوومەتە دونیاوە. کە ئەم مێژووەشم دێتەوە یاد" بە تەنها لەبەرئەوە نی‌یە کە لەسەر هێڵی زەمەن جێی خۆم دەسنیشان بکەم و بڵێم سەر بە وەچەیەکم کە ڕووەو فەوتانە. بە تایبەتی دەمەوێ جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە کە وەکو هەموو ئەو کەسانەی کە دوای "جەنگی گەورە" لەدایك بوون –جەنگێك کە وا چاوەڕوان دەکرا، هەروەکو "پیگی"یش وای بۆ دەچوو، کە دوا جەنگ بێت– منیش بە قووڵی کەوتمە ژێر کاریگەریی زنجیرەیەك ڕووداوی پڕ ئازار و هەندێ جار تراژیکی وەهاوە، کە نەك هەر ئەم دڵی ئەوروپایەی هەژاند کە نیشتمانی منە" بەڵکو کیشوەرەکەی ئێمە و بگرە هەموو جیهانیشی هەڵاوگێڕ کردەوە. لە مناڵیدا بۆ چەند ساڵێك خۆشبەختی و هیوا و ئۆمێدی میللەتێکم بینی کە تازە سەربەخۆیی بەدەست هێنابوو: ئەو سێ قوتابخانەیەی کە لە شەش ساڵییەوە تا پانزە ساڵیم تیا بەسەر بردن، زۆر تازە بوون. کوڕیژگەیەك بووم کە لە ڕۆژنامەکانی دایك و باوکمدا وێنەکانی ڕایشتاگی بەرلینم دەبینی چۆن نوقمی ناو بڵێسەی ئاگر دەبوون و هەروەها ئەو کۆمەڵە کتێبانەی کە لە شارەکانی ئەڵمانیادا دەسووتێنران. منیش وەکو خوێنەرێکی پڕ تاسە، بەبێ ئەوەی کەسێك تێبگات" بەم دیمەنانە قەڵس دەبووم. کاتێ نەوجەوان بووم، لە ساڵی 1939دا بە بێدەسەڵاتی‌یەوە بینیم چۆن چیکۆسلۆڤاکیا بەشبەش کرا، بە دوایدا دەوڵەتی سلۆڤاك دامەزراو بۆهم و مۆراڤیاش لە لایەن سوپای ئەڵمانیەوە داگیرکران، ئەمە کۆتایی لاوێتی‌ی من بوو –ئەمەم بە وردی بە هەمان شێوە هەست پێ دەکرد. ئەمە بە تایبەتی یەکەمین داگیرکاری بوو کە بینیم وڵاتەکەم دەهاڕێ و ژیانی من ئاوەژوو دەکاتەوە. لە ڕاستیدا. ئەنجامەکەشی" یەکەمین دوورخستنەوەم بوو لە وڵاتەکەم. بەڵام ئەوکات هێشتا بە باشی نەمدەزانی مانای ئەم وشە سەیرە (واتە دوورخستنەوە) چی‌یە؟ دەبووایە دوای چل و سێ ساڵ لە ماناکەی بگەیشتمایە،





وەختێ چیکۆسلۆڤاکیام جێهێشت و بەرەو فەرەنسا چووم،ئەو دەمەی ڕژێمی بەناو سۆسیالیستی حوکمڕان لە پراگدا" منی لە وڵات دەرکرد. لە ساڵی 1939دا باوکم و دایکم ناچار بوون سلۆڤاکیا جێبهێڵن" هەر لەبەرئەوەی چیك بوون، باوکم بیست ساڵی ڕێك کارمەندی پی تی تی (PTT) بوو لە سلۆڤاکیا. منیش بەبێ نارەحەتی‌یەکی زۆر، بەڵام بە جۆرە هەستکردن بە دابڕان و ترازانێکەوە" قۆناغی سەرەتایی و چوار ساڵی ئامادەییم لەو وڵاتەدا بڕی کە تیا لەدایك بووبووم، لەوێ فێری یەکەمین زمانم بووم -زمانی ئەو شارە بچووکەی تیا لەدایکبووم، یەکەمین هاوڕێکانم، یەکەمین کتێبەکانم، زمانی سلۆڤاکی -ئەمانەم لە دوای خۆمەوە جێهێشت. لە ڕووی زمانناسییەوە، جیاوازیی نێوان زمانی سلۆڤاکی و چیك زۆر نی‌یە، بەڵام لەبەر هەندێ هۆی مێژوویی و سیاسی و ئابووری، بە ئاشکرا دوو کەلتوور، دوو شێوە ژیانی جیاواز دەبینین. بە کورتی، تەنها پاش گەڕانەوەی ناچارییانەی باوکم و دایکم بۆ بۆهم، نیشتمانە ئەسڵیەکەیان، لە سیانزە ساڵیدا و لە ئامادەیی و لە کۆڵانەکانی شار واتە لە سنووری بۆهم و مۆراڤیادا زمانی باوو باپیرانم -زمانی چیکی- بە تەواوی فێر بووم و زۆر زوو ناچار بووم یەکەمین بەرهەمی شیعریم بەم زمانە بنووسم و چاپی بکەم و، لە ساڵی 1942یشدا فێری زمانی چیکی و هەروەها ئەڵمانیش بووم، کە زمانی ناچارییانەی قۆناغی داگیرکردنی نازییەکان بوو.

لە پاییزی هەمان ساڵدا بوو کە چووم بۆ پراگ. سەرەتای هاوڕێیەتیەکانم لە کۆڕ و کۆبوونەوە هونەری و ئەدەبیەکانی پایتەختی چیکدا بۆ ئەم ڕۆژگارە سەختە دەگەڕێتەوە. لەم ساڵە سەختانەی داگیرکردن و جەنگی چاوەڕوانکراودا بوو کە بۆ یەکەمین جار لە نزیکەوە ڕوخساری نەفرەتی‌ی تۆتالیتاریزمم بینی: ئەو دەرسەی کە نەدەبوو هەرگیز لەبیرم بچێتەوە و، بە تایبەتیش هەر لەو ڕۆژانەدا بوو کە بەختی ئەوەم بۆ بوو تا لەو کتێبخانەیەدا کە کارم تیا دەکرد" کابرایەك بناسم کە دەشێ ڕۆڵێکی بنەڕەتیی لە پەروەردەکردنی مەدەنیانەی مندا هەبووبێت. ئەم هاوڕێیە، کە ڕۆژنامەوانێکی پرۆفیشناڵ بوو، ڕۆشنبیرییەکی سیاسیانەی





مەحکەمی هەبوو، ئەندامێکی کۆنی حیزبی کۆمۆنیستی چیك بوو کە بە هۆی دادگاییەکانی مۆسکۆوە وازی لە حیزب هێنابوو. ئەو منی هاندا تا کارەکانی مارکس و ئینگڵز و لینین و ستالین بخوێنمەوە و، لە هەمانکاتدا خەسڵەتی تۆتالیتاریانەی ڕژێمی سۆڤێتیی پیشانی من دا: دەرسێکی تریش کە هەرگیز لە بیرم نەکرد، پارێزێکی بەردەوام بوو بەرامبەر هەموو جۆرە وەسوەسەیەك بۆ چوونە ناو ڕیزی حیزبی کۆمۆنیستیەوە، وەسوەسەیەك کە زۆر لە هاوڕێیانی ئەو سەردەمەم" لەبەر هەندێ هۆی پەسەند یا ناپەسەند" تەسلیمی بووبوون. ئەم پارێزەش بوو بە مایەی گەلێ چەرمەسەری بۆم، بە تایبەتیش پاش کودەتای کۆمۆنیستەکان لە فێبروەریی 1948دا: لە زانکۆی شارل دەرکرام (ساڵی 1949)، بۆ چەند جارێك و لە ساڵانی 1948، 1960 و 1970دا لە یەکێتیی نووسەران دەرکرام، دوای داگیرکردنی دووەمجاری چیکۆسلۆڤاکیا" بڵاوکردنەوەی هەموو شتێکم لێ قەدەغە کرا –ئەمجارەیان لە لایەن هێزەکانی سۆڤێتەوە– (ساڵی 1968)، لێپرسینەوە و ئازاردانی پۆلیسیانە پاش ئیمزاکردنی "پەیمانی 77" و دوورخستنەوە لە فێبروەریی 1981دا. بەڵام لە هەمانکاتدا ئەم پارێزە درێژخایەنەم، منی لە زۆر مەسەلەی ئاکاری دوورخستەوە کە دواتر ئەو ڕۆشنبیرانەی تەسلیم بە دەسەڵات بووبوون" دووچاری هاتن.

*چۆن خولیای ئەدەبیتان لا دروست بوو؟

–لە منالیمدا وەکو هەموو هاوڕێ بچووکەکانم کە زۆربەیان قەرەج بوون، لە کوچە و کۆڵانەکاندا یاریمان دەکرد، پێکەوە قاز و بزنەکانمان بەرەو دەشت و دارستانەکان بۆ لەوەڕ دەبرد. بەشداریم لە پەلامارە نهێنیەکانیاندا دەکرد بۆ باخ و ڕەزەکانی دراوسێکانمان. بەڵام من بە پێچەوانەی زۆربەیانەوە، خوێنەرێکی عەودال و تامەزرۆ بووم. بیرم دێ چۆن بەسەر یەکەمین کتێبدا نووشتابوومەوە کە لە یەکەم لاپەڕەیەوە تا کۆتاییم خوێندەوە. ئەم ڕووداوە سەیرەی تەنهایی مرۆڤ" کە خوێندنەوەیە، سەرمەستی دەکردم. لەگەڵ ئەو پاڵەوانەدا کە خۆم دەخستە جێی" بە ترسەوە یان لەززەتەوە" لە کەندو لەندەکانی چیرۆکەکەدا تووشی





هەناسەبڕکێ دەبووم. ئەو یەکەمین کتێبە" دیاریی جەژنی سەری ساڵ بوو، هەڵبژاردەیەك بوو لە حیکایەتی میللی و سلۆڤاکی، کە پڕ بوون لە پەری و ئەژدیها، کچی جوانی قژزەرد و، کوڕانی چاونەترس و هەمیشە براوە. بێگومان ئەمە یەکەمین ئاشنایی من بوو بە جیهانی ئەفسانەکان و نموونە دێرینەکان و شیعر، گەرچی ئەوکات ئەم شتانە لای من گەلاڵە نەبووبوون. من بە تەنها لە قوتابخانە شیعرم دەخوێند، لە کتێبەکانی ئەدەبدا کە بەشێك بوون لە پرۆگرامی خوێندمان و بە ناچاری دەمانخوێندن، زۆرجاریش لە خۆم دەپرسی، ئاخۆ نووسەرانی ئەم دەقە سەیر و سەمەرانە" بۆچی جاری وایە دێڕەکانیان ئەوەندە کورت دەنووسن کە بۆشاییەکی سپیی زۆر جێدەڵێن، من بەبێ ئەوەی بیدرکێنم" ئەم کارەم بە فیڕۆدانی کاغەز و کاتی خوێنەر دەزانی. بە تەنها کاتێ بە تامەزرۆییەوە ڕۆمانەکانی جەیمز. ف. کۆپەرم بۆ چەند جارێك دەخوێندەوە، بە تایبەتیش "مۆهیکان و مێرگوزار"، تازە نهێنیی ئەوەم بۆ دەردەکەوت کە ئەو دێڕانە بۆ وا کورتن و ئەو بۆشاییانەش بۆ وا زۆرن. لەسەرلەوحەی تەواوی بەشەکانی ئەو کتێبانەدا کە لە کتێبخانەکەی باوکمدا دەمدۆزینەوە، چەند بەیتە شیعرێکی شەکسپیر، یان بیرنز، یاخود وۆردز وۆرث هەبوون و هەروەها هی شاعیرانێك کە ئەمڕۆ بە تەواوەتی لەبیر چوونەتەوە. بەبێ ئەوەی من چاو بەم بەشانەدا بخشێنم، بایەخێکی ئەوتۆشم پێ نەدەدان —تا ئەوکاتەی وەسفی مردنەکەی ناتی بۆمپۆم لە کتێبی "مێرگوزار"دا خوێندەوە، کە خۆشەویستترین ڕۆمانی کۆپەرە، یەکسەر سەرنجم دا کە پێشتر گەوهەری ئەم ڕووداوە غەمگینەم لە دوو سێ بەیتی شەکسپیردا خوێندۆتەوە و لە سەرەتای بەشەکەدا هەیە. بە کورتی، ئەوەی کە هەمیشە بە حەقیقەتی دەزانم" بەبێ ئەوەی بتوانم بە شێوەیەك دەریببڕم، بە مەزەنە تێیدەگەیشتم: ئەویش ئەوەیە کە شیعر هونەرێکی نهێنیئامێزە بۆ گوتنی گەوهەر و توخمی سەرەکیی شتەکان، بەڵام وێڕای دۆزینەوەی ئەم ڕاستیەش، ئەوکات زانستم بەسەر هونەردا پەسەند دەکرد، ئەوەی کە پێی دەڵێن زانستە وردەکان —واتە ماتماتیك، فیزیك و ئەستێرەناسی—





لە شیعرم لا پەسەندتر بوون. لە تەمەنی چواردە پانزدە ساڵیدا، ئینشتاین و پلانك و ئەدینگتۆن و جینز و تەنانەت فلاماریۆنیشم دەخوێندەوە. تا بۆم دەکرا تیۆرەی نیسبیگەرایی، میکانیکی کوانتۆمی، دۆزینەوە تازەکان و گریمانە زیاد لە پێویست گێژکەرەکانی لە بابەتی تیۆرەی ئەتۆمی تا تیۆرە تازەکانی دروستبوونی گەردوونم دەخوێندەوە. ئەمڕۆ هەستدەکەم کە تەواوی ئەو شتانە" بە تایبەتی لە لایەنی —دەتوانم بڵێم— شاعیرانە و خەیاڵ و خەونئامێزییەوە منیان دەخستە ژێر کاریگەریی خۆیانەوە. کاتێ منداڵ بووم، زۆرجار گوێم بە عەمودەکانی کارەباوە دەنا تا بە بیستنی دەنگی لەرینەوەی تەلەکانی کارەبا کە بە یاریی پێ دەکردن" ئەو پەیامانە دیاری بکەم کە بەنێو سەرمدا گوزەریان دەکرد. کاتێکیش خوێندکاری ئامادەیی بووم" حەزم دەکرد، کەم تا زۆر لەبەرئەو هۆیانە، ژیانی خۆم بۆ فیزیای ئەستێرەناسی تەرخان بکەم.

لەگەڵ گۆڕانی ڕووداوەکاندا و پاش چوونی ئێمە بۆ بۆهم، لەگەڵ زمانی تازە و هاوڕێیانی تازەمدا و، لەگەڵ یەکەمین خۆشەویستییە شەرمنەکانمدا" حەز و مەیل و بەرنامەکانم بە تەواوی گۆڕان. ئەوکات گەر بشمویستایە خوێندنی باڵای زانستی تەواو بکەم" نەمدەتوانی، لەبەرئەوەی نازییە داگیرکەرەکان لە ساڵی 1939ەوە هەموو زانکۆکانی چیکیان داخست. بۆیە بە هەمان جۆش و خرۆشەوە، بە هەمان خوێنگەرمییەوە" دەستم بە دیراسەی هونەر و ئەدەب کرد، دەمنووسی، هێڵکاریم دەکرد، بەختی خۆم لە نیگارکێشاندا تاقی دەکردەوە و فێری زمانی تر دەبووم. جگە لە ئەڵمانیو فەرەنسی —کە لە ئامادەییدا لە پرۆگرامی خوێندندا بە زۆر دەگوترانەوە" فێری ئینگلیزی و ئیتالی و ڕووسیش بووم. هەر بۆئەوەی لە نزیکیشەوە و بە شێوەیەکی کردەیی بزانم شیعر چۆن دەخوڵقێنرێ" دەستم بە وەرگێڕانی شیعر کرد: پەترارك، تاسۆ، ڕۆنسار، دۆبیلە، سۆنێتەکانی شەکسپیر. هەم کاری ئەڵمانیەکانم دەخوێندەوە —وەکو لیسینگ و گۆتە و هۆڵدەرلین و ڕیلکە— و هەم کاری فەرەنساییەکان— وەکو بۆدلێر و ڤیرلین و ڕامبۆ — و پاشتریش کاری ئیتالیەکان— وەکو ئۆنگارتی، مۆنتالە و هەڵبەتە چیکەکانیش—





ڕۆمانتیکەکان، سیمبۆلیستەکان، مۆدێرنیستەکان و هاوچەرخەکان. ئەم پەروەردە عاتیفی و ئەدەبییەم، بەو بۆرسی خوێندنە کامڵ بوو کە دەوڵەتی فەرەنسا لە ساڵی 1945–1946دا پێیان دام. لەو دوو نیوە ساڵەی کە لە زانکۆی گرنۆبل بووم – ئەو شارەی کە ستاندال تیا لەدایك بووبوو و بۆ ماوەیەکی زۆر جێی بایەخم بوو–، دەمتوانی یەکسەر هەموو کاتی خۆم بۆ تۆژینەوەی ئەدەب و کەلتووری فەرەنسا تەرخان بکەم. لە گرنۆبل بوو کە بە کردنەوەی کتێبێك بە ناوی "فەزای ناخ"ەوە" یەکێك لە گەورەترین شاعیرانی ڤیلمم کەشف کرد" کە ئەویش هنری میشۆ بوو. دوای بیست ساڵ و" پاش ساڵانێك لە قەدەغەکردنی سەفەر بۆ خۆرئاوا، کاتێ بۆ یەکەمین جار چوومەوە بۆ فەرەنسا، ئەو دەرفەتەم بۆ ڕەخسا کە بە شەخسی ئەو ببینم، ئەو دەیزانی کە من هەڵبژاردەیەکم لە شیعرە بڵاوکراوەکانی لە گۆڤارێکی چیکیدا وەرگێڕاوە. ئەو بەردەوام بە خۆشەویستییەوە کتێبەکانی خۆی بەدیاری بۆ دەناردم و، کاتێکیش لە ساڵی 1966دا ئاگادارم کرد کە لە پاریسم، تەلەفۆنی بۆ کردم تا بچم بۆ لای.

***ئەو وێنەیەی کە لە ناو خەڵکدا سەبارەت بە شۆڕش هەیە، توندوتیژییەکی تێکەڵە بە ئاژاوە. بەڵام دوا ئەزموونی چیکۆسلۆڤاکیا پیشانمان دەدات" کە بەبێ خوێنڕشتنیش شۆڕش ڕوودەدات.**

–لە ڕاستیدا ئەو وێنا گشتیيەی کە سەبارەت بە شۆڕش هەیە، وێنەی بزاوتێکە کە ئەنجامەکەی بە خوێنڕێژی و ترس دەشکێتەوە. شۆڕشی فەرەنسا" بە درێژایی دوو سەد ساڵ" لە کۆمەڵگا ئەوروپییەکاندا نموونەی ڕابوون بووە.بەڵام ئەمڕۆ، لەگەڵ ڕووداوەکانی پراگ و بەرلیندا، ئێمە شێوەیەکی دیکەی شۆڕش دەبینین کە تیایدا ئاکار لە سیاسەتدا پەیڕەوی دەکرێ. بە واتایەکی دی، بۆ یەکەمین جارە کە چیتر قسە لەسەر چەپ و ڕاست ناکرێ، بەڵکو هەروەکو لە "ڤاسلاڤ هاڤل"دا بینیمانەوە، زیاتر جەخت لەسەر ماهیەتی ئاکاریی دەسەڵاتە. هەر بۆیە من لەو بڕوایەدام کە لە داهاتوودا وەکو جووڵانەوەیەکی ئاکاریی گەورە





باس لە شۆڕشی چیك دەكرێ" كە كۆتایی بە دیكتاتۆریەتێكی پڕ لە درۆ و توندوتیژی هێنا.

***بە بڕوای ئێوە، تایبەتمەندییەكانی جووڵانەوەی ناتوندوتیژی لە چیكۆسلۆڤاكیادا چین؟**

-جووڵانەوەی ناتوندوتیژی لە چیكدا" لە بنەڕەتدا جووڵانەوەیەكی دژە یۆتۆپیایە" كە دژ بە بەهەشتێكی زەمینی خەبات دەكات كە هیچ ئامانجێكی تری نی یە جگە لە وێرانكردنی ئادەمیزاد لە ڕێی كاری زۆرەملێوە. لەم ڕووەوە ڕژێمی كۆمۆنیستی لە زۆر لایەنەوە لە ڕژێمی نازی دەچێت كە ئامانجی ئەویش وێرانكردنی مرۆڤە لەڕێی لەناوبردنی توانای داهێنەرانەیەوە. لە ئۆردوگای كاری زۆرەملێدا جێی داهێنان نابێتەوە، هەروەكو سەبارەت چیكۆسلۆڤاكیا دەیبینین ، بۆیە دەگەینە ئەو شتەی كە نووسەرێكی چیكی پێی دەوت "ژیانی ساختە". لە ڕاستیدا ماهیەتی ڕاستەقینەی ناتوندوتیژیی چیك كۆتاییهێنانە بەم "ژیانە ساختەیە" و بەرقەراركردنی ژیانێكی داهێنەرانە لە جێی ئەو.

***كەواتە دەتوانین باس لە فەلسەفەی ناتوندوتیژی بكەین لە شێوە چیكیەكەیدا؟**

-بڕواناكەم بتوانین باسی فەلسەفەیەكی ناتوندوتیژیی تایبەت بە چیكۆسلۆڤاكیا بكەین. باشترە بڵێین ڕەفتار و ڕوانینێكە كە ساڵانێكی زۆر خراپ لێی تێگەیشتبووین. "بەهاری پراگ" جووڵانەوەیەكی ناتوندوتیژانە بوو كە كەس لێی تێنەگەیشت.

بە بۆچوونی زۆر كەس" شێوەی ڕووبەڕووبوونەوەی خەڵكی چیكۆسلۆڤاكیا لەگەڵ داگیركەرە سۆڤێتەكاندا، نیشانەی لاوازیی ئەوان بوو. دەشێ وابێت، بەڵام بە بۆچوونی من ئەوە هێز بووە نەك لاوازی، لەبەرئەوەی تەنانەت گەر لافاوی خوێنیش نەبووایە، تەواو لەو ڕاستی‌یە بەئاگابووین كە ئەوان لەسەر هەق نین و ئێمە لەسەر هەقین. بیست ساڵی دەویست تا ئەم هوشیاری‌یە كاریگەریی خۆی دەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا" بەر لە ساڵی 1968یش و لەناو كەسانێكی وەكو ماساریك یان پاتۆكادا -كە یەكەمین قسەبێژی "پەیمانی 77" بوو -فیكری ناتوندوتیژی دەبینینەوە.





***هاڤڵ لە نووسینەکانیدا "پەیمانی 77" بە جۆرە داهێنانێکی ئاکاری دەزانێت کە بە پلەی یەکەم کۆڵەکەکەی هوشیاریی تاکەکەسە.**

–تەواو ڕاستە. زۆرجار ڕەخنەیان لە "پەیمانی 77" گرتووە کە بە ڕادەی پێویست سیاسی نییە. ئەمەش یەکێکە لەو شتانەی کە تێینەگەیشتوون. لەبەرئەوەی بە بۆچوونی ئێمە کە پەیمانەکەمان ئیمزا کردووە، مەسەلەی بنەڕەتی لە پێشدا ئاکارە ئینجا سیاسەت. لەبەرئەوەی ئاکار نەك هەر فاکتەرێکە کە هەموو جۆرە کارێکی کۆمەڵایەتی مانای خۆی تیا دەبینێتەوە، بەڵکو ئەو تەوەرەشە کە لە توانایدایە خەڵکانێك لە بواری جیاجیادا لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە. ئیمزاکردنی "پەیمانی 77" بەرەنگارییەکی گەورەی ڕۆشنبیرانە بوو دژ بە ڕۆشنبیریی ڕەسمی. بەڵام زۆرجار ئەوە لەبیر دەکەن کە ئەم بەرەنگارییە لە ساڵی 1948دا بە کودەتایەکی کۆمۆنیستی و پاکتاوکردن دەستی پێ کرد. هەزاران مامۆستا و خوێندکاری زانکۆیان دەرکرد و، هەر لەم کاتەشەوە بوو کە ڕۆشنبیرییەکی نارەسمی دەستی پێ کرد. لێرەدا پێویستە ڕێز لە کاری فیکریی کەسانێکی وەکو پاتۆکا بنرێ کە زەمینەی بەرەنگارییان بۆ کارەکانی ئایندە خۆش کرد.

***ڤاسلاڤ هاڤڵ لە زۆر ڕووەوە لە بیرمەندێکی وەك پاتۆکا دەچێت، ئەو بیرمەندەی کە وەکو سوکرات هزری "پەروای ڕۆح"ی بەرامبەر بە "ونکردنی هەست" لا زۆر گرنگە.**

–بەڵێ. هزری "ژیان لە حەقیقەتدا"ی هاڤڵ لای پاتۆکاش دەبینینەوە، بەڵام دەتوانین بۆ پێشتریش بگەڕێینەوە. پاتۆکا خۆی لەژێر کاریگەریی "کۆمنیۆس (1592–1670)دا بووە (کە دەستوورنووس و زانای فێرکردن و پەروەردەی چیك بووە)، ڕەگوڕیشەی بیروباوەڕی ناتوندوتیژی لە بیروڕاکانی کۆمنیۆسدا و لە هزری فێرکردنی ئاشتیی جیهانیدا دەبینین. بێگومان، ناتوندوتیژییەکەی کۆمنیۆسیش بنچینەیەکی ئایینیی هەیە..

***ئایا ئێوە لەو بڕوایەدان کە لە نێوان هزری ناتوندنیژی و پێداویستیی مانەویدا –کە لای ڕۆشنبیرانی چیك هەیە– پەیوەندییەك هەیە؟**





–لە پاتوکادا تەواو ئەمە دیارە، هەروەها لای ڤاسلاڤ هاڤڵیش دەیبینین. دەزانیت کە هاڤڵ ئایینداریش نییە، لەگەڵ ئەمانەشدا بڕوای بەوە هەیە کە شتێك هەیە ئێمە تێدەپەڕێنێت و شتێکی مانەوییە.

***ئێوە باسی لاوانیشتان کرد. لاوان لەم ڕووداوانەی دوایی چیکۆسلۆڤاکیادا چ ڕۆڵێکیان هەبوو؟**

–ڕۆڵێکی گەورە. ئەمانە کەسانێکن کە کودەتای 1948یان نەبینیوە و داگیرکردنی سۆڤێتیشیان لە 1968دا تاقی نەکردۆتەوە، بەڵام لە ڕێی میدیاکانی خۆرئاوا و هەروەها زانیاریی گەورەکانیانەوە توانیویانە کەلتوورێکی تایبەت بە خۆیان بخوڵقێنن کە ناویان ناوە "کەلتووری دووەم" و لە گروپەکانی ڕۆك و جاز پێکهاتوون. لەناو ئەم گروپانەدا دەبێ ناوی بەشی جازی "یەکێتیی مۆسیقارەنانی پراگ" بهێنین کە بە هۆی بڵاوکردنەوەی کتێبی قەدەغەکراوەوە و هەروەها بە هۆی سازکردنی کۆنسێرتی ڕێ پێنەدراوەوە" زیندانی کراون. زۆرجار ئەوە لەبیردەکەن کە "پەیمانی 77" پاش بزاڤێك هاتە ئاراوە کە لە پێناوی ئازادیی مۆسیقاژەنە لاوەکانی ڕۆکدا دروست بوو.

***تەسەور دەکەیت ڕەوتی دیموکراسی لە چیکۆسلۆڤاکیادا چیتر بۆ دواوە ناگەڕێتەوە؟**

من بە سڵەوە وەڵامتان دەدەمەوە. من بڕوام وایە کە تەنانەت دوای "بەهاری پراگ"یش نەدەبووایە گەڕانەوە بۆ دواوە هەبووایە. ڕاستە پاکتاو و لە سێدارەدان بەردەوام بوو، بەڵام نەك وەکو 1948. ئەمجارەیان ئەوە خەڵکن کە بە دەسەڵات گەیشتوون و لابردنیان زەحمەتە. بەڵام بێگومان چارەنووسی ئێمەش وەکو چارەنووسی تەواوی ئەورووپا بەو شتەوە بەستراوەتەوە کە سبەینێ لە یەکێتیی سۆڤێتدا ڕوودەدات.

**نۆڤەمبەری** 1990

**سەرچاوە: نقد عقل مدرن، رامین جهانبگلو**، 1376 – **تهران.**